ڕۆمان

٢٠٠٠

# بیست ساڵ سیخوڕی لە نێو ئیسرائیل





نوسینی :صالح مرسی صالح
لە عەرەبی یەوە بۆ فارسی :
عبدالصاحب سعیدی

وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی کوردی :
هێرش مەحمود سەنگەسەری

بەرگی یەکەم

2009

بەرمێنترین ڕۆمانی سیاسی لە میسر

# بیست ساڵ سیخوڕی لە نێو ئیسرائیل

نوسینی

صالح مرسی صالح

لە عەرەبی یەوە بۆ فارسی

عبدالصاحب سەعیدی

وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی کوردی

هێرش مەحمود سەنگەسەری

بەرگی یەکەم

٢٠٠٩

ناوی کتێب : بیست ساڵ سیخوڕی لە نێو ئیسرائیل
وەرگێڕانی : هێرش مەحمود سەنگەسەری
تایپ : هونەری محەمەد سۆفی
دیزاین و بەرگ : شەپۆلی خۆشنوس
ئەرکی چاپ : کتێبخانەی (مەحوی) لە ڕانیە
سوپاس بۆ : وێنەگری سیمای دیجیتاڵ / سابیر تەها ئیبراهیم
تیراژ : ١٠٠٠ دانە
چاپی یەکەم ٢٠٠٩

چاپخانەی شەهاب – هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی
(٣٣)ی ساڵی ٢٠٠٩ی پێدراوە

| بەشەکان | لاپەڕە |
|---|---|

# بەشی یەکەم

# نامەیەکی پڕ لە نهێنی

پیاوێک لە ئەڵمانیای ڕۆژ ئاواوە هاتبوو ، وایانکرد دەستبەجێ لەگەڵ سەرهەنگ ( محمد سعید ماحی ) سەرۆکی ڕێکخراوی ئاسایشی ئەوکاتەی میسر ، یەکدی ببینن ، لەبەر ئەوە هەر ئەو سەیارەی کە ئەوی هەڵ گرتبوو کاتێ گەیشتە بەردەم دەرگای چوونە ژووری ڕێکخراوەکە ئاشکرا بوو کەمیوانی سەرۆکی ڕێکخراوەکەیە ، پاسەوانان دەرگایان بۆ خستە سەر پشت ، سەعات ۱۱ ی بەیانی یەکێک لەڕۆژەکانی کانونی دووەمی ساڵی ۱۹۷۹ بوو

پیاوێکی گەنجی لەبار لەسەیارەکە دابەزی جانتایەک کەپڕ بوو لەکاغەز بەدەستیەوە بوو جانتاکە بە قفڵی مەحکەم داخرابوو کە نیشانەی سووربوونی بوو لەسەر پاراستنی نێوەڕۆکەکانیان پاشان یەکێک لەپیاوەکان کەچاوەڕێی ئەو بوو ڕێنوێنی کرد بۆ نوسینگەی بەڕێوەبەر گەنجەکە لەبارو گەنم ڕەنگ بوو ، بەچاوە شینەکانی هەر بەمیسری یەکی کۆچەر یان ڕۆژ ئاوایی دەچوو ، باڵتۆیەکی لەسەر مۆدی ڕۆژ ئاوایی لەسەر جلەکانی دەبەرکردبوو کەلە تەوژمی شەپۆلەکانی سەرما دەی پاراست ، ئەو دووری نێوان دەرگای هاتنە ژوورو کۆشکی بنەڕەتی بەپێ دەبڕی ، دیداری گەنجەکە لەگەڵ بەڕێوەبەری ڕێکخراوی ئاسایش دۆستانە دەهاتە بەرچاو ، لەبەر ئەوە بەڕێوەبەر لەپشت مێزەکەی قیت بۆوەو لە پەنا مێوانەکەی لەساڵۆنێکی دڵرفێن کەلە تەنیشت نوسینگەی کارەکەی بوو دانیشت و لەڕاستی دا سەرهەنگ ماحی تا ساتی دیدارەکەش لەبارەی چاو پێ کەوتنی ئەو گەنجە شتێکی نەدەزانی ، ئەو پیاوە گەنجە بازرگانێکی میسری بوو ، ناوی نهاد کامل بوو ، هەڵگری نامەیەکی زۆر نهێنی و حەشار دراو بوو لەلایەن کەسێکەوە کەنەدەکرا ناوەکەی بەتەلەفۆن بدرکێنێ و دەیەویست نامەکە بەدەست بگەیەنێتە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی نەک کەسێکی تر ، هەنگاوە سەرەتایی یەکانی چاو پێ کەوتنەکە هەر لەناساندنی نێوان بەڕێوەبەرو میوانەکە وەک گەلاڵەکردنی باسێکی گرنگ دەهاتە بەرچاو ، لە دوای دوو خولەک دوو پەرداخ شەربەتی ئاوی لیمۆ لەسەر مێزەکە لەنێوان بەڕێوەبەر و میوانەکە دانران ، هەر

کامێکیان قومێکیان خواردەوەو ناسینەکە کۆتایی هات و بۆ چەند ساتێک بێ دەنگ بوون دوای وچانێک بەڕێوەبەر قەدو باڵای گەنجەکەی خستە ژێر سەرنجەوە بەلایەوە ئەو دیمەنە وەک شتێکی جوان و سەرنج ڕاکێش دەهاتە بەر چاوو لەناوەڕۆکیشدا پێناسەیان لە پاکی و ڕاستگۆیی دەکرد ، بەهەمان شێوە لە چاوە شینەکانیدا وا دەهاتە بەرچاو کەچالاک بێ ، بەڕێوەبەر لەبەر خۆیەوە کەوتە بیرکردنەوە ! خۆ ئەوە هەمان (نهاد کامل ) ە

نهاد کامل زەردەخەنەی لەسەر لێو بوو ، بۆیە ئەو زەردەخەنەیە بۆ بەڕێوەبەر ببۆ مایەی سەر سوڕمان پاشان لەجێگەی خۆی دانیشت و پرسی نهاد کامل ناوەڕۆکی نامەکە چی یە ؟

پیاوە گەنجەکە لەکاتێکدا کە قفڵی جانتاکەی دەکردەوە گوتی :

- قوربان نامەکە بەسە بۆ وەڵام دانەوە

پاشان دەنگی کردنەوەی قفڵەکانی جانتاکە بێ دەنگی یەکەی شکاند گەنجەکە لەکاتێکدا کە جانتاکەی دەکردەوە ، نامەیەکی جوانی لە جۆری ئەو نامانەی کە خێزانە شکۆمەندەکان لە ئەوروپای ڕۆژئاوا بەکاریان دەهێنا دەرهێنا .

بەڕێوەبەری ئاسایش بەوردبینی خۆی لەگۆشەیەکەوە دوو پیتی ( د س ) ی بینی ، پاشان نامەکەی لێ وەرگرت بەڵام بۆ ماوەیەک تووشی دڵەڕاوکێ بوو ، گەنجەکە گوتی :

- دەتوانیت بیکەیتەوە

بەڕێوەبەر سیلە چاوێکی بەماناوەی تێ بڕی و گەنجەکە درێژەی پێدا

- ئەگەر پێویستی بەڕوون کردنەوە هەبێ ، ئامادەم زیاتر شی بکەمەوە

بەڕێوەبەر بە سووک و ئاسانی نامەکەی کردەوەو لەزەرفەکەی دەرێنا نامەکە بەپیتی لاتینی چاپ کرابوو ، چاوێکی تێ بڕی پاشان لەبەردەم ( نهاد کامل ) ی دانا

دەقی نامەکە ، لەیەک دێڕ زیاتر نەبوو

- گەورەم لەڕۆژی ١٧ ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٨ بەڕێز دیوید شارل سمحون مرد واژۆ هێلن سمحون ناوی نێردراوەکەو واژۆکەشی چاپ کرابوو

لەپێش ئەوەی کەبەڕێوەبەر قسەیەک بکات **نهاد کامل** توێژینەوەو لێکدانەوەی دەست پی کرد چونکە هزری بەڕێوەبەری بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو هاوکات لەگەڵ ئاماژە کردن بەنامەکە گوتی

- من چاوەڕوانیم لەو ( نامەبەر ) ئەوە بوو کەپەیامەکە بەزمانی ئینگلیزی نوسرابێ چونکە بەڕوواڵەت لەمیسردا زمانی ئینگلیزی لەزمانی ئەڵمانی زیاتر برەوی هەیە

بەڕێوەبەر بەهێمای پێم خۆشە سەری بۆ لەقاند گەنجەکە جانتاکەی داخست و پاشان شەربەتێکی ئاوی لیمۆی پێدا کردو بۆ ماڵ ئاوایی هەستا پێ

بەڕێوەبەرەکەش هەستا پێ و تا دەرەوەی ساڵۆنەکە لەگەڵیدا ڕۆیشت و لەکاتێکدا کە غەڵبەغەڵی سوپاس کردن لەژێر لێویەوە هەڵدەقوڵی کەئەمەش ئەوەی دەگەیاند کە سەرقاڵی کردووە بۆ باسێکی زۆر بەنرخ و گرنگ مشور خۆر کە وەرێ کەوتنی ئەوانی لە دوورەوە هەست پێ کرد لەجێگەی خۆی هەستا ، بەڕێوەبەر ڕووی لە مشوور خۆر کردو گوتی بەڕێز **نهاد کامل** تا دەرەوە ڕێنوێنی بکەن.

بەڕێوەبەر لەو ساتەدا لەبیری سازدانی دانیشتنێکی کت و پرو نائاسایی دابوو لەگەڵ یەکێک لەیاریدەدەرانی خۆی بۆیە بەپەلە تادەرەوە لەخزمەت میوانەکەیدا ڕۆیشت

چاوپێکەوتنی ئەو دوو پیاوە تەنها ٧,٥ خولەکی خایاند

*          *          *

لەسەعات ٥ ی دوای نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ امانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٩ ) دوو کەسی گەنج گەیشتنە فرۆکەخانەی قاهیرە ، ئەوان کاریان سەفەر کردنی یەک لە دوای یەک بوو ، هەروا خوویان پێوەگرتبوو و پاسپۆرتەکانیان پڕبوون لە مۆری هاتن و دەرچوون لە وڵاتە جۆراو جۆرەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لەیابانەوە بگرە تا نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێکیان دەم و چاوێکی گەشاوەی هەبوو و بەجل و بەرگی خاوێن و پۆشتەو پەرداخی وێ دەچوو کەسەرمایەدارێکی بەتوانابێ ؛ کارەکەش

لەپاسپۆرتەکەیدا ئاوا نوسرابوو خاوەنی بازرگانی خانەیەکە لەیەلێک لەکەرەکە بازرگانەکانی قاهیرە

ئەوەی تریان پیاوێکی ڕووخۆش بوو جل و بەرگێکی سادەو ئاسایی لەبەردا بوو بەڵام جوان پۆشیەکەی سەرنجی پیاوی ڕادەکێشا ، لە پاسپۆرتەکەی نووسرابوو ، کار ئەندازیاری پلەی گەرمی لەگەرەکی گەورەی بازرگانی قاهیرە

دیار بوو ئەوانە بۆ بەڵێن نامەی گرێ بەستی کڕینی دەزگا ئاو سارد کەرەوەکان و جۆرەها بەفرگر ا ثلاجة ا دەچوونە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا هەروەها دەرکەوتن کەبە شێوەیەکی کت و پڕ لەئێوارەی هەمان ڕۆژدا بڕیاریان داوە بچنە ئەڵمانیا بەبڕیارێکی گرنگ کەدەبێ سبەینێ بەیانی بگەنە هامبۆرگ بلیتەکانیان پەیوەندی بەکۆمپانیای فڕۆکەوانی پاکستانەوە هەبوو کە لە دووانیوەڕۆی هەمان ڕۆژدا لەقاهیرەوە بەمەبەستی پاریس کەوتبوونەڕێ هۆیەکەشی نەبوونی هەڵفڕینی ڕاستەوخۆ بوو لەقاهیرەوە بۆ ئەڵمانیا ، لەهەمان ڕۆژدا کەوای پێویست دەکرد کەلە پاریسەوە بۆ هامبۆرگ بڕۆن تا سبەینێ لەکاتی دیاری کراودا بگەنەوێ

لەپێش هەڵفڕینی فڕۆکە ئەندازیارەکە جانتاکەی کردەوە و کاغەزێکی دەرێنا ، دیاربوو کە بروسکەیەکەو وردەکاریەکانی بۆ هاوڕێکەی بەڕوون و ئاشکرایی خوێندەوە ، پاشان دەمێک خۆی بەبلیتەکانەوە خافڵاند دوای ساتێکی کەم مشتومڕ دەستی پێ کرد ، بیرو ڕایان لەمەڕ ئەو کاغەزو کەتەلۆگانە ئاڵوگۆڕ دەکرد کەبریتی بوون لەوێنەی ئاو ساردکەرەوەو بەفر گرە جۆراو جۆرەکانی کۆمپانیا گەورەکانی ئەڵمانیا تا کار پێ سپێردراوی فڕۆکەخانەکە هەواڵی هەڵفڕینی فڕۆکەکەی ڕاگەیاند

* * *

لەهەمان کاتدا لەنوسینگەی بەڕێوەبەری خزمەتگوزاریە نهێنی یەکانی دەزگای ئاسایشی گشتی میسر دانیشتنێک بە سەرۆکایەتی بەڕێوەبەرایەتی هەمان بەش پێک هات ، لەو دانیشتنەدا دوو پیاوی چوار شانەی سەر زل و موو دان و ماشی چاو گەورە کە گوایە لەمەڕ شتێکی شارراوە گفت و گۆ دەکەن ، لەسەر کورسی زۆر کۆن و بەنرخ ، ڕێک لەبەردەم مێزی بەڕێوەبەر دانیشتن ، لەلای ڕاستی بەڕێوەبەر چوارەم کەس

لەسەر کورسی یەکەی پاڵ کەوتبوو و دەستەکانی لەسەر سنگی دەبەرێک بەزاندبوون ، لێوەکانی لەرقان وشک هەلاتبوون کەپێناسەیان لەشلەژان و نیگەرانی یەکی دەروونی ئەو دەکرد ، نامەیەکی سەرسوڕهێنەر بەدەستی ئەو پیاوەوە بوو کەلەپشتی مێزەکەوە دانیشتبوو ، ئەو نامەیە بەیانی هەمان ڕۆژ لەلایەن **خانم سمحون** بەدەستی بەڕێوەبەری ڕێکخراوی ئاسایش گەیشتبوو ، ئەو نامەیە لەگەڵ ئەوەش دا کەکورت بوو بۆ ئەو پیاوانە نێوەرۆکێکی قووڵی هەبوو و نیازی بەشی کردنەوەو لێکدانەوەیەکی ورد هەبوو ؛ چ جای ئەوە کە شێوەی نوسینەکەی بەڵگەیەک بوو لەسەر تواناو بەهرەی نوسەرەکە ، لەپێش هەر شتێک لەچەمکی نامەکەدا ئەوە دەفامرایەوە کە**خانم سمحون** ڕاستی فەرمانەکەی هەست پێ کردبوو بەلام بۆچی لەو ماوەیەدا دوو مانگ بێ دەنگی لێ کردبوو ؟

بەهەرحاڵ ئەو پرسیارە نیازی بەوەلامێکی دڵنیا کەر هەیە ، ئەگەر سەرنج لەشێوەی نامەکەو شێوازی ناردنەکەی بدەین لەوانەیە دەستمان بەوەلامێک ڕابگات ، شێوەی نوسینی نامەکە و ناوەڕۆکی ناردنەکەی جۆرە سەر سامی یەکی پێوە دیار بوو ، کاغەز نامەیەک کەناوی کورت کراوەی ( **دیوید سمحون** ) ی لەسەر نوسرا بوو پیشانی دەدا کە ئەو نامەیە دەبێ لەلایەن **خانم سمحونەوە** هاتبێ ، بەلام لەسەر کاغەز نامەکە ناونیشانی نێردراوەکە نەنوسرابوو ، هەموو کەسێک دەی توانی ئەو کاغەز نامەیە لەنوسینگەی کاری **دیوید سمحون** یان هەتا لەچاخانەیەکیشدا پەیدا بکات نامەکە لەسەر کاغەزێکی سپی بەلام جیاواز لەجۆری کاغەزی ئاسایی نووسرابوو ، ڕەمزێکی کورت کراوەی ناوی **دیوید سمحون** لەسەرەوە دەبینرا ، ناوو واژۆی **هێلن سمحون** لەژێرەوە تایپ کرابوو هەموو دیمەنەکان وایان پیشان دەدا کە **خانم سمحون** ترساوەو دەیەوێت تا ئەو شوێنەی کەدەکرێ خۆی لەو گێژاوە قوتار بکات مەترسیەکە خۆی لەخۆیدا وەلام بوو کە ئایا ناکرێ ئەویش بترسێ ؟

**خانم سمحون** چەندەها هەفتە چاوەڕوانی کرد تا کەسێکی جێگەی متمانە بدۆزێتەوە تا بەر پرسیارێتی ئەو نامەیە بگرێتە ئەستۆ ، بەهەرحاڵ ئەوە هەمان ئەو شتە بوو کەئەندامانی دانیشتنەکە لە هەمان ڕۆژدا بۆی دانیشتبوون بەو هۆیەوە هەموو خاڵەکان بەگرنگ هەژمار دەکران و بۆ زانینی نێوەرۆکەکەشی دەبوایە بەزووترین کات پەیوەندی بەخانم **سمحونەوە** بکرێت بەرپرسیارێتی ئەو کارە دەست بەجێ بە دوو

گەنجی حاملاوو ڕاهاتوو سپێردرا   کاغەزو ناسنامەی پاسپۆرتەکانیان دەست بەجی ئامادەکرا ، یەکێک لە پیاوەکان لەبەردەم سەرۆکی پڕۆژە نهێنی یەکان دانیشتبوو گوتی

- ئەو دوو گەنجە هەتا ئێستا هەر لە فڕۆکەخانەن ، ئەوان دوێنێ سبەی فڕۆکەی هەڵفڕینیان بەرەو هامبۆرگ دەست نەکەوتووەو ئەوڕۆ بەناچاری بەفڕۆکەیەکی پاکستانی بەرەو پاریس کەوتوونە ڕێ ئاسبەینێ بەیانی لەپاریسەوە بەرەو هامبۆرگ هەڵفڕن ، هەر چەندە ئەو سەفەرەیان زۆر شەکەتی کردن بەڵام نەیان توانی سبەی بەیانی چاویان بە خانم سمحون بکەوێ ، دوای نیوەڕۆ چاو پێ کەوتن ئەنجام درا لەبەرئەوە دەیان توانی پشوویەک بدەن و بەخەیاڵێکی ئاسودەوە وەڵامەکەی ببیستن ، ئەو پیاوە درێژەی پێدا   دوو گەنجەکە توانیان دەستیان بەزانیاری و هەواڵی پێویست ڕابگات

عەزیز جەبالی ا ئەو پیاوەی کە لەلای ڕاستی سەرۆکی پڕۆژە نهێنی یەکان دانیشتبوو ا تەواوی گومانە ئەگەریەکانی بۆ هەمووان باس کردوو بەرەی لەسەر هەتیوان هەڵداوە

لەگفت و گۆی ئەو کەسانەی کەلە دانیشتنەکەدا ئامادە بوون دەرکەوت کەهەواڵی مردنی دوید شاڕڵ سمحون هەواڵێکی کت و پڕ نەبووەو ئەوانە ماوەیەک لەمەوبەر ئاگادار بوون لێی

پیاوێک لەلای ڕاستی سەرۆکی پڕۆژە نهێنی یەکان دەستی بەسنگیەوە ڕەق بوو بوون و کزۆڵەو غەمگین دانیشتبوو ، زۆر سوور بوو لەسەر ئەوە کەدەبێ لەناشتنی تەرمی دوید سمحون دا بەشداری بکرێت ، ئەو باوەڕی وابوو کە دەبێ لەپێش ئەوەی کە سمحون بخرێتە ژێر گۆڕ ، یەکێک لەوان لەپەنا تەرمەکەیدا دابنیشێ ، قسەو پێش نیازەکانی زۆر قۆرخ کراوو بنەبڕ بوون ؟ بەڵام ئەوەی زیاتر ئەندامانی ناچاری ڕازی بوون و دان پێدانان کردو بڕیاری کۆتایی لەسەر درا قسەکەی عەزیز جەبالی بوو کە گوتی

- پێویستە لەپێش ڕێ و ڕەسمی ناشتن نوێژی مردوو لەسەر جەنازەکەی بخوێندرێت ، لەڕاستی دا ئەو شتەی کە عەزیز جەبالی دەی ویست ، دژی هەموو یاساو بنەمای دەزگاکانی ئاسایشی جیهان بوو   بەڵام ئەگەری بەشداری کردنی کەسایەتیە ناودارەکانی ئیسرائیل لەڕێ و ڕەسمی بەخاک سپاردنی ئەو لە ئەڵمانیا زۆر

بوو چونکە دوید **شارل سمحون کەسێکی** دەگمەن بوو لەئیسرائیل دا و یەکێک بوو لەبازرگانە هەرە شکۆمەندەکانی ئیسرائیل

مامەڵەو چالاک بوونی ئەو لەبواری بازرگانی بەتایبەتی لەم ساڵانەی دواییدا گرنگی یەکی تەواویان بۆئەو دەستەبەر کردبوو ئەوە جگە لەوەی کە لەبواری کۆمەڵایەتی و ڕامیاریشدا شوێن دەستی دیار بوو لە لایەکی تر هەر کەسێکی تر جگە لە **عەزیز جەبالیش** خۆ دەی توانی تەرمی هاوەڵەکەی بەخاک بسپێرێ و نوێژی مردووی ( لەسەر بنەمای یاسای ئیسلام ) لەسەر بخوێنێ ، بەڵام شێوازی کارەکەی **جەبالی** ئەو مۆڵەتەی پێ نەدەدا کە بتوانێ لە حاست کارێکی وادا خۆی بۆ لەگێلی بدات ، بۆیە سوور بوو لەسەر ئەوە کەدەبێ بچێت و ئەو کاتەش دەبوا دەزگای ئاسایش لەبەردەم خواستەکانیدا بەچۆک دابێ و هەموو وردەکاری و لایەنەکانی بخاتە ژێر توێژینەوەو هەنگاوی ئاسایشی توندو تۆڵ بگرێتە بەر

بەشێوەیەکی سروشتی **عەزیز جەبالی** لەخۆی ڕادەدیت کاکڵەی باسەکە لەتوێکڵ دەربێنێ ، لەبەر ئەوە پێش هەڵاتنی خۆر لەڕۆژی ١٧ ی تشرینی دووەمی ١٩٧٨ و لەپێش ئەوەی کەبەفڕۆکە بەرەو ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بکەوێتە ڕێ کاتی وەڕێ کەوتنەکە و چارەنوسی نادیارو دەرەنجامی کارەکەی خرایە ژێر باس و لێکۆڵینەوەو هەواڵە نهێنی و بەدزیەکەی ئەو گەیشتە شاری دوسلدۆرف کە وێستگەی مەبەستی **عەزیز** بوو

ئەو لەفڕۆکەکەی لەفڕۆکەخانەی دوسلدۆرف دابەزی تاسواری فڕۆکەی هێڵی ناوخۆ بێ و ڕێگەی شاری هامبۆرگ بگرێتەبەر کەنزیک بوو لەشاری ( **بێرمن** ) چونکە دوید **شارل سمحون** لەوێ دەژیا

**عەزیز** لەڕووی قەدو باڵاو ڕواڵەتەوە هیچ گۆڕانکاریەکی بەسەر خۆیدا نەهێنا تەنها چاویلکەیەکی پزیشکی کردە چاو کە خۆی وەک پزیشکێک پیشان دەدا وەک ئەوە کە ٢٥ ساڵ بێ لەو بوارەدا پشتی لەخزمەتی نەخۆشان دا چەمابێتەوە ، لەفڕۆکەخانەدا چاوی کەوت بەهاوەڵێکی کە چاوەڕوانی ئەوی دەکرد تا سبەینێ بەیانی پێکەوە لەشاری ( بێرمن ) ەوە لەپێش گەیشتنی ئیسرائیلیەکان ، بۆ دواجار لەگەڵ دۆستی مردووی خۆیان ماڵ ئاوایی بکەن و لەسەر بنەمای یاسای ئیسلام نوێژی مردوو لەسەر تەرمەکەی بخوێنن

لەبەر ئەو هەموو خەمو خەفەتەی کەلەبەر مردنی هاوڕێکەی دڵە بریندارەکەی ئازار دەدا نەی توانی ئەو سەرسامیەی خۆی لەهاوڕێکانی مردووەکە بشارێتەوە کەتوانیویانە لەماوەیەکی کورت دا هەموو وردە کاریەکانی پێویستی بۆ ڕێک بخەن ، لەبەرەبەیانی ڕۆژی ١٨ ی تشرینی دووەمی ١٩٧٨ لە شوێنی دیاری کراو ئامادە بۆوە **عەزیز** هەر چەندە کەرەشپۆش بوو ، بەڵام جلەکانی لەجۆری ئەو پۆشاکانە بوون کە گەورەکانی مەزهەبی جوولەکە لەبەریان دەکرد

کتێبێک کە بە ڕاستەقینە قورئانی پیرۆز بوو ، خستبوویە بن هەنگڵی و لەپێش ئەوەی کە شوێنی نهێنی خۆی بەجێ بێڵێ دەست نوێژێکی هەڵگرت و دوو ڕکات نوێژی بۆ شادی ڕوحی هاوڕێ مردووەکەی خوێند ، لەکاتێکدا کە سەیارەکان لەجادەکانی شاری بێرمن وەک شارە مێروولە دەورووژان پیاوێک کەلەسەر کورسی پێشەوەی سەیارەیەک دانیشتبوو چەند ئایەتێکی لە قورئانی پیرۆز لەژێر لێوەوە دەگوتەوە بەهەمان شێوە کە سەیارەکە لەماڵی **شارل سمحون** نزیک کەوتەوەو لەو دەوروبەرە ڕاوەستا ، **عەزیز** دابەزی

شاگردی دوکاندارێک کەهەڵگرتنی تەرمەکەی وەئەستۆ گرتبوو لەپەنا **عەزیز** بوو ، بێ خەم دەهاتە بەرچاو ، دیارە نەک لەبەر مارکە ئەڵمانیەکان کەوەری گرتبوو بەڵکو لەبەر ئەوە کەتوانی بووی کارێکی مرۆیی ئاینی ئەنجام بدات لەبەر ئەوە دوێنێ پێی گووترا بوو کە **دیوید شارل سمحون** ڕێبازێکی تایبەتی لە جوولەکایەتی دا هەیە ؛ لەبەر ئەوە پێویستی بەڕێ و ڕەسمێکی ئاینی لێ وەشاوەو تایبەت هەیەو ئەو کابرایەی کەخەفەت بارو خەمۆک دەهاتە بەرچاو و کتێبێکی لەبن هەنگڵی گرتبوو یەکێک بوو لەهاوڕێکانی ئەو خواڵێ خۆش بووەو ئەویش بابایەکی ئاینی بوو بۆیە سەیارەکە لەپەنامالەکەی ئەو ڕاوەستا پیرەمێردەکە دەرگاکەی کردەوە خاوێن و پۆشتەو پەرداخ بوو ، شاگردی دووکانەکە لەگەڵ چاوی پێ کەوت سلاوی کرد

- بەیانیت باش **فرانتس** !
- بەیانیت باش **یوهان** !
- حاڵی خانم **سمحون** ئەمڕۆ چۆنە ؟
- هێشتا هەر لەژوورەکە دایەو نزیکە لەخەفەتان دیق دەکات
- هەواڵی وردیلەکان چی یە ؟

- هەموو کارەکان ڕێک خراون ؟

**فرانتس** ڕێنوێنی کردن و گوتی

- فەرموون لەم لایەوە تکایە

- هیوادارم کە خانم **سمحون** دڵگران نەبێ

- گرنگ نیە هاوڕێکەم ، فەرموون ، فەرموون

**فرانتسی** پیر کە گەورەی خزمەت کاران بوو زووتر لەوانی تر کەوتە خۆو ئەوانی بۆ لای ژوورێک کە تەرمەکەی تێدا بوو ، ڕێنوێنی کرد لەنزیک دەرگای ژوورەکە شاگردی دووکاندارەکە بە ئارامی بەبن گوێی **فرانتسی** دا چرپاندو گوتی

« بۆچی بە فنجانێک قاوە بەخێرهاتنیان ناکەی ؟ »

**فرانتس** هاتەوە هۆش خۆی و دەست بەجێ دەرگای لەو پیاوە کردەوە ، پاشان دەرگای لەسەر داخستین

لەوانەیە ئەوە سەخت ترین سات بووبێ کە **عەزیز جەبالی** ئەفسەری ئاسایشی میسر لەهەموو ژیانی دا تووشی بووبێ ، **عەزیز جەبالی** کەسێکی ئاسایی نەبوو ئەو ٢٥ ساڵ تەمەنی خۆی خستبۆ مەترسی یەوە هەر کاتێ ڕابردووی خۆی وەبیر دەهاتەوە ، ڕادەچڵەکی و لەخۆی دەپرسی مرۆڤ چۆن دەتوانێ هەموو ئەو ڕووداوانە هەڵگرێ ؟ بەڵام لەڕاستی دا ئەو بۆ خۆی خووی بە نەهامەتیەکانەوە گرتبوو و وەکو هەر ئەفسەرێکی تری ئاسایش خۆی بۆ ئەگەری هەر ڕووداو و پێشهاتێک ئامادە کردبوو

بەڵام لەو کاتەیدا کە هاتە ئەو ژوورەی کەتەرمی هاوڕێکەی لێ بوو و تەرمەکەی لەناو سندوقێکی جوان کەلە داری بەنرخ دروست کرابوو چاو پێ کەوت ، خۆی بۆ هەر ڕووداوێکی نائاسایی ئامادەکرد ، لەکاتێکدا خۆی لەبەردەم تەرمی **دوید** دا دیتەوە کە ٢٠ ساڵ بەسەر هاوڕێیەتیاندا تێ دەپەڕی ، ٢٠ ساڵ بەسەر وتوێژو دەردە دڵی ، بۆیە ئێستا **دوید** بوو بۆ بەشێک لەژیانی ئەو ، بەشێک هەم گرنگ هەم مەترسی دار

کاتێ کە **عەزیز** چۆ ژوورەوە وا گومانی دەبرد کەلەبەردەم سندوقێکی قەپات کراوو داخراودا خۆی دەبینێتەوە ، بەڵام لەپڕدا سەری سندوقەکەی بەکراوەیی دیت دیتی وا **دوید** بەجل و بەرگی خۆیەوە لەوێدا بەئارامی ڕاکشاوە ، ئەو تەمەنێکی لەگەڵ **دوید** دا بەڕێ کرد بوو بەبێ ئەوەی کە هەتا یەک جاریش چاوی پێ کەوتبێ ، چەند

حەزی دەکرد کەئەو دیدارەی لەمەو بەردا کردباو چەند داوای لەدوید کرد کەلەو ماوە دوورو درێژەدا ببینێ بەڵام ئێستا کە ئەو دیدارە سەری گرتووە بەداخەوە یەکێک لەوان مردووەو ماڵ ئاوایی لەخاک و ئازیزانی کردووە

عەزیز بەکت و ماتی لەو دەم و چاوەی دەروانی کە لەبەردەمیدا دانرا بوو رێک وەکو هەمان ئەو وێنە بچوکە بوو کە لەدۆسیەکەی درابوو ، ٢٠ ساڵ لەمەو بەر لە یەکێک لەشەوە گەرمەکانی قاهیرەدا بینی بووی ، رێک هەمان ئەو زمردەخەنەیە بوو کەمرۆڤ کەمەند کێش دەکات بۆ متمانە بوون بە هاورێیەتی ، دوید هێشتا رووخسارە گەشاوەکەی لەدەست نەدابوو

فرمێسک لە چاوەکانی عەزیز رێچکەیان بەست ، بەڵێ ... رێچکەیان بەست ، بەڵام بەخێرایی بەسەر غەم و خەفەتی خۆیدا زاڵ بوو ، چاویلکە پزیشکی یەکەی لەچاو کردو قورئانی پیرۆزی کردەوەو پێیدا گەڕا تا سورەتی ( یس ) بخوێنێ ، لە دوای ئەوە کە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز تەواو بوو ، قورئانەکەی نایەوە لاوەو پاشان ( الله اکبر ) ی کردو بۆ نوێژ ڕاوەستا ، کاتێ کە نوێژی مردووی تەواو کرد ، هەستی کرد ئۆخژن و ئۆقرەیەکی سەیر سەرتاپای داگرتووە ، وەک ئەوە کە بارێکی قورسی لەکۆڵی هێنا بێتە خوار ، لەکاتێکدا کەسەیری سەعاتەکەی دەستی کرد ، بەپێویستی زانی کە بڕوات ، پاشان بەلای دوید دا چەمایەوەو بەئارامی ورتە ورتێکی کرد : (( ماڵ ئاوا ڕەئفەت ! ))

* * *

وت و وێژو گفت و گۆ بۆ ماوەیەک لەنوسینگەی سەرۆکی لقی بەرژەوەندیە نهێنی یەکان پەیدا بوو ، لەڕاستی دا دوو بابەت بوو بوونە جێگای لێکۆڵینەوە و قسەو باس ، یەکەم ئەگەر خانم سمحون دەربارەی کەسایەتی ڕاستەقینەی مێردەکەی پرسیار بکات ؟ چی پێ بڵێن لەبەر ئەوە نازانن خانم سمحون چەندە لەڕاستی یەکان دەزانێ ؟ پاشان بڕیار لەسەر ئەوە درا کەوا باشترە ڕاستیەکەی بەڕاشکاوی بۆ باس بکرێت ، چونکە مافی منداڵەکانیەتی کەبزانن دیود شارل سمحون کێ بووە ، بەڵام مەسەلەی دووەم ناوەڕۆکی خزمەتێکە کەدەوڵەتی میسر دەبێ پێشکەشی هاوسەرو منداڵەکانی سمحونی بکات ، سروشتی یە کەهاوسەرەکەی پێویستی بەپارە نیە ، لەبەر

ئەوەی **دیوید** ملیۆنەها مارک و دۆلاری بۆ بەجی هێشتبوون ، لەلایەکی تر خودی **خانم سمحونیش** لەخێزانێکی سەرمایەدار بوو و سامان و ماڵەکەی ئەویش لەسامانی **دیوید** کەمتر نەبوو ، بەڵام بڕیار لەسەر ئەمە درا کەدەبێ لەگەڵ **خانم سمحون** و منداڵەکانی بەشێوەیەک ڕەفتار بکەن کەئەگەر **دیویدیش** مابایە هەر ئاوا ڕەفتاری لەگەڵدا دەکردن و دانیشتنەکە بەمە کۆتایی هات

ڕێک لەسەعات ٩ ی بەیانی ڕۆژی دووەم کەنامەی **سمحون** گەیشتە قاهیرە ، زەنگی تەلەفۆنی ماڵی **دیوید شارل سمحون** کەناسنامەی ئیسرائیلی هەبوو — لێی دا ئەو لەشاری بێرمنی ئەڵمانیا نیشتەجێ بوو ، ٥ ساڵ لەمەوبەر لەگەڵ خانمێکی ئەڵمانی کەسەرو کاری لەگەڵ بازرگانی دا هەبوو هاوسەرگیری کرد بوو خانمەکەی ئەو لەپێش شووکردنیدا نازناوی بەرەبابیان **ریشتەر** بوو و ئێستا خاوەنی دوو منداڵە لە **دوید** بەناوەکانی **یوسف** و **سلێمان** کەئەو ناوانە لەفەرهەنگی ئەڵمانیادا نامۆن بەڵام هەندێکیان کەئاشنایەتیان لەم بارەوە هەبوو ڕیشەی ئەو ناوانەیان بەعیبری دەزانی

خانووی **دوید سمحون** کۆشک نەبوو بەڵام شوقەیەکی بچوکیش نەبوو و بەسادەیی و شێوازێکی تایبەت دروست کرابوو ، هەر کەس دەی بینی وای بۆ دەچوو کەخاوەنەکەی لەوانەیە سەرمایەداربێ و ئەو شتەی کەخانوەکەی ئەوی لەخانوەکانی تر جیا دەکردەوە ، ئەو دەرختانە بوون کەبەشێوەیەکی سروشتی لەسەر ئەرزی ڕۆژهەڵات ڕووابوون و **سمحون** چێژێکی زۆری لێ وەردەگرتن ، بەشێوەیەک کەلە قۆناغەکانی کۆتایی تەمەنی دا سەرنجی تەواوی دەدانێ

لەناو ماڵەکەیدا ، هەیوانێکی فراوان بەرچاو دەکەوت کەلە دووبەش پێکهاتبوو و هەر بەشەش بەکەل و پەل و دیکۆری گونجاو ڕازابۆوەو خولیاو سەلیقەی خاوەن ماڵەکەی پیشان دەدا ، کەل و پەلەکانی نێوماڵ ، شتی بەنرخ بوون ، پەردەی سپی بەسەر پەنجەرەکاندا هاتبوونە خوار بێجگە لە دەلاقەیەک کەڕووەو باخچەکە دەکرایەوە — ئەو شوێنەی کە **خانم سمحون** هەمیشە لەوێ دادەنیشت — هیچ پەنجەرەیەک نەدەبوونە لەمپەر لەبەردەم دیتنی دیمەنە جوانەکانی باخچەکە لەقەدەی دیوارەکاندا ، ژمارەیەک تابلۆی وێنە کێشراو دەبیندران ، ئەو وێنانە وایێ دەچوو کەبەنرخ بن ، لەپێشی پێشەوەی هەیوانەکە پیانۆیەکی سپی دانرابوو کەزیاتر لەهەموو شتەکانی تر سەرنجی هەر میوانێکی تازەی ڕادەکێشا و هەر لەدوورەوە

دەبیندرا ئەوە جگە لە دوو کورسی کەدروست کردنەکەیان دەگەڕایەوە بۆ سەدەی ١٥ ی زایینی

کاتێ کەزەنگی تەلەفۆنەکە لێی دا ، خانم سمحون تازە لەخوێندنەوەی گوتارێک دەبۆوە لەگۆڤارە ئابوری یە ناسراوەکان گوتارەکەی بەوردەکاریەکی زۆرەوە دەخوێندەوە ، جار جارە قاوەیەکی لەگەڵ نۆش دەکرد ، گوتارەکە پڕبوو لەژمارەو ڕێنووس و وێنە ، وێنەیەکیشی لەبازرگانانی عەرەب تێدابوو ، گووتارەکەش دەربارەی نەوت بوو

نزیکەی دوو مانگ بەسەر مردنی شارل سمحون دا تێ پەڕیوە ئەو کوێرەوەری زۆری لەگەڵ خۆیدا بردە گۆڕو خانم سمحونیش ئەو ڕۆژانەی بەشڵەژان و نیگەرانی بەڕێ کرد بەتایبەتی کاتێک دەستی بە نوسینی ئەو نامە سەرسوڕ هێنەرە کرد ئەو وای گومان دەبرد کەبەو کارەی سێبووری دڵی دێ و ئاسودە دەبێ بەڵام نیگەرانیەکەی تینی سەند

ئەو شتەی کەدیوید لە دواساتەکانی مردنی دا پێی دەگوت ، زۆر سەرسوڕ هێنەرو ترسناک بوو و لەهەمان کاتیشدا پڕ بایەخ ، هەموو باسەکە بەلایەوە تێکەڵ و پێکەڵ بوو بەڵام کاتێ غەم و خەفەتی لەخۆی دوور دەخستەوەو گوێی خۆی لەئەندێشەکانی ئەم ژیانە دەئاخنی ڕێگایەکی چاوەڕوان نەکراوی دۆزیەوەو ئەوەش زیاتر دەبۆ مایەی ترس و تۆقین و شڵەژان و دڵەڕاوکێش زیاتر بەربینگی دەگرت دڵە ڕاوکێیەک کەچەندەها هەفتە درێژەی کێشا بەشێوەیەک کەوورەو تواناکانی پوکاندەوە

ئەو وای بۆ دەچوو کە قسەکانی هاوسەرەکەی لە دوارۆژەکانی تەمەنی دا وڕێنە بوون ، وڕێنەیەک کە مەگەر هەر لەنەخۆشێکی تادار چاوەڕوان بکرێت ، بەڵام تێ ڕوانینەکانی دوید و ئەو ئۆقرەیی یەی کەڕوخساری داپۆشی بوو پێناسەیان لەوە دەکرد کەدەت گووت ئەرکێکی قورسی لەشانە ، دەستی لەناو دەستی هێلن هاویشت ، لەچاوەکانیدا هەستی سوپاس و پێزانین دەخوێندرایەوە نیگاکان هەستی خۆشەویستیان بۆ هێلین لێ دەباری ، بەڵام هێلن لەبەر قوڵپی گریانێکی بەکوڵ هیچی بۆ نەدەدرکێندرا چەندەها جار هەوڵی دا وێنەی وڕێنە گوتنی دوید لەزەینی خۆی دوورخاتەوە بەڵام سەرکەوتوو نەدەبوو

ئەوە نزیکەی دوو مانگ لەمردنی دوید تێ دەپەڕێ بەڵام ناکری خانم سمحون ئەو ڕازە لەلای کەس نەدرکێنی ، ئەو چاک دەی زانی کە ئیسرائیلی یەکان چ لەگەڵ منداڵەکانی دا دەکەن !

کاتێ کەئەو ٧ ساڵ لەمەوبەر ناسیاوەتی لەگەڵ دوید دا پەیدا کرد ، دەی زانی دووچاری پەیوەندی یەکی سەیر بووە وای بۆ دەچوو کەتووشی شتێک بووە کە هەمیشە لێی دەترسێ ، ئەویش هۆگر بوونە بەپیاوێکی ئیسرائیلی و شوو پێ کردنی

ئەو هەرکاتێ قەوانی بیرەوەریە ڕابردووەکانی لێ دەدایەوە ، زیاتر تووشی دڵەڕاوکێ دەبوو ، گەل و نەژادی ئەو هەر لەکۆن دا بەدووژمنی جوولەکان دادەنران بەڵام هەستێکی سەیرو نامۆ هەیە کە ئۆقرەی پێ دەبەخشێت

ڕۆژێک بەڕێوەبەری نوسینگەو هاوڕێ گیانی بەگیانیەکەی — لیندا — پێی گوت

- هێلن ئایا دەزانی ؟
- وای بۆ دەچم کەئەوم خۆش بوێ

لیندا ، ئەوی بەئاشکرایی بۆ هاوسەرگیری بەر کەنار دەکرد

- لەبیرت نەچێت خۆ ئەو جوولەکەیە

هێلن لەکاتێکدا کەبەدەست ئاماژەی دەکرد بەغەمباریەوە گوتی

- نەفرین
- بەڵام ئەو ئیسرائیلی یە

لیندا قیژاندی

- ئایا تۆ ڕەگەز پەرستی ؟ !

لیندا لەکاتێکدا کەسەری بۆ دەلەقاند و پێ دەکەنی بەوردی هەستی پێ کرد کەبە مشتومڕ و دم بەدمە کارەکە پێک نایەت ، بەکینایە ( درکە ) گوتی

- قوربان گرنگ نیە گرنگ نیە

پاشان هێلن شووی پێ کردو ناوەکەی بوو بە هێلن سمحون ، ئەو چێژی لەو هاوسەرگیریە وەردەگرت و لەگەڵ ئەو تەمەن و پیریەی کەهەشی بوو دوو منداڵی لێی بوو ، هێلن لە دوای هاوسەرێتیش لەدڵەوە هاوسەرەکەی خۆش دەویست ، دوید دەی زانی کەچۆن ڕەفتاری لەگەڵدا بکات ، کەی و چۆن و لەکوێدا ڕێزی لێ بگرێ و چۆن

لەکاتی گونجاو دا لەخۆی دوورخانەوە ؟ کەی خۆشەویستی خۆی بۆ دەرخات و چۆن سەرمەستی وشەکانی خۆی بکات ؟ **دوید** ئاوا بوو ، بەڵام ئەوەی کەسەیرو سەمەرە بوو لەلای **هێلن** ئەوە بوو کەهێشتا بەتەواوی **دویدی** نەناسی بوو ، بۆ نموونە لەکاتی گاڵتەو گەپ دا پێی دەگووت ناکرێ تۆ ئیسرائیلی بی یان جوولەکە بی و هیچ نیشانەیەکی ڕق و کینەش لەنێو چەوانت دا دەرنەکەوێ

بەڵام ئەو ڕۆیشت هەموو خەسڵەتە سەیرو ڕەسەن و هاوڕێیەتی و پیاوەتی وەک زیوەرێک لەگەڵ خۆیدا برد **دوید** لەپێش ئەوە دا کەبمرێت بەرهەڵستکارێکی بەهێز بوو لەبەردەم شەپۆلی خەم و پەژارەدا ئای خۆزگە ڕازەکانی لەگەڵ خۆیدا دەبرد ئای خۆزگە ئەو ڕازەی نەدەبیست بەڵام چۆن ؟ چۆن ؟ لەدوای مردنی **دوید** **هێلن** هیچ کات چێژی لەژیان وەرنەدەگرت ، تەماشای دوو منداڵەکەی دەکردو قورسایی بەرپرسیارێتی هەست پێ دەکرد لەبەر خۆیەوە دەکەوتە بیرکردنەوە ئەگەر باسەکە بەلای **دویدەوە** گرنگ نەبا لە دوایین ساتەکانی ژیانی دا بەوی نەدەگووت و ئەو ڕاسپاردەیەی بەو نەدەسپارد

بەڵام کاتێ دەکەوتەوە بیری ئیسرائیلی یەکان کەبەمە بزانن چی پێ دەکەن ئەوە لەخۆوە ترس و دڵەڕاوکێی لەدڵدا پەیدا دەبوو ، ئەوەش نەک لەبەر خۆی بەڵکو لەبەر منداڵەکانی

نزیکەی ٥٠ ڕۆژ لەمردنی **دوید** تێ دەپەڕێ و **هێلن** هێشتا مات و سەر سامە ، دنیای لێ وێک هاتووە ، هەتا شەوێک بازرگانێکی میسری بەناوی **نهاد کامل** چاوی پێ کەوت

**نهاد کامل** دۆستێکی کۆنی بوو و لەپێش ئەوە کە **دوید** بناسێ ئەوی دەناسی ، هەمیشە ماوەیەک بزر دەبوو ، دیسان ماوەیەکی تر پەیدا دەبۆوە هەروەک ئەوەی کەهەمیشە لێرە بووبێ ، چەندەها ساڵ بوو ئاگای لێ نەمابوو بەڵام لێرو لەوێ دەی بیست کە گوایە لە ئوستralیا دەژیت پاشان بیستبووی کە گەڕاوەتەوە میسر دوایە گووتبوویان کە لە کەنەدایە ، هەرخۆشی ڕازی ئەو دووری یەی دەزانی

لەسەردەمی هاوسەرێتی **هێلن** لەگەڵ **دوید** دا ، ئەو هۆکاری ئەو دووریەی دەزانی چونکە ژینگەیەکی سیاسی زۆر ئاڵۆز لەوەختی لەدایک بوونی ئیسرائیل لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاست دا بەسەر بازرگانانی ڕۆژئاوا دا سەپێندرا بوو

نهاد کامل ئەو جارەیان خۆی ئاشکرا کرد و ویستی بۆ بەستنی گرێ بەستی کڕینی چەند فرۆکەیەک کە ژمارەیان کەم نەبوو ، هەوڵی خۆی بخاتە گەڕ گفت و گۆی سادەو ساکاری نێوانیان دەستی پێ کرد لەسەرو حەدی بەستنی گرێ بەستەکەدا بوو کە هێلن بۆ خواردنی نانی ئێوارە بانگهێشتی کرد

لەڕاستی دا نهاد کامل بۆ بانگهێشتێک سەری دەخورا ، زۆر جار هەوڵی دەدا دڵی هێلن نەرم بکات بەڵام سەری نەدەگرت چونکە هێلن دەی توانی کامل هەرچەندە ساڵەهای ساڵە ئەفسەری سوپایە ، بەڵام پەیوەندیەکەی لەگەڵ بەرپرسانی وڵات دا پێ توندو تۆڵتر بکات .

هێلن وردەی دابەرخۆی و لێی پرسی :

- ئەرێ دەتوانیت نامەیەکم بۆ میسر بۆ ببەیت ؟

نهاد کامل گوتی

- لەهەفتەی داهاتوودا دەچم بۆ قاهیرە بەڵام پۆستەچی عەرەبستانی سعودیم

- بەڵام بەڵێنم پێ بدە

پاشان بێ دەنگ بوو ، بەڵام هەر بەئاسانی دەتوانرا لەگنجەکانی نێو چەوانیەوە هەست بە نیگەرانی بکرێت .

بەڵام نهاد سیلە چاوێکی تێ بڕی و پرسی

- خانم سمحون ... هیچ بووە ؟

هێلن لەکاتێکدا کەدەنگی نووسابوو گوتی

- وەرە بڕۆین

ئەوەی گوت و لە شوێنی خۆی هەستا ڕێک وەکو ئەوە کەبیەوێ خۆی بدزێتەوە ، نهاد کامل قسەکەی پەسند کرد ، تێ گەیشت کەهۆی نیگەرانیەکەی چی یە

نێو سەیارەکە ، کەشۆفێرەکەی گەنجێکی میسری بوو ، کش و مات بوو تا هێلن سامناکیەکەی شکاند گوتی :

- نامەیەک دەنوسم و بەتۆشی دەڵێم ، بەڵام یەک شتم لە تۆ دەوێ

- چ شتێ ؟

- ئەوە کە هەتا یەک پرسیاریش دەربارەی نامەکە لەمن نەکەی تەنها مەگەر خۆم شتێکی لێ بدرکێنم

- بەدڵمە

- ئەوەش لای هیچ کەس نەدرکێنی هەتا ئەگەر متمانەشت پێی بی

- بەدڵمە

- زۆر باشە ، بەبۆچوونی تۆ میسری یەکان گرنگی بەکام زمانی بیانی دەدەن ؟

- زمانی ئینگلیزی ، زمانێکی بیانی یەو زۆرترین قسەی پێ دەکرێ

لەسەر ئەو بنەمایە ڕێک کەوتن کە ڕۆژی دووەم **هێلن سمحون** لەگەڵ نهاد **کامل** بەو پەڕی متمانەوە لەسەر مێزی نان خواردن لەو چێشتخانەیەی کە لە باڵەخانەی کۆمپانیاکەدا بوو دانیشن و وت و وێژ بکەن

**هێلن** لەکاتێکدا کە دۆسیەکەی دەدایە — کە هەندێک نوسراوی سەبارەت بەگرێ بەستی فرۆکەکان تێدا بوو — گوتی

« نامەیەک کە لە دۆسیەکەدا دانەخرابێ دەتوانیت بیخوێنیتەوەو پاشان لەزەرفەکەی بهاویتەوە »

- ئەی بیدەم بەکێ ؟

**هێلن** ساتێک بێ دەنگ بوو ، خۆی بەتیکە گۆشتێکی ماسی کە لەبنی قاپەکەدا مابۆوە خافڵاند ، بەڵام هەر کە بەخۆیدا هاتەوە گوتی

- بیدە بەسەرۆکی ڕێکخراوی ئاسایشی میسر !

ئەوەی گوت و چاوەکانی لەڕووخساری نهاد **کامل** بڕی تا کاردانەوەی ئەو ببینێ ، بەڵام بەڕواڵەت گەنجەکە هێورو لەسەر خۆ دیار بوو ، پاشان بەدڵنیایی یەوە دوبارەی کردەوە

- بەسەرۆکی ڕێکخراوی میسرو کەسی تر نا !

نێوچەوانی نهاد ساردو سڕ بوو ، چاوە شینەکانی تێ بڕی و بەئارامی و سادەیی گوتی

- ئەوەیان بەدەستی خۆم دەدەم بەسەرۆک ، نیگەران مەبە

هەر ئەوەندە کە نهاد **کامل** جێی هێشت ، خەیاڵی سەیرو سەمەرەی بەدڵدا دەهات و لەبەر خۆیەوە دەکەوتە بیرکردنەوە کێ گرەنتی دەدا کەئەو نامە ناکەوێتە دەستی ئیسرائیلی یەکان !

سەرەڕای ئەوە کە هەموو لایەنەکانی لێک دابۆوە ، بەڵام هێشتا لە دڵەڕاوکێدا دەژی ، نامەکەی لەدەرەوەی کۆمپانیاو لەسەر یەک کاغەزی ئاسایی چاپ کرد ، واژۆی خۆی لە خوارەوە نەنوسی لەبەر ئەوە جگە لەزەرفێکی بەتاڵ شتێکی تر نەبوو کەبەئاسانی دەتوانرا خۆی لەژێر باری بەرپرسیارێتیەکەی دەربێنێ

بەڵام نهاد کامل تا هەفتەیەکی تر لەئەڵمانیا نەگەڕایەوە ، ئەی خۆزگە ڕۆژێک لەپێش سەفەرکردنی نامەکەی پێ دەدا ، یان دروست لەو ڕۆژەی کەسەفەری دەکرد

بەم شێوەیە خانم هێلن سمحون بۆماوەی ٤٠ سەعات لەشڵەژان و دڵە ڕاوکێدا مایەوە هەتا زەنگی تەلەفۆن لە سەعات ٩ ی بەیانی لەماڵەوە لەیەکێک لەڕۆژەکانی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٧٩ لێی دا ، تەلەفۆنەکە زەنگی لێدا ، هێلن ئاوڕی دایەوە بەبێ ئەوەی کەلە جێگەی خۆی بجوڵێ .

هەستی بەمەترسیەک کرد بەڵام خۆی بەخواردنەوەی فنجانێک قاوە خەریک کرد ، لەکاتێکدا کە داستانێکی لەڕۆژنامە فەرەنسی یەکان لەبەر دەست دابوو لەو کاتەدا ئۆلگا ی قەرەواش پەیدا بوو ، هەرچەندە خشپەی پێ یەکانیشی نەدەبیسترا هێلن لەپڕدا سەرسام ما ، هەوڵی دەدا بەهەموو توانایەوە بەسەر خۆیدا زاڵ بێ ، دەمت گوت دەیەوێ گۆڤارەکە بدڕێنێ بەڵام نیگا ئەفسوناویەکەی ئۆلگا کەبە چرپە دەدوا سەرسامی کرد بوو و تەواو حەپەساندبووی ، ڕەق ڕاوەستا بەڵام چەند سانێک لەپێش ئەوەی کەتەلەفۆنەکە زەنگ لێ بدا لەخۆی دەپرسی ئەگەر نهاد کامل نامەکەی تەسلیم کردبێ چ ڕوو دەدات ؟ وەڵامی قاهیرە چ دەبێ ؟ بەڵام زوو هاتەوە خۆو پێکەنینی بەخۆی دەهات لەبەر ئەوە نهاد کامل ٣٦ سەعات لەمەوبەر ئەڵمانیای بەجێ هێشتبوو ، نەدەکرا کەکارەکە بەو خێرایی یە لەوڵاتێکی وەک میسردا ئەنجام درابێ .

ئۆلگا گوێی لەسەر مێزە خنجیلانەکەی پەنا تەلەفۆنەکە هەڵخست ، هێلن بەسەر گەردانی لەخۆی دەپرسی :

(( ئایا ئەو تەلەفۆنە پەیوەندی بەنامەکەوە هەیە ؟ ))

ئۆلگا گوتی

- خانم لەپشت هێڵەکەوە کابرایەک دەڵێ ، من دۆستی دێرینی کاک سمحونم

هێلن بەئارامی فنجانی ڤاوەی لەسەر مێزەکە دانا سەرنجی بڕیە قەرەواشەکەی خۆی ، پاشان قەرەواش درێژەی پێدا

- دەنگی بەزاراوەی ڕۆژهەلاتی دەچوو

چاوەکانی هێلن چەخماخەیان دا ، قەرەواش درێژەی پێدا :

- لەوانەیە هەر لە ئیسرائیلیشەوە بێ

ئەو قسەیە وەکو گوللەی پێوەنێن سنگی ئازار دا ویستی دڵەڕاوکێ و سەرگەردانیەکەی بشارێتەوە ، پاشان هەستاو ئاماژەی بە قەرەواشەکەی کرد کەبڕوات ، کچە جوانەکە بەجێی هێشت

هێلن بۆ لای تەلەفۆنەکە ڕۆیشت و دەسکەکەی هەڵگرت :

- خانم سمحون ؟

- بەڵێ !

- من دۆستی دێرینی کاک سمحونم ، دوێنێ نامەی تۆ گەیشتە دەستم .

بەمنگەیەکی نارەزایی و خۆدزینەوەوە گوتی :

- کام نامەیە ؟

پرسیارەکەی زۆر بەپەلە بوو ، بێ دەنگی ساتێک باڵی کێشا ، پاشان دەنگێکی پڕ لەئۆقرە و ڤایم بەرگوێی کەوت .

- دممەوێ پاکت ترین سەرەخۆشی خۆمت ئاراستە بکەم

ترس و هەراسانی بەسەریدا زاڵ بوو ، پاشان بەرەنگێکی سوور هەڵ گەڕاوەوە گوتی

- بەڵام ئەوە چ نامەیەک بوو ناردبووت ؟

پیاوەکە زۆر لەسەر خۆو بەزمانێکی سادە وەکو کەسێک کەلە نەبەردێکدا سەرکەوتبێ ، دەدوا

لەوانەیە هەڵەیەک لەکارەکەدا ڕووی دابێ ، بەڵام من باوەڕم وایە کەئەو هەڵەیە بەڤازانجی تۆ تەواو بێ ، هەروەک دمریش کەوتووە گرنگی یەکی بۆ من نیە

هێلن هێشتا هەر بەپێ داگری و نکوڵی لێ کردنەوە وەڵامی دەدایەوە

- کۆمپانیای ئێمە ؟ !

- وای بۆ دەچوو لەم بارەوە لەوانەیە لەگەڵ نهاد **کامل** دا گفت و گۆی کردبی ، وای دەزانی گەمارۆ دراوە ، خۆی لەباسەکە لاداو گوتی

- بەلام بەلام من تاکوتایی لەسەر کاری خۆم لەهامبورگ نارۆم گەر بەلاتەوە ئەرک نەبێ ، ئێمە ئامادەین لە بێرمن پێشوازیت لێ بکەین

- ئێوە ؟

بەڵێ من و هاوبەشەکەم دێین تا چاومان بە دوو جگەر گۆشە خۆشەویستەکەی تۆ بکەوێ

- جگەر گۆشەکان ؟ !

- هاوبەشەکەی من دۆستێکی زۆر گیانی بەگیانی کاک **سمحون** بوو

- بەلام منداڵەکانم لەقوتابخانە ناگەڕێنەوە تەنها پشووی هەفتە نەبێ .

- ئاوا ؟ ئەوە ئیتر لە شانسە خراپەکەی ئێمەیە

ئەوەی گوت و بێ دەنگ بۆوە ، کوتا وتە ئەوەی دەگەیاند **کەهێلن** سەرپشکە چی هەڵدەبژێرێ ، بەلام ئەو دوو دڵ و شپرزە بوو

**هێلن** زانی کەرێگایەک بۆ دەرباز بوون نیە

- زۆر باشە کاکە دەتوانم ئەمرۆ سەعات 5 ی دووای نیوەڕۆ چاوم بەئێوە بکەوێ

- سوپاستان دەکەم

- ئایا ناونیشانی ئێمە دەزانی ؟

- باوەڕ ناکەم پێویستم پێی بێ

- بەئومێدی دیدار

پاشان بێ ئەوەی کەچاوەڕێی وەڵامەکە بێ لەپیاوەکە ، دەسکی تەلەفۆنەکەی لەشوێنی خۆی دانایەو

# بەشی دووەم

# عەودالّیی ڕاستەقینە

خانم **هێلن سمحون** لەو ژنانە نەبوو کە دەستە وەستان و ساویلکە بیّ و زوو خۆی بەدەست ترس و تۆقانەوە بدات بەڵکو سەرەڕای ئەوەش ئەو شانازی بەبارهێنانە خۆڕاگرو بەحەوسەلەیی یە ئەڵمانیەکەی خۆیەوە دەکرد ، ئەو لەپای ژان و ئازارەکاندا لە دایک بوو بوو لەسەردەمێکدا کە پۆستاڵەکانی پەلامار دەران ، شارە بچوکەکانیان بەملهوڕی و لەخۆبایی بوونەوە دەخستە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە

ئەو هێشتا منداڵ بوو کەلەگەڵ سەختی و گرفتەکانی ژیان دا ئاشنا بوو بوو ، نەهامەتیەکەی ئەوە بوو کەچەند مانگێک بەر لەدەستپێکی جەنگی جیهانی دووەم لەدایک بوو بوو ، لەپەنا قەیران و گرفتەکانی دا گەورە بوو بوو ئەو بەچاوی منداڵیی ئەو ڕۆژانەی بینیبوو کە ولاّتەکەی وێران کرابوو و چۆن نەوەکان سەر لەنویّ ڕاپەڕینەوە

سەعات لە ٥ ی دوای نیوەڕۆ نزیک دەبۆوە و خزمەت کاران بەرەو ماڵی خۆیان دەگەڕانەوە ، جگە لەخانم **فرا** و **سمحون** و **فرانتسی** پیر

ئەو هەموو خزمەت کارو قەرەواشەکانی خۆی مۆڵەت داو کەسی لەماڵەوەدا نەهێڵایەوە جگە لە مشورخۆری ماڵ و مەحرەمی ڕازەکانی و دۆستی وەفاداری ٢٥ ساڵەی

**هێلن** داوای **لەفرانتس** کرد تا لای بمێنێتەوە ، **فرانتس** لەدوای ئەوە کە ئەو هەموو پەشێوی و دڵە ڕاوکێیەی لیّ بینی بەو پەڕی تواناوە ڕازی بوو ، بەلاّم نەریت و شەرم و شکۆ ڕێگەی پیّ نەدا کەپرسیار لە هۆکاری نیگەرانیکەی بکات ، هەرکە ماڵەوە چۆڵ بوو ، ئامادەیی خۆی پیشان دا تا دەست بەجیّ و بەدڵنیایی یەوە داواکانی **هێلن** جیّ بەجیّ بکات

هەرچەندە میلی سەعاتەکە لە ٥ نزیک تر دەبۆوە ، پەشێوی و دڵەڕاوکێی خانم **فراو سمحون** زیاتر دەبوو ، هەیوانە گەورەکەی ماڵیان بەهەنگاوەکانی خۆیان دەبڕی و

لەپشتی شووشەی پەنجەرەوە سەیری بەفریان دەکرد کەچۆن وەکو خوری شانەکراو بەسەریەکدا کەوتووە

ئای کە دوید چەند حەزی بەو بەفرە دەهات ، کاتێ کەبەفری دەبینی داوای لەهێلن دەکرد کەبێن پێکەوە سەیری کلۆ بەفرەکان بکەن ، دوید مرۆڤێکی ڕۆژهەلاتی بوو

هەرچەندە لەبەفرەکە دەفکری زیاتر سەرسام دەبوو ، دەکەوتە بیرکردنەوە ، بەڕێ کردنی تەمەن چەند سەختە و چەند درێژخایەنە لەوێوە لەدوورترین خاڵی باشوری ئەلمانیا دەستی پێ کرد لەدوورترین خاڵی باشوری ڕۆژهەلاتی ئەلمانیا ا هێلن شیپور ا لەدایک بوو و ئەوەش نازناوی بەرە بابی بوو ؛ لەشارێکی بچووک بەناوی خام باوکی زێڕ فرۆش بوو شارەکە زۆر بچکۆلە بوو خەڵکەکەی هەموو یەکتریان دەناسی بەڵام کارل شیپور باوکی هێلن لەڕیزی بەهرەمەندەکانی شارو لادێ دەژمێردرا ، دیارە نەک لەبەر ئەوە کەدەوڵەمەند بوو بەڵکو پیاوێکی تێکۆشەر بوو قەیرانەکان زیاتر کاریان تێ نەدەکرد و چۆکی لەبەر دەم گرفتەکاندا دانەدەنا ،لەوەختی جەنگ دا چەندەها شار کەوتبوونە ژێر ڕکێف و ئابلووقەدان بەڵام ئەو هێشتا بەلێ هاتوویی و دڵە گەورەکەی خۆیەوە جوامێری و ڕەسەنایەتی خۆی لەدەست نەدابوو و لێکدا لێکدا دەستی هاوکاری و کۆمەک و بەخشینی بۆ خەڵکی شارەکەی درێژ دەکرد بۆیە لەدڵی هەر خێزانێکدا جێگەی تایبەتی خۆی کرد بۆوە بەڵام نەی دەتوانی قەیرانی تێ شکان قبوڵ بکات و گوێی خۆی لەئاقار ئەشکەنجەی پۆستاڵە ڕەش و ڕەزاگرانەکانی سەربازانی داگیرکەر بئاخنێ ، کاتێ کەخاکی نیشتمانە خۆشەویستەکەی داگیرکرا ئەو لەمەراقان مرد هێلن لەوکاتەدا حەوت ساڵان بوو

هێلن ئەو ڕۆژانەی لە دوای ٣٦ ساڵ دەهێنایەوە بیر خۆی کە ئەوو خوشکەکەی ناچار کرابوون لەگۆشەی ماڵەوەدا بمێننەوە چونکە هات و چۆ بەهەموو شێوەیەک قەدەغە بوو ، نەیان دەتوانی لەشوێنی خۆیان جووڵە بکەن یان نزیکی دەرگاو پەنجەرە بکەونەوە دوێنێ دوا سەربازی ئەلمانی شاریان بەغەم و فرمێسک و چاوەڕوانی و دڵە ڕاوکێوە بۆ داگیرکەران بەجێ هێشت بەیانی زوو هەستا ، دەنگی سەیارەو تانکەکان لە دوورەوە گوێچکەیان کاس دەکرد بەترس و لەرزو ئاخ و ئۆفەوە دایک و باوک لەپشتی پەنجەرەوە چاویان بڕیبۆ ئەو تەپۆلکەیەی کەدەنگی سەیارەو تانکەکان

ورده ورده لەوێوه نزیک دەبۆوه    دایک ڕەنگی هەڵ بزرکابوو    لەگریانی خوشکیش هەرگەڕێ    شار تەواو ئابڵووقه درابوو ، شەوێک لەمەوبەر دوای ئەوەی کە سەربازانی نیشتمانەکەی پاشەکشەیان کرد ، شەکەتی بڕستی لێ بڕی بوو ، پیاوان لەکلیسا کۆ دەبوونەوەو هەموویان لەسەر ئەوە یەک دەنگ بوون کەدەبێ لەکاتی هاتنی ئەمریکی یەکان بۆ ناو شار لەماڵەکانی خۆیاندا بمێننەوە    خەڵکی شار هەموو پێکەوە پەیمانیان دا کەجادەکان بۆ داگیرکەران چۆڵ بکەن    لەدەرەوە دەنگێک لەسەر بڵندگۆکان بەرز بۆوە کەباش لێی حاڵی نەدەبوو بەڵام دیتی کەباوکی بەوردی گوێی بۆ دەگرێ ، دەنگەکە پچڕا ، دایکیشی سەبارەت بەوەی کەلە بڵندگۆکان دەگوترا لەباوکی پرسی ، باوک لەکاتێکدا کەلە ڕقان بەگژ خۆیدا دەچۆوە گوتی :

- ئەوە چ شێتی یەکە ؟

- کارڵ ! ئەمریکی یەکان چیان دەوێ ؟

- ئەوان هیچیان ناوێ بەڵکو دەپرسن کەئایا ئێمە خۆ بەدەستەوە دەدەین یان بەرهەڵستیان دەکەین

دایک هەوڵی دا کەمێردەکەی هێورکاتەوە بۆیە بەسۆزەوە گوتی :

- ئایا هەقیان نیە ؟

- چ هەقێک ؟ جادەکان چۆڵ و ماڵەکان داخراون

ڕق و قین بینە قاقای گرت و دەستی بەدەم و چاویەوە گرت و کردی بەگاڵە

- ئەوە سەر شۆڕی یە    ئەوانە دەیانەوێ ئێمە بەسەر شۆڕی و چۆک دادانەوە

دووبارە لەناخی شاردا دەنگ لەبڵندگۆکان بەرز بۆوە    باوک هاواری دەکرد ئەویش بەپرسیار گێژی کردبوو

دایک بەگریەو زاریەوە قیژاندی :

- بۆچی ئەو شتەی کەدەیانەوێ نەیان دەینێ ؟

کارڵ تەماشای هاوسەرەکەی کرد ، گڕ لە چاوانی دەباری ، دایک لەکاتێکدا کەسەری هەڵ بڕی هاواری کرد

بۆ خاتری منداڵەکان    بۆ خاتری هەموو منداڵانی شار ، کارڵ !

باوک ویستی وەڵامی بداتەوە بەڵام لەبەر پەنجەرەکە لێی دیار نەبوو پاشان وشک هەڵات هەروەک ئەوە کەکارەبا لێی دابێ ، چاوەکانی سوور هەڵگەڕا بوون ڕەنگی هەڵ بزرکا بوو لەرزو تا دای گرتبوو

هاوسەرەکەی بەسەر سامی بۆ لای پەنجەرەکە ڕۆیشت

- کارڵ چیت لێ قەوماوە ؟

خۆی گەیاندە پەنجەرەکە تەماشای دەرەوەی کرد ، لەناکاو قیژاندی و کەوتە سەر زەوی ، ئەوان ئاڵای سپیان لەسەر بانی کلیسا هەڵدا

دووبارە ئەو دەنگە ئازار دەرە لەناخی بڵندگۆکان دا بەرز بۆوە ، دایک چیتر خۆی بۆ نەگیراو بە دەنگە نوساوەکەی گوتی - توخوا ئەو سەربازە دەڵێت چی ؟

کارڵ واقی وڕما بوو ، بۆ لای کورسیەکەی ڕۆیشت و خۆی هاویشتە سەر دەسکەکەی و گوتی :

- ئەو دەیەوێت هەموو ماڵێک ئاڵایەکی سپی بەسەر دەرگای ماڵەوە هەڵبواسێ

ژنی کلرڵ زۆر بەتوندی بۆ لای بۆفیەکە ڕۆیشت کەلە گۆشەیەکی ماڵەوە دانرابوو و گوتی :

- هەرچی دەیانەوێ دەیان دەمێ .

باوک لەژێر لێوەوە لەرقان گوتی :

- سەر شۆڕی و بێ دەستەڵاتی سەر دانەواندن و مل کەچی دایک بەسەر سامی لەبۆفیەکەدا بەدوای شتێک دا دەگەڕا سەرچەفێکی سپی لەبۆفیەکە دەرێناو لەپێش مێردەکەی ڕاخست ، باوک چاوەکانی سوور هەڵگەڕا بوون ، تکای لێ کرد ، نەک لەبەر ئێمە بەڵکو لەبەرخاتری منداڵەکان

پیاوە هەڵچووەکە سەری خۆی داخست

هێلن نەی دەتوانی ئەو ساتە لەبیر بکات باوکی هاتەوە یاد کەسەری داخستبوو و فرمێسکی هەڵدەوەراندن و شانەکانی هەڵدەپەڕین دایکیشی سەرچەفەکەی بەدارێکەوە ئاڵاند بوو تاکاتێ کەدەرگای ماڵەوەیان کردەوە ئاڵای سپی بەسەر دەرگای ماڵەوە هەڵبواسێ

باوک لەو ساتەدا دەگریا

هەموو شتێک کۆتایی هات     هەموو شتێک کۆتایی هات     لەو ڕۆژەدا **هێلن** شەپووری ١٧ ساڵە سوێندی خوارد کەنابێ ئاڵای سپی بەمەبەستی خۆ بەدەستەوەدان لەبەرانبەر دووژمن دا بەرزکاتەوە

خانم     خانم

**هێلن** بەسەر سامی بۆ لای **فرانتس** گەڕایەوەو ئەوەندەی لێ نزیک کەوتەوە کەخەریک بوو خۆی پێداکێشێ

- **فرانتس** چ ڕووی داوە ؟

- خانم ئێوە باشن ؟

- بەڵێ     بۆ دەپرسی ؟

**فرانتس** بەسۆزەوە گوتی :

ببورە خانم     بەڵام بانگتان دەکەم بەبێ ئەوەی کە     قسەکەی بڕی و تێ گەیشت کە چ ڕووی داوە ، ئەو بە تەواوی لەورەی **هێلن** حاڵی بوو

- دەمەویست ڕۆژی هەڵ کردنی ئاڵای سپی بێنمەوە یاد

بیچمی **فرانتس** تێک قووپا بوو چونکە دەی زانی کەکام بیرەوەری تاڵ **هێلن** ئازار دەدا

- ئایا ئێوە ترساون ؟

- لەوانەیە

**هێلن** ئەوەی گوت و لەتێ ڕووانینەکەی تۆقی بوو     پیرەمێردەکە لەکاتێکدا کەلە ئامانجەکەی نزیک دەکەوتەوە پرسی پێ کرد

چات بۆ بێنم ؟

**هێلن** تەماشای سەعاتەکەی دەستی کردو لەبەرخۆیەوە کەوتە ورتە ورت :

- کات نیە ، چەند خولەکێکی تر میوانمان دێن

پیرەمێردەکە زیاتر لەئامانجەکەی نزیک کەوتەوەو پرسی

- ئایا ئەوان نامۆن ؟

- **فرانتس** ! نازانم     لەڕاستی دا بەتەواوی نازانم

- ئایا ئیسرائیلین ؟

ڕووی بۆ لای پیرەمێردەکە وەرگێڕاو بەپێکەنینەوە گوتی

- حەز دەکەم بەم شێوەیە نەبێ

پیرەمێرد هەوڵی دا دیسان بپرسێتەوە بەڵام هەیوانی پێشوازی بە شۆقی سەیارەکان ڕووناك بۆوە کە وردە وردە لەماڵ نزیك دەکەوتنەوە ؛ هەردووکیان بۆ لای پەنجەرەکە بایان دایەوە کاتێ سەیارەکە دەیەویست لەبەردەم دەرگای دەرەوەی باخچەکە دا ڕابووەستێ

**هێلن** گوتی : هاتن هاتن ...

**فرانتس** تێی گەیاند کەدەبێ بەپەلە بەپێشوازیانەوە بچن

ئەو میوانانەی کە گەیشتنە ماڵی بێوەژن **دیوید شارل** ، هەمان دوو گەنجەکە بوو کە ٢٤ سەعات لەمەوبەر لەفرۆکەخانەی نێو دەوڵەتی قاهیرەوە کەوتبوونە ڕێ

هەوای دەرەوە ، زۆر ساردو تەزێنەر بوو ، کاتێ دوو گەنجەکە لەباخچەکە تێ پەڕین و گەیشتنە بەردەم دەرگای هاتنە ژوورەوە ، **فرانتسی** پیر هاتە پێشوازیان ، دوو گەنجەکە باڵتۆی گرانیان لەبەر دابوو ، هەروەها هەرکامێکیشیان کڵاوێکی لەسەر نابوو کە سەرو سەکوتی دەشاردنەوە ، یەکێك لەوان **بەفرانتسی** گوت :

- ئێمە لەگەڵ خانم **سمحون** دا بڕیاری دیدارمان هەبوو

پیرەمێرد ڕێگەی خۆش کردو گوتی :

- ئەوانیش چاوەڕوانتان دەکەن

دوو پیاوە گەنجەکە دەست بەجێ هاتنە ناو هەیوانی ماڵەوە ، **فرانتس** دەرگاکەی داخست و باڵتۆو کڵاوەکانیانی لێ وەرگرتن و بۆ ژوورەوە ڕێنمایی کردن ، لەپەنا پیانۆ سپیەکە خانم **سمحون** لەپێشوازیان دا ڕاوەستا بوو ، لەیەکەم سات دا ئەو شتەی کەخانم **سمحونی** سەرسام کرد ، زاڵ بوونی ئەوان بوو بەسەر زمانی ئەڵمانی دا ، ئەوان زۆر بەئاسانی و هەروەك زمانی زگماکی خۆیان بە ئەڵمانی قسەیان دەکرد

لەبەر ئەوەی **هێلن** بانگهێشتی دانیشتنی کردبوون ، **فرانتس** سینی یە چایەکەی لەبەردەمیان داناو پاشان گوتی

- شتێکی ترت پێویست نیە ؟

**هێلن** پێکەنی و بەچاوێکی سوپاس گوزارانەوە تەماشای کردو گوتی :

- سوپاست دەکەم ، ئەگەر پێت خۆشە دەتوانیت بڕۆیت

- دەمێنمەوە

قسەکەی زۆر بنەبڕبوو لەسەر ئەو شتە خانم سمحون ڕەخنەی لێ نەگرت ، پیرەمێرد بەڕێزەوە سەری داخست و نیشانەی واق وڕمان لەسیمایان دا بەدی دەکرا ، لەدوای پێ ناساندن گوتی

- حەتمەن پێویستت بەخواردنەوەی گەرم هەیە چونکە هەوای دەرەوە زۆر ساردە

یەکێک لە دوو گەنجەکان زەردەخەنە گرتی هەرچەندە کەخەمباریش دیار بوو

گەنجەکە گوتی :

- جگە لەگەرم و گوڕی پێشوازی ئێوە هیچ شتێک ناتوانێ ساردی هەوای شارمان لەبیر بباتەوە

ناسینی پیاوە گەنجەکە سەرسامی هێلنی کەم کردەوە

هێلن لەکاتێکدا کەچایەکەی لەژێر پیاڵەکە دەکرد گوتی :

لەئەویندراری بەولاوە شتێکی تر نیە کەتۆ زاڵ کات بەسەر زمانی ئەڵمانی دا

گەنجەکەی دووەم گوتی :

هەروایە خانم هێلن دەزانێ کە گەلی میسر چەندە ڕێز لەئەڵمانیاکان دەگرن و شانازیان پێوە دەکەن

بەچەندەها شێواز گەنجەکە ژنەی لێ حاڵی کرد کەئەوان لەمیسرڕا هاتوون

ساتێک هێور بۆوە ، پاشان کەوتە بیرکرنەوە ، کێ دەزانێ کە ئەوان بەڕاستی میسرین ؟ ا ئەو بەسەفەر ئیسرائیلی دیبوو ، بەهەمان شێوە لەمەوبەریش چوو بۆ میسر ، دەی زانی کەئەو دوانە زۆر لەیەکتری نزیکن بیری کەوتەوە کە دوید پێی نەگوتبوو کەلە میسر لەدایک بووەو تا هەڕەتی لاوی لەوێ ژیاوە !

لەگەڵ ئەوەدا کەئەو خەسڵەتە ناحەزەی بەئارامی پشت گوێ خست ، دوو ئیستیکان چای بۆ هێنان و پرسی پێ کردن :

- حەزتان لەکێکە ؟

دووپیاوەکە بێ وچان سوپاسیان کردو ئەویش لەشوێنی خۆی کڕومات دانیشت تائەوە کە یەکێک لەوان ڕاستەوخۆ گوتی - خانم مۆڵەت بدە تا سەرە خۆشی خەڵک و حکومەت و دەزگای ئاسایشی میسرتان پێ ڕابگەیەنین .

خانم **هێلن سمحون** سەری بەمەبەستی سوپاس کردن بۆ لەقاند پیاوە گەنجەکە درێژەی پێدا

- ئەوە لەچاکەی بیرۆکەی تۆوە بوو کەنامەت بە نهاد کامل دا نارد

- شڵەژان و نیگەرانیەکی لەناکاو جەستەی ژنەی داگرت ، دەیەویست سەرە داوەکە بۆ وان بەجێ بێڵێ بەبێ ئەوەی بتوانێ بەسەر خۆیدا زاڵ بێ بەدەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی :

- ئایا مافی خۆم نیە ناوی ئەو کەسانەی کە گفت و گۆیان لەگەڵدا دەکەم ، بزانم ؟

گەنجەکە هەوڵی دا درێژە بەقسەکانی بدات ، خانم **سمحون** فنجانە چایەکەی وەلاناو درێژەی پێدا

- پیاوەکان خۆیان بەمن نەناساند ، بەهەر حاڵ ڕازیمە تا دەربارەی کاروباری کۆمپانیا قسە بکەین

گەنجەکە پێکەنی و گوتی

- لەشوێنێکی وادا ناوی ڕاستەقینەی ئێمە چ بایەخێکی بۆ تۆ هەیە ؟

قسەکانی زیاتر خافڵاندن بوون بەڵام دەی توانی کەهەر ناوێکی تر لەخۆی بنێ

- خانم **سمحون** دیسان نیگەران بۆوە بەڵام گەنجەکە درێژەی بەقسەکانی دا

- ئەدی **خانم** ! ئێمە لەبەر ناردنی نامەیەکی جەنابتان کەبەچاپ نووسرا بوو و واژۆکەشی هەر چاپ کرابوو بەبێ ئەوەی کەناوی وەرگرەکەی تێدابێ نەگەیشتووینەتە ئێرە ؟ !

ئەو نیشانانە ژنەیان وا حاڵی کرد کە نامەکەی ڕێک گەیشتۆتە شوێنی خۆی بەڵام ئەو گەنجە کێ یە ؟ خانم **سمحون** لەسەر کورسیەکەی خۆی ، خۆی وێک هێنابۆوە و دەستەکانی ڕێک دەخشاندن گەنجەکە بەلایدا چەمایەوەو گوتی

- واباشترە باسەکە تەواو بکەین و بچینە ناو بنج و بناوانی کارەکە

ژنە چاوە پڕ لە پرسیارەکانی بڕیە گەنجەکەو گوتی :

مەبەستی ئەو چی یە ؟ گەنجەکە ئیستیکانە چایەکەی وەلاناو پاشان جانتا پارەکەی دەرێناو بە هوشیاری یەوە باقە پارەکانی دەردێنان و هەستا پی تا پێشکەش بە **خانم سمحونیان** بکات و گوتی

- ئەوە نیو باقەی ١٠ مارکی کۆنە

دڵە ڕاوکێ و پەرێشانی یەکی سەخت ژنەکەی ئازار دەدا پرسیاری لەخۆی دەکرد ئای کەچەند لەو مەسەلەیە بێ ئاگا بووە

لەناکاو بیرەوەریە ڕابردووەکانی بەمێشک دا هاتەوە

ژنەکە دەستی درێژ کرد تانیوەی باقە پارەکان وەرگرێ دەنگی گەنجەکە وەهۆش خۆی هێنایەوە :

- لەڕاستی دا ئەو پارەیە کاتێک کەتۆ منداڵ بووی و لەشاری خام نیشتەجێ بووی بەتاڵ کرایەوە بۆ ژنە ئەوەندە بەس بوو کەچاوێک بەباقە پارەکان دا بگێڕێ و هەموو شتێک یەکلابێتەوە ، قسەکانی گەنجەکە دەبوونە مایەی ئەوە کە **خانم سمحون** بەخۆدا بێتەوە ، ژنە خۆی بەتەنیایی لە شارێکەیەکی دوورو بێ دەرەتان دا دەدیتەوە

بیرەوەریە دوور و هەنووکەیی یەکان ئاوێتەی شڵەژان و پەرێشانی بوو بوون ، **خانم سمحون** لەخۆی پرسی ئەو گەنجە کێ یە کە هەموو شتێک دەربارەی من دەزانێ ؟ چۆن ئاگای لەژیانی من هەیە لەشاری خام لەکاتێکدا کەئەوە ساڵەهای ساڵە ئەو شارەم بەجێ هێشتووە کەچی هێشتاش سەرو کارم لەگەڵیدا ماوە دووبارە بەوردی لە هەموو باقە پارەکانی نۆڕیەوە نەی دەتوانی کوڵ و کۆی دەروونی بشارێتەوە ، بە چاوە پڕ لە فرمێسکەکانی تەماشایەکی کردو بۆ یەکەمین جار لە دوای مردنی دوید هەستی بەئارامی و ئاسایش دەکرد ، گەنجە ڕۆژهەڵاتیەکە گوتی

- کاتێ کە ١٠ ساڵە بووی ئەو پارەیە بەتاڵ کرا بۆوە وانیە ؟ !

**خانم سمحون** سەری خۆی بەمەبەستی ڕاست دەکەی لەقاندو دڵنیابوو کە ڕێگەیەکی ڕاستی هەڵبژاردووە ، لەسەر نیوەی باقەکە دەست خەتی دوید بینی کە نووسیبووی

ئەوانە هاونیشتمانانی منن واژۆ — دوید ژنەکە لە ڕاستی بوونی واژۆی مێردەکەی گومانی نەبوو

- ئەگەر جانتا پارەکەی هەڤاڵ دوید **سمحون** بگەڕێی نیوەی دووەمی هەمان باقەکانت دەستت دەکەوێ و ئەو باقانە تەوا

و دەبنەوە

خانم **سمحون** لەکاتێکدا کە هەڵدەستایەوە بەدەنگی لەرزۆکەوە گوتی

- لە دوارۆژەکانی ژیانیشی دا ئەو باقانەم دیتن

فرمێسک چاوەکانی ژنەی تەڕ کرد بەڵام هەوڵی دا دان بەخۆیدا بگرێ درێژەی پێدا

- ئەو کارە منی وڕو سەرسام کردووە بووم بەڵام ناتوانم ببورە ساتێک ئایا ؟

خۆی مەرزەم کردو لەکاتێکدا کەبۆ لای پلیکانی نهۆمی دووەم دەڕۆیشت ڕاوەستاو گوتی

- لەسەر ئیزنت ساتێک و دەگەڕێمەوە

دوایە بەپەلە پلیکانەکانی بڕی و لەبەر چاوی گەنجەکە ون بۆوە ئەو دوو هەڵوێستە واپێ دەچوو کەکەسێک لەپشت پەردەوە بێ ، بەخێرایی سەری داخست و لەدرزی ژوورێکی نیوە کراوەدا فرانتسی دیت فرانتس پێکەنی و بەسۆزەوە پرسی :

- فەرمایشتێکت نیە ؟

پێش ئەوەی کە وەڵامی بداتەوە ، **هێلن** لەنهۆمی دووەم ڕا بانگی کرد

- **فرانتس** ... **فرانتس**

**فرانتس** بەپەلە غاری دا و پلیکانەکانی بەخێرایی بڕی

- بەڵێ ... خانم

کاتێ کە لەدوا پلیکانەکان گەیشتە **هێلن** ، هێلن نیوەی باقە ١٠ مارکیە ئەڵمانی یەکانی کە لە ساڵی ١٩٤٨ بەتاڵ بوو بوونەوە ، بەدەستەوە بوو ، هەر کام لەو دوو نیوە باقانە تەواوکەری یەکتری بوون **هێلن** ئەوانەی لەکن پیرەمێردەکە داناو گوتی

- ئایا ئەو باقانەت وەبیر دێنەوە ؟

پیرەمێرد نیازی وانەبوو وەبیر خۆیان بێنێتەوە یان تەماشایان بکات چونکە خانم **هێلن** ڕۆژێک لەدوای مردنی دوید ئەو ڕازەی بەو گوتبوو لەبەر ئەوە بەتەما نەبوو تەماشایان بکات یان دووبارە بیان هێنێتەوە بیر خۆی ، پیرەمێردەکە زیاتر لەخەمی خانم

سمحون دابوو کەلە بەردەمیدا لەخۆشیان هەڵدەپەزی و شادیەکی بێ وێنە سەرتاپای گیانی داگرتبوو

ئەو ڕێکەوتە ڕۆژێک لەدوای مردنی دوید سمحون دا ڕووی دا ئەو شتەی کە دوید لە دوا ساتەکانیدا پێی گوت زۆر نیگەران کەرو ترسناک بوو

هێلن باسەکەی لەزۆر لایەنی جیاوازەوە خستە ژێر لێکۆڵینەوە ، پاشان ڕازی بوو کە لەبەر خاتری منداڵەکان ناچارە ڕاستی کارەکە ئاشکرا بکات ، هەرچەندە کە لەوانە بوو وروژاندنی ئەو کارە بۆ وی بەگران تەواو بێ

هێلن لەپێش ڕێ و ڕەسمی ناشتنی مێردەکەی دەرگای ژوورەکەی لەسەر تەرمەکە داخست ، پاشان هەموو بۆفیەکانی پشکنی و هەموو بەڵگەنامەو ئەوراقەکانی بەگوێرێ وەرکردن ، هەموو کاغەزو نوسراوەکانی بەوردی خوێندەوە و پاشان بەجوانی ڕێکی خستنەوە ، هەموو شتێک لەدیدی ئەودا سروشتی بوو ، بەڵام قسەکانی دوید زۆر قەڵسی کردبوو

وردە وردە دەگەیشتە ئەو ڕاستی یە کەقسەکانی دوید جگەلە وڕێنە شتێکی تر نەبوون ، کاغەزەکانی چەندەها جار تێک هەڵدان ، بەڵام کاتێ جانتا پارەی مێردەکەی کردەوەو تووشی نیوە باقە ١٠ مارکیە کۆنەکان بوو سەری سوڕما ، ئەو ڕۆژە ڕەشەکانی ساڵی ١٩٤٨ ی بەچاکی لەبیر بوو کاتێ کەمارکی ئەڵمانی بەتاڵ بوو بۆوە و دەبوا مارکی تازە وەربگرێ ، لەو کاتەدا ئەو منداڵێکی ١٠ ساڵە بوو ، بەڵام بەچاکی وەبیری دەهاتەوە کەخەڵک چۆن ماڵ و سامانی خۆیان لەدەست دەدا ، چاک وەبیری دەهاتەوە کەبڕیار وابوو دەبوا خەڵک لەکاتی گۆڕینەوەی پارەکانیان ڕێژەی ⅓ ی پارەکەیان وەرنەگرنەوە ، دەهاتەوە یادی کە دەبوا هەر کەسێکی ئەڵمانی بە ٤٠ مارک خۆی بکڕێتەوە تا ژیانی لە سفرەوە دەست پێ بکاتەوە لەوانەیە هەر لەژێر سفریشەوە هەموو خەڵکی ئەڵمانیا ناچار بوون وڵاتەکەیان لەنوێیی بنیات بنێنەوە ، نیوەی باقەکانیان لەجانتا پارەکەی دوید دا دۆزیەوە ، لەڕاستی دا نامەیەکی ناتەواو بوو کە بۆ هێلنی نووسی بوو

هێلن پشتت ببەستە بە و لە دوای ئەوە شتێکی تر نەنوسرا بوو

بابەتەکە بەلای ئەمەوە سەیر بوو دووبارە گەڕایەوە سەر دۆسیەکەو ئەوراقەکانی پشکنی یەوە تا بەڵکو نیوەی دووەمی باقەکان بدۆزێتەوە ، هەندێک جار

پرسیاری لەخۆی دەکرد لەنێوان ئەو شتەی کە دوید گووتوویەتی و ئەو نیوە باقانەدا چ پەیوەندی یەک هەیە ؟ هاتە سەر ئەو ڕایە کەدەبی پەیوەندی یەک هەبێ

لەگەڵ **فرانتس** دا سەبارەت بەنامە ناتەواوەکە قسەیان کرد بەڵام نەی وێرا ڕازی ترسناکی خۆی پی بلێت ، ئێستا ئەو دوو نیوە باقەیە لەدەستی ئەو دابوون

**هێلن** و **فرانتس** هەر کامێکیان چەندەها جار نامەکەیان خوێندەوە هەروەک ئەوەی کەمتمانەیان بەچاوەکانی خۆیان نەبێ ، لە دوای ئەوە کە دوو نیوە باقەکانیان لەپەنا یەکتری دانایەوە نامەکە تەواو بۆوە

**هێلن** : متمانە بەوانە بکە چونکە ئەوانە هاونیشتمانی منن

واژۆ دوید

فرانتس چاوێکی وێڵی بریە خانم **سمحون** و گوتی :

- خانم تۆ دڵنیای کە ئەوە واژۆی **سمحونە** ؟

- لەو بارەوە گومانم نیە !

**هێلن** لەکاتێکدا کەپێ دەکەنی و ڕەزامەندی بەلێوانەوە دیار بوو ئەو ڕستەیەی بەمتمانەی تەواوەوە گوت و بۆ لای دوو گەنجەکە ڕۆیشت ، ئەوانیش لەبەری هەستان و بەرێزەوە لەبەردەمی دا وەستان

**هێلن** گوتی

- وای بۆ دەچم کەهەقی خۆتە لەنیوەکەی تری باقەکان ئاگادار بی

یەکێک لەوان لەکاتێکدا کەچاوێکی بەپەلەی لەباقەکان بڕی گوتی :

- خانم **سمحون** ئەوانە هەردووکیان مافی تۆن چونکە نامەکە بۆ تۆ نوسراوە

**هێلن** هەستی بەسەر بەرزیەک کرد خۆشحاڵ بوو ڕووی کردە پیرەمێردەکەو گوتی

- **فرانتس** ، هاوڕێکەم ئێستا دەتوانیت بەدڵنیایی یەوە بڕۆیت چونکە ئەوانە لەهاوڵەکانی ئێمەن ، هەر لەو ساتەوەکە ئەو دوو گەنجە هاتبوون ئەوە یەکەمین جار بوو پیرەمێردەکە وا لەناخەوە پێ بکەنێ ، پاشان لاقەکانی جووت کردن کەئەوەش جۆرە ڕێز لێنانێکی ئەڵمانیانە بوو ، بەسەر دانەواندنەوە ڕێزەکەی بەجێ گەیاند هەر بەدوای ئەمەش دا ڕێزی لە دوو گەنجەکەش گرت

تەواوکردن و هاوخوێندنەوەی باقە کۆنەکان لەڕاستی دا بەواتای تەواو کردنی نامە نیوە چڵەکە بوو ئەوەش کاریگەریەکی ئەفسوناوی لەسەر **هێلن** دانا بوو ، لە دواساتەکانی کە **فرانتس** ماڵەکەی بەجێ دەهێشت ، **هێلن** هەستی بەدژواری و جم و جۆڵ دەکردو بەلایەوە ئەستەم بوو قسەکانی **دوید** باوەڕ بکات لەبەر ئەوە ژیان ئازاری دەداو خەفەت کوچکی بەجەرگیەوە دەنا ، بەڵام ئەو شتەی کەبەپلەی یەکەم لای **هێلن** بایەخی هەبوو دەرکەوتنی ڕاستی یەکە بوو ئەو باسە هێندە پەیوەندی بەمەوە هەبوو کە بۆ منداڵەکان و دواڕۆژیان

ئێستا ئەو لەبەرانبەر ئەو دوو گەنجە دانیشتووەو بەشێوەیەکی خۆ نەویستانە باوەڕی وایە کە لەڕاستی نزیک دەکەوێتەوە

بۆ شوێنی خۆی گەڕایەوە ، دوو نیوە باقەکەی هەر والە دەست دابوو ، هەروەک ئەوەکە گەنجینەیەکی دۆزیبێتەوە ، لەسەر کورسی یەکەی دانیشت و خۆی هێور کردەوە ، ویستی دەست بە قسەکردن بکات ، بەڵام یەکێک لە دوو گەنجەکە پێی گوت

- خانم **هێلن** ناچارم کەخاڵێکی زۆر گرنگ هەیەو دەبێ پێتی ڕابگەیەنم

**هێلن** بەسەرسامی یەوە تەماشای کرد ئەو ئاماژەی بەگەنجەکە کرد تا درێژەی بەقسەکانی خۆی بدات ، گەنجەکە بەدڵنیایی یەوە وشەکانی دەردەبڕی تا گرنگی باسەکەی تێ بگەیەنێ ، پاشان گوتی :

- ئەو شتەی کەدەمەوێ بیڵێم بایەخی زۆرە ئێمە بۆمان نیە بیخەینە ژێر پرسیارو بەهەمان شێوەش ڕێگەمان پێ نەدراوە کە هەموو پرسیارێک کە بەبیری تۆدا دێ وەڵامی بدەینەوە

**هێلن** پشووی خۆی لەسنگ دا پەنگ خواردەوە ، گوایە نایەوێ بەسەر هیچ وشەیەک داباز بدات گەنجەکە درێژەی پێدا - ئێمە بە لەدەست دانی هەڤاڵ **سمحون** زۆر دڵگرانین پرسەکەمان لێ قبوڵ بکە ، حەز دەکەین ڕەزامەندبی لەسەر بانگهێشتی حکومەت بۆ قاهیرە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێکی دیاری کراو

دووبارە نیگەرانی و شڵەژان جەستەی هێلنی داگرت گەنجەکە بۆ ماوەی چەند چرکەیەک بێ دەنگ بوو و وەک کەسێک کەبیەوێ شتێکی گرنگ بڵی ، هەناسەی تازە کردەوەو درێژەی پێدا

- پابەند دەبم بەمەوە کەسەفەری ئێوە بە شێوەیەکی نهێنی ئەنجام دەدرێ ، هەڵبەتە لەدوای ئەوە کە بانگهێشتەکە قبوڵ بکەی !

گەنجەکە دووبارە وس بوو ، وەکو ئەوە کە بیەوێ مۆڵەت بەهێلن بدات تا قسەکانی باشتر هەرس بکات و پاشان بەشێوازێکی دۆستانە ، درێژەی پێدا

- لەقاهیرە میوانێکی ئازیز دەبیت بۆ گەلی میسر بۆیە لەوێ وەلامی هەموو پرسیارێکت دەست دەکەوێت

هێلن هزری بە خێرایی یەکی زۆر کەوتە هەوڵ و تەقەلا

... سەفەری نهێنی ؟ ! ئەوە چ واتایەکی هەیە ؟ دوایەش بۆ کوێ ... ؟ بۆ قاهیرە کە هەتا یەک کەسیش لەوێ ناناسم ؟

چاوێکی بڕیە دوو نیوە باقەکەو هەوڵی دا خۆی بەخوێندنەوەی نامەکەی دویدەوە بخافڵێنێ ، ئەو باسە بەلایەوە سەیرو سەمەرە بوو و ترس و نیگەرانیەک لەناخەوە هەژاندی ، ئایا دەکرێ بەسەر هاتی خۆی بە دوو گەنجی نەناسراو بسپێرێ ! ؟

باسەکە ئاڵۆز بوو کێ دەی زانی کەئەو بەزیندوویی دەگەڕێتەوە ؟

بێ دەنگی یەکەیان درێژەی کێشا ، هێلن بۆ کات بەسەر بردنی زیاتر گوتی :

لەوانەیە ئێوەش بزانن کە دەیەها پرسیار بەدڵم دا دێت .

گەنجەکە گوتی : بەدڵنیایی یەوە

- ئەو باسە لەڕاستی دا بۆ من ترسناک و تێکەڵ و پێکەڵە

پاشان هەستی پێ کرد کەئەو گەنجە ، مۆڵەتی گوتنی زۆرێک لە قسەکانی پێ نی یە ، هێلن لەو ساتە وەختە دا خۆی دوور لەڕاستەقینە دەدی ، ڕاستەقینەیەک کەلە قاهیرەدا بوونی هەیە .

ویستی فێڵێک بەکار بێنێ ، پاشان پرسیارەکەی بکات

- کەی دەتوانم بانگهێشتەکە قبوڵ بکەم ؟

- هەر کاتێ کە بتەوێ !

ئێستا هێلن بیردەکاتەوە دەبێ دوو دڵ بی یان گومان و دڵەڕاوکێ بنێتە لاوە
هێلن ناترسی و مۆتەکەی ترس هەمیشە بە سووک و ڕیسوا دەزانێ
سوێندی خوارد بوو کە هیچ کات خۆی بەدەستەوە نەدات

دووبارە ڤێڵێکی بەکارهێنا تا دەرفەتی زیاتر بەدەست بێنی و پەشێوی دەروونی لەخۆی دوورخاتەوە ، پرسی :

- سەفەری نهێنی ؟ !

- گەنجەکە بەو پەڕی تواناو متمانە بەخۆ بوونەوە گوتی :

- ساغ و سەلامەتی خۆت و منداڵەکانت بەپلەی یەکەم لەبەرچاو گیراوە

- دەبێ من لەبارتەقای ئەو کارە نهێنی یەدا چ شتێک بکەم تا سەلامەتی خۆم و منداڵەکانم مسۆگەر بێ ؟

- هیچ ! تەنها ئەوەندە کەنابێ لای کەس بیدرکێنی دۆست بێ یان ئاشنا تۆ بۆ قاهیرە دەبردرێی

- بەڵام دەبێ بۆ ماوەیەک خۆم لەبەر چاوی خەڵک ون کەم .

- دەزانم دەتەوێ بڵێی دەمەوێ خوشکم ( فلۆرا ) لەشاری خام ببینم

هێلن لەسەر کورسی یەکەی خۆی جووڵەیەکی کرد و ڕێگەی تری بۆ ڕەخنەگرتن دۆزیەوە ، لەبەر ئەوە لەبەرخۆیەوە بیری دەکردەوە ئەی کە ئەو گەنجە چەندە قسە لەڕووەو چۆن خۆی لەژیانی تایبەتی ئەو هەڵدەقورتێنێ . قیژاندی :

گەنجەکە بەئارامی درێژەی بەقسەکانی دا

- هەر کاتێ ویستت بچی بۆ شاری خام لەگەڵ دکتۆر کارل ( ژاروسلاڤ ) لە چکسلۆڤاکیا بەیەکترتان دەناسێنین ئەو پزیشکی چارەسەری تۆیە هەموو ساڵێ لەناوچە کوێستانیە دابڕاوەکان دا سەردانی دەکردی ، هێلن قسەکەی پێ بڕی و لەکاتێکدا کەلە ڕقان سوور هەڵگەڕابوو ، کەمێک ڕاوەستاو گوتی :

حەز دەکەم سنورو پاوانی خۆتان بزانن

دوو گەنجەکە دیسان دەست بەجێ ڕەپێ بوون ، یەکێک لەوان بەسەرسامی یەوە گوتی :

بەڵام هاوڕێ سمحون بۆ سەروچاوەی ئاوی کانزایی دووجار لەگەڵ ئێوەدا چوون

**هێلن** چاوە نکۆڵ کەرەکانی تی بڕی بەڵام دەت گوت کەئاوێکی ساردیان وەسەرگێڕاوە ئەو هەستی بەمە دەکرد کە قسەکانی گەنجەکە هیچ شتێکی شاردراوەیان لەخۆ نەگرتووە بەڵام نەی دەزانی بۆچی لەناکاو هەڵچوو و تووڕە بوو

ویستی داوای لی بوردن بکات ،بەڵام لەشوێنی خۆی دانیشتەوە بەبارێکی نائاسایی گوتی:

- لەوانەیە ئێوە لەسەر هەق بن لەوانەشە من لەسەر هەق بم

دوو گەنجەکە لەشوێنی خۆیان دانیشتنەوە ، **هێلن** درێژەی پێدا

ئومێدەوارم بم بوورن چونکە ئەو باسە بۆ من جێگەی سەرسامی بوو

گەنجەکە گوتی

- ئێمە هەست بەبارو دۆخی تۆ دەکەین

**هێلن** وەکو ئەوە کە ڕقی لێ داگرتبێ گوتی

- ئەگەر پەیوەندی بە دکتۆر **کارلەوە** بکەم چ دەبێ ؟

- کاتت بۆ دیاری دەکات بەو شێوەیەی کە بتەوێت

- ئەوەیان دەبێ

- بەشێوەیەکی ئاسایی کاتی چاوپێ کەوتن لە دوای سێ ڕۆژە

- ئەمەش وایە !

- هەرکاتێ دکتۆر کاتەکەی دیاری کرد شاری خام بەجێ دێلین و هەمان ڕێگەی چکسلۆڤاکی دەگرینە بەر

لەناکاو چاوەکانی **هێلن** واق وڕمان و دوو گەنجەکە بەبێ ئەوەی کەسەرنجی بدەنێ ، درێژەیان پێدا

- سەیارە تا شاری کلاتۆفی بەکرێ دەگرین بەهەمان شێوە کەلە مەوبەریش هەر خووت وابوو تاسەرچاوەی کانزایی یەکە بەکرێت دەگرت

- ئایا ئەمە ڕاستە ؟

- لەهەمان شوێن سەیارەیەکی تر لەچاوەڕوانیت دا دەبوو

- پاشان چی ؟

- وەك خوو و نەریت سەیارەکەی تۆ بۆ سەرچاوەی کانزایی یەکە نەدەبرا بەڵکو لە فرۆکەخانەی ( پراگ ) ەوە لێت دەداو لەوێ بەفرۆکەیەکی تر کە ئێوارەی هەمان ڕۆژ هەڵدەفڕی دەهاتیەوە قاهیرە

- ئەی کەی بۆ سەرچاوە کانزایی یەکە دەچین ؟

- کاتێ کەچاو پێ کەوتنی پزیشك زوو سەر بگرێ

هێلن وا گومان نابات ، چاوە پڕ لەپرسیارەکانی خۆی بڕیە گەنجەکە و درێژەی پێدا

- کاکە چ لەبارەی ژیانی منەوە دەزانی ؟

لاوەکە وەلامێکی بنەبڕی دایەوە

- خانم هەڤاڵ سمحون هەموو شتەکانی بۆ وڵات بەنرخ بوون

وەلامی گەنجەکەی زۆر بەلاوە گرنگ بوو ، بەشێوەیەك کەهەموو قسەیەکی بڕی ، کەمێك لەسەر کورسی یەکەی خۆی گۆڕکێ یەکی کردو کەوتەوە دوان ، جگە لەوە کەویستی بەپەنهانی بەر هەڵستی بکات دیسان گوتی :

- بۆچی دەبێ ئەو سەفەرە هێندە ئاڵۆز و بەگرفت بێ ؟

گەنجەکە وەلامی دایەوە

- لەبەر ئەوە کە نامەکەتان چاپ کرابوو

ماوەیەك بێ دەنگی باڵی کێشا ، گەنجەکە مەبەستەکەی خۆی بەدەنگێکی قایم و ڕاشکاوانە دەربڕی ، وەکو کەسێك کەبیەوێ قسەکانی وشە بەوشە دەربڕێ

- خانم سمحون جارێکی تر دڵنیا دەکەمەوە کەشاردنەوەی ناوەرۆکە نهێنی یەکەی باسەکە بۆ سەلامەتی خۆت و منداڵەکانت پێویستە

هێلن قسەکانی گەنجەکەی بەبێ دەنگی قبوڵ کرد  ئێستا لەوانەیە بۆ هەزارەمین جار لەخۆی بپرسێ

دوید کێ بووەو چی کردووە

بەهەرحاڵ هەستی دەکرد کەلە پێش بڕکێیەکی وەرزشی دا تێ شکاوەو دەیەوێ دەستی ئاشتی ڕکابەری بگرێ ، پاشان بەبەزەیی یەوە گوتی

بەهەمان شێوە کە ئەمرۆ بەتۆم گوت دەمەویست بیربکەمەوە کەدەبێ پشووی کۆتایی هەفتە لەشاری بێرمن دا بەسەربەرم

گەنجەکە پێکەنی و دانیشت چونکە دەی زانی کەهێلن گەیشتوّتە قوّناغی بەهەند وەرگرتنی بڕیارەکە

هێلن بە ویستێکی ڕەزامەندیەوە ڕای گەیاند

- بەس بۆچی ئەو چەند ڕۆژە لەقاهیرەدا بەسەر نەبەم ؟

هێلن لەکاتێکدا کەبە پێکەنینەوە ئەو قسەیەی کرد بەڵام گەنجەکە بەمەبەستی پۆزش هێنانەوە وەک نەریتێکی ڕۆژهەڵاتیانە سەری نەوازشی دانەواندو گوتی خانم سمحون ئێوە عادەتتان وابوو کەبۆ دیتنی خێزانتان بەفڕۆکە بە فرانکفۆرت دا بڕۆن و پاشان سەیارەیەکی کرێتان دەگرت تا بتان گەیەنێتە زێدی زگماکی خۆتان

هێلن لەکاتێکدا کە پێدەکەنی کردی بەهەرا

- ئەوە جێگای باوەڕ کردن نیە !

گەنجەکە لەکاتێکدا کەتا ئێرە متەقی لێوە نەبیسترا بوو بلیتێکی لەگیرفانی خۆی دەرێناو لێی نزیک کەوتەوە تا بیداتێ و درێژەی پێدا

- ئەمە بلیتی فڕۆکەیەکە کە بەشێوەیەکی ئاسایی نیوەڕۆیان بۆ فرانکفۆرت هەڵ دەفڕێ

هێلن بەشێوەیەک واقی وڕما بوو کەهەستی دەکرد هیچی بەویستی خۆی نیە بەسەر کەشی و شڵەژانەوە دەستی درێژکرد و بلیتەکەی وەرگرت

گەنجەکە پاشان لەگیرفانەکەی تر ، پاسپۆرتێکی سووری دەرێناو پێشکەشی هێلنی کرد ، ئەو پاسپۆرتە میسری بوو ، ئەویش پاسپۆرتەکەی لەدەستی گەنجەکە وەرگرت ، بەڵام دەت گوت لەجیهانی خەونەکان دا دەژیت .

گەنجەکە گوتی : هەروەک پێشبینی دەکرێت پاسپۆرتەکەتان سیاسی یە

هێلن لەکاتێکدا کە بزە بەسەر لێویەوە دیار بوو ، چاوە پڕ لە پرسیارەکانی خۆی بەلای ئەودا وەرچەرخاند

گەنجەکە درێژەی پێدا ئەوە پاسپۆرتێکە کەدەتوانیت پێی بچیتە چکسلۆڤاکیا و بۆ هەمان وڵات بگەڕێیتەوە

هێلن کەبەتەواوی خافڵابوو ، بەبێ ویستی خۆی پاسپۆرتەکەی وەرگرت و لێکی کردەوە و وێنەکەی خۆی لەوێدا دیت ، لەسەر کورسی یەکەی کەمێک وە جم و جوڵ

کەوت بەخۆدا چۆوە ، سیلە چاوێکی بڕیە گەنجەکە دیتی خەندەی لەسەر لێوە گەنجەکە لەکاتێکدا کەدەیەویست لەسەر کورسیەکە دابنیشێ گوتی

- ئەرێ بەڕاستی پاسپۆرتەکەی ئێوە ناوی میسری لەسەرە ؟

**هێلن** گەڕایەوەو چاوێکی بە پاسپۆرتەکەدا گێڕا ناوەکە بەپیتی عەرەبی و لاتینی نوسرا بوو ، پاشان بەدەنگێکی بەرز کەوتە سەر خوێندنەوەی لاپەڕەی یەکەم

- هێلانە ڕەئفەت ئەل هەجان !

گەنجە میسری یەکە هاواری کرد کە هێلانە ناوێکی پیرۆزی میسری یە

**هێلن** بەبارێکی گاڵتەجاڕیەوە گوتی

- وای بۆ ناچم کەشایانی ئەوە بوو بم !

گەنجەکە گوتی بەڵام ناوی عەرەبی تۆیە

**هێلن** گوتی

- ڕەئفەت ئەل هەجان یانی چی ؟

- تەنها ناوێکەو بەس

پێش ئەوەی کە **هێلن** بێتەوە سەر خۆی گەنجەکە درێژەی پێدا :

- لەو سەیارەیەی کەئێوە دەبات بۆ پراگ بلیتێک لەکۆمپانیای فرۆکەوانی چکسلۆڤاکیا وەرگرە ، **هێلن** قسەیەکی نەکرد ، وای هەست دەکرد کەچۆتە ناو خەوێکی قوڵەوە

بۆ گۆڕانکاری هێنان بەسەر ژیانی ئەودا نەک چاوەڕێی ئەو هۆکارە کت و پڕانە نەبوو بەڵکو بەخەیاڵیشی دانەدەهات ، بەڵام لەهەمان کات دا کەترس و بیم دای گرتبوو ، هەستی بەخۆشی یەک دەکرد

خۆی لەفیلمێکی پڕ لەکارەسات دا دەبینیەوە کەهەموو تواناکانی خۆی لە دەست دابێ ، بەڵام لەهەمان کاتیشدا لەناخەوە هەستی بە خوخدەو چێژێکی تایبەت دەکرد ، هەستی دەکرد کەکەسێک هەیە بۆ ڕێگەیەکی نادیار ڕێنمایی دەکات ، چ ڕێگەیەک ؟ چ هەڵدێرو پەشێویەک

بلیتەکەی لەگەنجەکە وەرگرت و بەبارێکی گاڵتەجاڕیەوە پرسی :

دەبینم کەهەتا وەختی دەرچوونیشی بەحەزی خۆی دیاری کردووە !

گەنجەکە گوتی

- نا ، بەهەڵە داچووی

**هێلن** برۆیەکانی بەترسەوە هەڵتەکاندن ، گەنجەکە درێژەی پێدا

- بلیتەکە بەرواری لەسەر نیە ، تەنها شتێک کەئێمە دەمانەوێ ئەوەیە کە لەپێش سەفەرتان ئێمە ئاگادارکەنەوە تا هەمیشە لەگەڵتاندا بین و بتوانین پێشوازیتان لێ بکەین

لەو ساتەدا خانم **هێلن سمعون** هەستی کرد کە قۆناغەکانی ترسان و دڵەڕاوکێ بەسەر چوون .

یەکسەر بێ دوواکەوتن گوتی

- سبەینێ گونجاوە ؟ !

گەنجەکە گوتی

هەرکاتێ کەبتەوێت ، بەوپەڕی تاسەوە ئامادەم

- بەڵام بڕیارەکەی ئێمەش سبەینێ بوو

یەکسەر دوو گەنجەکە هەستان تا بڕۆن

لەڕاستی دا کاتێ **هێلن** قسەی کۆتای خۆی کرد نەی دەویست ئەو دیدارە کۆتایی پێ بێ لەبەر ئەوە پرسی

- لەبارەی نهێنی بوونی باسەکە نەت گوت هیچی پەیوەندی بە منەوە دەبێ ؟

گەنجەکە پێ کەنی و گوتی :

- هەرگیز هیچ شتێ جگە

**هێلن** لەکاتێکدا کە پێ دەکەنی درێژەی پێدا

- جگە لە چی ؟

- جگە لە چاویلکەیەکی شەمسی لەجۆری ئەو چاویلکانەی کەهیچ کات عادەتت وانەبوو بەکاری بێنی ، لەجۆری هەمان ئەو چاویلکانەی کەئەمرۆ ناحەز و قێزەونن

**هێلن** لەکاتێکدا کە پێکەنینی دەهات دەیەویست شتێک بڵێ ، بەڵام گەنجەکە زیاتر بۆی ڕوون کردەوە

- بەمەرجێک لەچاوی مەکە تەنها ئەوکاتە نەبێ کەسواری فڕۆکە دەبیت ئەویش کاتێک لەپراگەوە دەچیت بۆ قاهیرە

هێلن ئێستا لەبەردەم ئەو دوو گەنجە دا ڕاوەستاوە و دەیەوێ تین و تاوی گەرمای ئەو ڕۆژە بێنێتەوە بیر خۆی کەلەگەڵ دوید دا یەکتریان ناسی ، پێکەنی و دەستی خۆی بۆ لایان درێژ کردو گوتی

- زۆر بەدیتنتان خۆشحاڵ بووم

دوو گەنجەکە ماڵەکەیان بەجێ هێشت و هێلن سمحونیش لەپشت شووشەی پەنجەرەوە دیقەتی لە دوورکەوتنەوەی سەیارەکەیان دەگرت ، هەوا ئیتر بەتەواوی تاریک داهات ، بەڵام هەیوانی ماڵەکە ڕووناك بوو ، گڵۆپەکانی یەك لە دوای یەك کوژاندنەوەو پاشان دەرگای ماڵەوەی قفڵ داو گەڕایەوە تا پاشماوەی گڵۆپەکان بکوژێنێتەوە ، هێلن لەماڵەوەدا بەتەنێ بوو ، چ جای ئەوە کە هەوای ماڵەوە گەرم بوو ، موچڕکی سارد بەلەشی دا دەهاتن ، ئێستا هەر خۆی بوو کەبڕیاری لەسەر بلێتی فڕۆکە و پاسپۆرت و دوو نیوە باقە ١٠ مارکیەکەی سەر مێزەکە دەدا

وەبیری خۆی دەهێنایەوە کەدەبێ بۆ دابین کردنی دەست پێشخەریەکانی سەفەر بۆ چەند جێگایەك تەلەفۆن بکات ، لەکاتێکدا کەبە پلیکانەکاندا هەڵدەگەڕا لەپڕ لەخۆی پرسی

- خوایە ! دەبێ چ ڕوو بدات بۆچی بۆ سەفەرەکە ڕازی بوو و خۆی خستە مەترسیەوە ؟ ! دوید شارل سمحون کێ یە ؟ کوێندەریە ؟ میسری یە یان ئیسرائیلی ؟ سیخوڕە یان قارەمان ؟ ! بەڵام بڕیاری دا کە لەم بارەوە بیرنەکاتەوە و تەنها بەدوای ڕاستی دا بگەڕێت

- بەڵام ڕۆژێك

# بەشی سێ یەم

## سەفەرێکی نهێنی بۆ قاهیرە

ئەو شتەی کە ڕووی دەدا بۆ دنیایەک کە هێلن سمحون زیاتر لە ٤٠ ساڵ تەمەنی تێدا بەسەر برد بوو هێشتا بەبیری ئەودا نەهاتبوو

هەندێک جار واگومانی دەبرد کەوڕێنە دەکات یان خەو دەبینێ و هەندێک جاریش وا هەستی دەکرد کەرۆلێکی گرنگ دەبینێ لەفیلمێکی پڕ لەتراژیدیاو کارەسات دا ، بەلاَم دنیای ئەو چەندەها میل لە فیلم و داستانی خەیاڵی دوور بوو

ئەوە دوید سمحون بوو کە ئەوی بۆ ئەو جیهانە ئەفسوناویە جادوگەرە بەهەموو ڕەنگ و شێوەکانیەوە پەل کێش کردبوو

دوید کەسێکی هەست بزوێن و خوێن گەرم بوو ، پوختەیەک بوو لەسۆزو بەزەیی ، ئەو لەهەموو ژیانی دا هەروا بوو ، دەریایەک بوو لە دڵنەرمی و خۆشەویستی کە بۆ لای هێلن دەخرۆشا ، دوید هەموو شتێکی ئەو بوو

جارێک هێلن لێی پرسی  بۆچی بەدرێژایی ساڵ پەیوەندیت لەگەڵ کەسێک دا پەیدا نەکرد ؟

گوتی : توانام نەبوو

ڕۆژێک هێلن بەگاڵتە قژی ڕاکێشا  لەو هەموو قارەمان بازیە دەست وەکێشە چونکە تێ کۆشان و شەرەنگێزیت بۆ بەرگری لەکیانی هاولاَتی بوونت بۆ گەلی جوولەکە لە فەلەستین ، لە عیشق و هاوسەرگیریەکەت کەم دەکاتەوە

دوید بەتوندی قسەکانی بەرپەرچ دایەوە

- نا  بەو شێوەیە نیە

ئەوە لەو ساتە دەگمەنانە بوو کە دوید تورە دەبوو هێلن هەستی کرد بەبی ئەوەی کەبە ئەنقەست بی دویدی ئازار داوە ، ویستی پۆزش بێنێتەوە بەلاّم دوید بەزەردەخەنەیەکی جوان و دڵنەرمانە بەرپەرچی دایەوە

- بەلاّم ڕۆژێک دێ تێ بگەم بەلاّم ڕۆژێک

ئایا ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە هەموو شتێک تێ بگات ، ئایا دوید توانیبووی لەحاست خواستەکانی ئەودا بوو بێ و بەشێوەیەک مامەڵەی لەگەڵدا کردبێ کە ژیانی پڕکردبێ لە بەختەوەری ، بەلاّم سەیرەکە لەوە دابوو کەهێشتا هێلن لەناو شەپۆلە بێ ڕەزاکانی ژیان دا خۆی لەتەک دویدی مردوودا دەبینیەوە

خانم هێلن سمحون نەی دەتوانی قاهیرە لە بەرزیەوە ببینێ چونکە فڕۆکەکە لەدوای ڕۆژئاوا بوون دەگەیشتە وێ لەکاتێکدا کە هەورەکان ئاسمانی شاریان بەتەواوی داپۆشی بوو پلەی گەرمیش هەروەک بەشی بەرپرسی کەش و هەوای ناو فڕۆکەکە ڕای دەگەیاند ٩ پلەی سانتی گراد بوو ، فڕۆکەوان هەورە ڕاپازندراوو گووشراوەکانی دەدیتن ، دڵۆپە بارانەکان لەژێر ڕوناکی گڵۆپەکانی فڕۆکەکەدا دەدرەوشانەوە ، ئەو ڕوناکی یە شاری قاهیرە بوو کەلەژێر بارانی ئەفسوناوی دا خۆی دەنواند ، هێلن ڕۆژێک لە دویدی پرسی بوو کام شارەت زیاتر پێ خۆشە ؟ دوید بەبێ هیچ گومان و دڵەڕاوکێ یەک بەدەنگی بەرز گووتبووی قاهیرە چونکە هیچ شارێک ناتوانێ لەجوانی دا شانی لە شانی بدات

لەو ساتەدا کە گەشتیارانی — دوێنێ نیوەڕۆ — وەڕێ کەوتبوون و چاوەڕوانی دەکردن کە بەدوایدا بێن و سۆراغی هەڵگرن و لێرەوە لەگەڵیان دا بڕوات ، بەلاّم ئەو چاوەڕوانیە بێ هودە بوو

لەبەر خۆیەوە گوتی ئەگەر ئەوان ببینم خۆم واپیشان دەدەم کە نایان ناسم بەلاّم ئەوان هەتا سەر نەگەڕانەوە

ئێوارەی دوێنێ پێش ئەوەی کە بۆ ژووری خەوتن بڕوات تەلەفۆنی بۆ بەڕێوەبەری نوسینگەی کۆمپانیاکەی کردو پێی گوت سبەینێ بۆ دیتنی خێزانەکەم بەرەو خام هەڵدەفڕم ، هەروەها هەمان قسەی بە ئولجا ی قەرەواش و فرانتسی پیریش گوتەوە ، بڕیاری دا هیچ کەس مافی پەیوەندی پێوەکردنی نەبێ لەگەڵیدا هەرچەندە کارەکە زۆریش گرنگ بێ بۆ ئەوەی کە کەس نەزانێ کە چووە بۆ شاری

خام ، کاتی چۆ ناو فڕۆکەخانەی هامبۆرگ یەکەمین کارێک کە ئەنجامی دا کڕینی چاویلکەیەکی شەمسی بوو کە هەر لەخەڵکی نامۆو گاڵتەجاڕ دەچوو پاشان لەسەر قسەی دوو گەنجە میسری یەکە جل و بەرگێکی ئاڵ و والآی کڕی

لەپێش ئەوەی سواری فڕۆکەیەک بێ کەلە پڕاگەوە بۆ قاهیرە دەچوو چاویلکە شەمسیەکەی خۆی بەعەرزی داداو کاتێ لەئاوێنەوە تەماشای دەکرد ، لەناخەوە پێ دەکەنی بیچمێکی زۆر نامۆو سەیری هەبوو بەشێوەیەک کە دیبات نەت دەناسیەوە

کاتێ سواری فڕۆکە بوو کورسی یەکانی ڕیزی پێشەوە ، لە گەشتیاران چوڵ بوون جگە لە کەسێک نەبێ کە سەر گەرمی خوێندنەوە بوو ، پیاوەکە بەدرێژایی ڕێگا شتی بیری خۆی دەخستەوە جار جارە باوێشکێکی دەهاتێ ،پیاوە نامۆکە بەهێلنی دەگوت کە لەبەر ئاو دەنگی ئەو لەپەنای دانیشتووە

سەرەنجام فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی قاهیرە نیشتەوە هێشتا باران هەر دەباری ، هێلن بۆ لای دەرگا کراوەکە ڕۆیشت و ماڵ ئاوایی لەمیواندارانی فڕۆکەکە کرد ، یەکێک لە گەشتیاران ڕێگەی بۆ کردەوە ، لەناو فڕۆکەکەدا ئەو دوو میوانە چاودێریان دەکرد ، میکدۆباس ی سەر بەکۆمپانیای فڕۆکەوانی میسر لەڕیزی پێشەوە بوو هێلن هەرچەندە لەدەورو بەری خۆی ڕوانی ئەو پێشوازی کەرانەی کەدوێنێ گەنجە میسری یەکان باسیان دەکرد نەدی ، ساتێک لەبەرخۆیەوە کەوتە بیرکردنەوە لەوانەیە میسری یەکان هاتبن و لەبیریان چوو بێ ، ئێستا چ بکات ؟

کەسێک لەپاسی پێشوازیدا دەستی درێژکرد تا یارمەتی بدات بۆ سوار بوون هەر ئەو کەسەی کەلە فڕۆکەکەدا لەگەڵی دا بوو لە پشت سەریەوە قیت بۆوە ، ماندوویی و شەکەتی پێوە دیار نەبوو دەرگای پاسەکە داخراو لەسەر ئەرزە تەڕکراوەکەی فڕۆکەخانە بەهێواشی لەفڕۆکەکە دوور دەکەوتەوە هێشتا چەند مەترێک دوور نەکەوتبۆوە کەهەمان ئەو پیاوەی کە بەدرێژایی سەفەرکە بەبی خەمی لەپەنای دانیشتبوو هاتە لای هێلن

- خانم سمحون بەخێرهاتی بۆ قاهیرە

خانم سمحون بەخۆشحاڵیەوە گوتی

- ئەوەی پێش بینیم دەکرد پێش بینیەکەم هاتە دی

پیاوەکە گوتی

- پێویستە خۆمت پێ بناسێنم

- سوپاست دەکەم

- من ، **حسێن شوکریم** لە ڕێکخراوی گشتی میسر

ئەو بەزمانی ئینگلیزی قسەی دەکرد ، زمانەکەی ڕەوان و پاراو بوو

**هێلن** بەشادمانیەوە گوتی بەدرێژایی ڕێگا هەستم دەکرد کەتۆ لەبەر خاتری من لە فرۆکە دایت

- وایە ، ئێمە بە هۆشیاریەوە ئاگاداری هەموو شتێک بووین

سەیارەکە لەباڵەخانەی بنەڕەتی فرۆکەخانە دوورکەوتبۆوە ، بەڵام گلۆپەکانی فرۆکەخانە هەموو شوێنێکیان لە ڕووناکی خۆیاندا نقوم کردبوو

لەناکاو ڕوخساری هاو سەفەرەکەی گەشایەوە پیاوەکە لە شوێنی خۆی جووڵەیەکی کردو زۆر بوێرانە گوتی

- پێم خۆشە کە گەلی میسر فەرو پێ بەخێریەکەت لەدەمی تۆوە ببیستن

**هێلن** بەخۆشحاڵیەوە گوتی :

ئەی خۆزگە دەم توانی سوپاسی گەلی میسر بکەم بەهۆی میوانداری و دڵنەوایی و ئەو پێشوازیە گەرمەیان

کات زۆر لەبەر دەست دا نەبوو تا گفت و گۆی خۆیان درێژکەنەوە ، دوای کەمێک سەیارەکە لەشوێنێک کەبە لای ئەمەوە نامۆ بوو ڕاوەستا

**هێلن** خۆی لە شوێنێکی نیوە تاریک و دوور لە باڵەخانەی بنەڕەتی فرۆکەخانەکەدا دیتەوە ، هەر کە پاسەکە ڕاوەستا ، **حسێن شوکری** بەسەیارەیەکی ڕەشی گرانبەها کە دروست کراوی ئەڵمانیا بوو ، لە گۆشەیەک ڕای گرت و بەئاماژەوە گوتی:

- فەرموون خانم **سمحون**

**هێلن** لەو شوێنە تاریکەدا هێندە دەترسا بەڵام هەراسانیی خۆی ئاشکرا نەدەکرد ، لە دوای ساتێک لێخوڕی سەیارە ڕەشەکە هاتە لای ، لێخوڕەکە بریسکە بریسکی بارانی بەسەر لەشیەوە دیار بوو ، چەتری لەسەر سەری **هێلن** هەڵدا تاوەختی سورابوون ڕێنوێنی کرد **هێلن** لە دوای سواربوون لەناکاو گوتی

- ئەدی جانتاکەم کوا ؟

هێشتا قسەکەی تەواو نەکرد بوو کە وەڵامەکەی بیست

- نیگەران مەبە ، خانم **سمحون**

**هێلن سمحون** شەوی لە یەکێك لە شوقە جوانەکانی ناوچەی پیشەسازی ( میسری تازە ) بەسەر برد ، لەکاتێکدا کە پێی نایە ناو شوقەکە ، میوانداری خانە خوێکانی بەچاکی هەست پێ دەکرد ، کچە خانە خوێکە لێی پرسی ئایا شتێکی تایبەتت پێویست نیە ؟

**هێلن** سوپاسی کردو گوتی :

- نەخێر ، تەنها ئێوارە خوانێکی سادە ، چونکە بابزانم سبەینێ چ ڕوو دەدات

خانم **سمحون** ویستی بەو قسانە سەرە داوێك لەبەرنامەی سبەینێ هەڵ کات ، بەڵام خانە خوێکە قسەکەی لێ وەرنەگرت و تەنها خەندەیەکی هاتێ و گوتی :

- ئەگەر پێویستت بە شتێك هەیە ، ئاسایی یە کە بیڵێیت

پاشان ماڵ ئاوایی لێ کردو ڕۆیشت و لەهەمان کات دا باولیە بچکۆلەکەی **هێلنیان** هێنا

ئەو شوقەیەی کە خانم **سمحون** لێی داکوتا بوو بەڕادەیەك جوان و ڕازاوە بوو کە مرۆڤ هەر لەخۆیەوە هەستی بەئارامی و حەسانەوە دەکرد .

لە دوای خواردنی نانی ئێوارە **عەزیزە** ، کچی خانە خوێکە بەدەم و چاوێکی گەشی ڕۆژهەڵات ئاسایی و چاوە گەورەکانی ، هاتە لای و پرسی

- ئایا پێت خۆشە تەماشای تەلەفزیۆن بکەی ؟

**هێلن** لەبەرنامەکانی تەلەفزیۆنی پرسی کچە میسری یەکە لەکاتێکدا کەسەیری سەعاتەکەی دەکرد گوتی :

- ئێستا سەعات ١١ ی شەوە ، شتێکی وای بۆ بڕانی بەرنامەکان نەماوە جگە لە فلیمی دوا بەرنامەی شەو ، **هێلن** لە بابەتی فلیمەکەی پرسی :

- **عەزیزە** گوتی بابەتی فلیمەکە دەربارەی کچێکی میسری یە کەلە پێش جەنگی ساڵی ٧٣ سیخوڕی بۆ ئیسرائیلیەکان کردووە ، ناوی فلیمەکەش « سەرکەوتن بەلای دۆزەخ دا » یە

**هێلن** ئامادە نەبوو کە تەماشای فلیمەکە بکات بەلام ناونیشانە هەستیارەکە سەرنجی بەلای خۆیدا ڕاکێشا ، پاشان واتاکەی لە **عەزیزە** پرسی ، **عەزیزە** گوتی خانم ئەگەر بیبینی واتاکەت بەتەواوی بۆ دەردەکەوێ

**عەزیزە** بەچاکی بەزمانی ئەڵمانی دەدوا ، بەشێوەیەک کە **هێلن** زۆر سەری لێ سوڕمابوو ، بەلام کاتێ کەزانی **عەزیزە** لەقۆناغی منداڵی لەقوتابخانەی ئەڵمانیەکان زمانی ئەڵمانی فێر بوو بوو سەرسامیەکەی نەما ، بەهەمان هۆ **عەزیزە** ئامادەیی خۆی دەربڕی تا دەمەقاڵەکانی فلیمەکەی بۆ وەرگێڕێ

بەم شێوەیە **هێلن** ئەو شەوە لەبەر تەماشاکردنی فلیمەکە دانیشت ، بەلام لەبەر خۆیەوە دەی پرسی

ئایا بەرێکەوت ئەو فلیمە پەخش دەکرێت ؟ ! بەلام ئەو ڕازەی **لەعەزیزە** پرسی

**هێلن** بەکچە میسری یە گەنجەکەی گوت :

- ئێوە ولاتی خۆتان زۆر خۆش دەوێ ؟

**عەزیزە** بەبێ تێ ڕامان وەلامی دایەوە

- بەڵێ چونکە لەرێگەی چەسپاندنی ئەو عیشقەدا ڕەنجێکی زۆرمان کێشاوە

بەیانی سبەینێ ئاسمانی قاهیرە بەتەواوی لەهەورەکانی دوێنێ پاک بوو بۆوەو ڕەنگی شینی ئاسمان زۆر تێرتر دەهاتە بەرچاو و هەتاو تینی سەند بوو ، بەم شێوەیە خانم **سمحون** پێشنیازی **عەزیزەی** بۆ خواردنی نانی بەیانی لەحەوشەی شوقەکە – کە باخچەیەکی بچکۆلانە بوو – قبوڵ کرد ،ئەگەرچی زستانی قاهیرە سارد بوو بەلام باخچەکە سەر سەوز دەهاتە بەرچاو ، هەروەها هەندێک لەگیاو گوڵی باخچەکە **هێلنیان** دەخستەوە یادی ئەو گیایانەی کە **دوید** زۆری حەز لێ دەکردن و لەباخچەی ماڵەکەی داڕواند بوونی

نانی بەیانی **هێلن** لەسەر خواستی خۆی بریتی بوو لەهێلکەی مریشک و پەنیرو مرەباو ئیستکانێک قاوەی گەرم و گوڕو بەتام

**عەزیزە** زۆر دڵنەرم بوو بەشێوەیەک **کەهێلن** هەستی بەدڵتەنگی نەدەکرد ، هەرکاتێ شتێکی دەویست دەست بەجێ بۆی پەیدا دەکرد

**هێلن** دەی زانی کەلە ئارامی و خەیاڵێکی ئاسودە دا دەژی شەوێکی ئارامی بەسەر بردو وەکو منداڵێکی تامەزرۆ چۆ ناو خەوێکی قووڵەوە ، بەلام ئەو زۆر پەلەی بوو تابزانێ هاوسەرەکەی کێ بووەو لەگەڵ کێ دا ژیاوە ، دەیەویست بزانێ **دوید شارل سمحون** کێ بووە ؟

- خانم **سمحون** : ئایا دیسان قاوەت دەوێ ؟

**هێلن** چاوی بڕیە **عەزیزەو** بەدڵنیایی یەوە گوتی :

- سوپاست دەکەم

**عەزیزە** بە فنجانێکی قاوەوە گەڕایەوە و گەنجەکە بەخێرایی مێزەکەی کۆکردەوە ، **هێلن** دیسان لەبەرخۆیەوە گوتی من لەگەڵ کێدا ژیاوم کە ئێستا بۆتە مایەی دڵنەوایی میسر ، چۆن نزیکی ٧ ساڵ لەگەڵیدا ژیاوم و دوو منداڵم لێی هەیە بەبێ ئەوەی کەڕۆژێک لەڕۆژان کەسایەتی ڕاستەقینەی ئەوم زانیبێ ؟

یەکەمین دیداری **هێلن** لەگەڵ **دوید شارل سمحون** دا خوانی ئێوارەیەک بوو کە بۆ پیرۆزی ئەو لەتەل ئەبیب ڕێک خرابوو ، لەو کاتەدا **هێلن** بۆ بەستنی گرێ بەستی ئاسایی بەشداری تێدا کردبوو کە لەگەڵ هەندێک لە وڵاتانی جیهان بەسترا بوو لەئیسرائیل ، ئێوارەی هەمان ڕۆژ کاتێ کە **دویدیان** پێ ناساند ، یەکەم دیداری بەلاوە سەیر بوو ، یەکەمین جار بوو کەئەوی دەدی ، هەستی دەکرد کە **دوید** لەناخەوە تەماشای دەکات ، سەرەتا وا گومانی برد کە کەسایەتیەکی بەرجەستەیەو لەهەمان کاتیشدا کەسێکی گاڵتەجارە بۆیە ڕقی لێ هەستا ، بەلام کاتێ کە گفت و گۆی لەگەڵدا کرد سەبارەت بەگرێ بەستی مامەڵە ، زۆر سەری لێ سوڕما ، یەکەمین شت کە سەرسامیەکەی هەلایساند ئەوە بوو **کەدوید** هەموو وردەکاریەکانی نهێنی کارەکەی دەزانی

**دوید** لەهەمان شەودا **بەهێلنی** گوت هەوڵ بدە جگە لە گەشتیاری ، کاری تریش تاقی بکەینەوە ، **هێلن** نیازی وابوو کەجارێکی تریش چاوی پێ بکەوێتەوە چونکە **دوید** سەرنجی تەواوی ڕاکێشا بوو هەر لەبەرئەوە **هێلن** لەخۆڕا ڕەزامەندی بۆ دیداری سبەینێ ڕاگەیاند

ئەوان دەیان زانی کە چۆن لەگەڵ یەکتردا وت و وێژ بکەن و چۆن دەردە دڵی خۆیان دەربڕن هەروەها چۆن باسەکان بتوێژنەوەو چۆن سەرەنجامی باس و گفت و گۆکان بۆ بنیات نانی کۆمپانیایەک وەرێ بخەن و بیرو ڕایانی لەسەر ئاڵ و گۆڕ بکەن

**هێلن** لەبەر خۆیەوە دەی گوت بۆچی **دوید شارل سمحون** ، پیاوی بازرگانی ئیسرائیل ، ئەو پیاوە بەناوبانگ و ڕەمزیە لەگەڵ هەر کەسێکدا دیدار بکات دەبێتە مایەی متمانەو پشت پێ بەستن ؟ لەڕاستی دا هەوڵی دا دەیەها پرسیار بوروژێنێ تا وەڵامێک بەدەست بێنێ ئەوەش چ لەپێش هاوسەرێتی و چ لە دوای ، بەڵام هەتا سەرە داوێکیشی دەست نەکەوت ، چونکە شەپۆلەکانی گۆڕانکاری تواناکانی لەدەست دەدا ، شتێکی لەبارەوە نەزانی جگە لەمە کەئەو کەسێکی لاوازە بەڵام تەلەسمی هەیە ، ئەو لەڕفاندنی دڵان و ڕازی کردنی لایەنی بەرانبەردا توانایەکی لەڕادە بەدەری هەیە ، ئەو شتەی زیاتر گڕی سەرسامی **هێلنی** هەڵدایساند ئەوە بوو کە ئەو هەتا لە وردەکاریە بێ نرخەکانیشدا نەدەسڵەمینەوە

**هێلن** بەبێ لایەنگری و ڕەگەز پەرستی دەی زانی هەروەک چۆن بەریتانیەکان بەخوێن ساردی بەناوبانگن ، جولەکەکانیش ئاوا بەڕژدی و چاوچنۆکی بەناوبانگن و جوولەکە لە هەموو کات و ساتێکدا هەروان ، بەڵام **دوید** وانە بوو ، **هێلن** دووارۆژەکانی نیشتەجێ بوونی خۆی لە تەل ئەبیب بەسەر برد لەکاتێکدا کە چەندەها ڕۆژ چاویان بەیەکتری دەکەوت ، سەرەنجام مەسەلەی گرێ بەستی بڕیاری کۆمپانیاکەشیان کۆتایی هات هەستی دەکرد کە شتێکی گەورەتر لەیەک مامەڵە بەیەکتری یەوە بەستوونەتەوە ! سەرەنجام ڕۆژەکانی مانەوەی لە ئیسرائیل دا کۆتایی پێ هات و **دوید** بەسەیارەکەی خۆی بۆ فڕۆکەخانەی برد تا دواماڵ ئاوایی لە**هێلن** بکات

لەبەر ئەوەی کە دوید و هێلن دیداری زۆریان بۆ دەرەخسا تا وای لێ هات بەڕێکەوت گەشتێکیان بۆ شاری قودس کرد ، واش هیچ نیشانەیەکی هۆگر بوون لە نێوانیان دا هەست پێ نەدەکرا ، بەڵام لەفڕۆکەخانە لەپێش ئەوەی کە **هێلن** بۆ لای فڕۆکەکە بڕوات ، لەناکاو **دوید** گوتی دووری تۆ لە توانای من دا نیە

**هێلن** هیچی پی نەگوت بەڵام بەنیو نیگایەک دڵی ڕفاند و سەرنجی بەدوای خۆیدا ڕاکێشا بەپەلە بۆ لای فڕۆکەکە ڕۆیشت بەڵام سەیرەکە لەوە دابوو کە **هێلنیش** هەمان هەستی بۆ پەیدا بوو

هەستێکی شاراوە ئەویان بۆ لای ئەو دوو پیاوە لەڕو باڵابەرزە ڕادەکێشا ، هێلن وای دەزانی کە بەسەر پەتێکی باریکەوە یاری دەکات .

بەهەمان شێوە کەلە تەل ئەبیب ڕووی دا بەڵگەنامەکانی کۆمپانیا دەبوا لە هامبۆرگ بکرێن ، هێلن لە دوای دەست پێشخەریەکان ویستی بروسکە بۆ دوید بکات تا بێتە ئەڵمانیا بۆ ئەوەی کۆمپانیا بە گورج و گۆڵی دەست بەکار بێ ، هێلن لەسەرەتا دا وای بۆ دەچوو کەئەو کارانە ( لەوانە تۆمارکردنی کۆمپانیاو ) یەک هەفتە تا ١٠ ڕۆژ بخایەنێ بەڵام بەرێکەوت ، هەموو دەست پێش خەریەکانی کارەکە لەماوەی ٣ ڕۆژدا ئەنجام دران بۆیە بروسکەی بۆ دوید نەکرد پێویستی بەچەند ڕۆژێک هەبوو تا لەو هەستە سەیرەی کە شەوو ڕۆژ گیانی داگرتبوو قوتار بێ سەرقاڵی کارەکەی دەبۆوە خۆی بەڕۆیشتن بۆ سەر شانۆو خواردنی نانی ئێوارە لەدەرەوەی ماڵ سەر گەرم دەکرد ، لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەڕۆیشت ، بەڵام شەوان کە ناچار دەبوو دەبوا پشوو بدات وەکو منداڵ دەوەژناو خەونی بە سەفەرەوە دەدی

بەیانیەک جارێکیان کەسێک بروسکەی بۆ کرد تا لەهەمان ڕۆژدا سواری فڕۆکە بێ و بەرەو ئەڵمانیا هەڵفڕێ دوید هەر کە ئەوی دیت حەپەساو گوتی :

- من پێویستم بەکەسێکە کە بۆ نانی ئێوارە بانگهێشتمان بکات

هێلن بۆ نانی ئێوارە بانگهێشتی کرد ، بەڵام نەی دەزانی کە بۆچی دەبێ لەگەڵ هەستی خۆیدا بجەنگێ .

ئایا چۆن جوولەکەیە ؟ چۆن ئیسرائیلی یە ؟ چۆن ڕۆژهەڵاتیە ؟ یان ئەوە کە بەچ بەڵگەیەک لەدوای مردن خێزانیشی هەروا بەتەنهایی ڕاهاتووە لەو شەوەدا لێی پرسی

- دوید تۆ کێی ؟

- کەشتیوانی کەشتیەک کە بەدوای لێواردا دەگەڕێ

دوید کاتێ کە هێلنی بەسەیارەی خۆی گەیاندەوە ماڵ ، پێش ئەوەی کەلە سەیارەکە دابەزێ گوتی :

- هێلن !

هێلن ئاوڕی دایەوەو واقی وڕما ، وای دەزانی لەدەست شتێکی شاراوە ئازار دەچێژێ ، بەڵام دوید دەست بەجێ گوتی

- لەو دواییانەدا زۆر بیر لە ژن هێنان دەکەمەوە

**هێلن** بەگاڵتەوە گوتی :

- ئەدی بۆچی نەت هێنا ؟

- لەڕاستی دا نەگەیشتوومەتە حەزی خۆم

- ئەدی ئێستا ؟

**دوید** قاقایەکی کێشا کە **هێلنی** شەرمەزار کرد

**دوید** درێژەی پێدا : وابیر دەکەمەوە بەبێ تۆ نەتوانم بژیم .

**هێلن** لەکاتێکدا کە دەستی بەچاوانەوە گرتبوو گوتی :

- تۆ لەسەر پێشنیازەکەی خۆت سووری ؟ !

- دەمەوێ لەگەڵ تۆدا پەیمانی هاوسەرگیری بەستم

**هێلن** ڕەزامەندی خۆی دەربڕی

پاشان هەردووکیان بەئارامی تێر تێر گریان

**هێلن** ڕاوێژی کرد

- ئەگەر ببین بەهاوسەری یەکدی کاری کۆمپانیاکە درێژەی دەبێ و ئێمەش هەر کامێکمان لە ولاتی خۆمان ژیان بەسەر دەبەین

**دوید** قسەکەی بڕی و گوتی :

- ئایا قازانجی تۆو بەرژەوەندی کۆمپانیاکە نیە کەبیگوازینەوە بۆ ئیسرائیل !

- نا ئازیزم ، ئەوە مەحاڵە

- بەدڵنیایی یەوە دەزانم

**هێلن** تەماشای کردو لەکاتێکدا کەبارو دۆخەکە وردە وردە دەگۆڕا ئاوڕێکی دایەوەو لەسەر خۆ گوتی

- دەتەوێ چ بڵێی ؟

- دەمەوێ بڵێم کەلە هەموو شتێک ماندو و بێزارم .

- تێ ناگەم !

- دەمەوێ هەرچی حساب هەیە لەتەل ئەبیب تاو توێی بکەم و لەو دوایی یەدا ژیانێک لەگەڵ تۆدا بەسەر بەرم ، هەر کاتێ لەئەڵمانیاش نیشتەجێ بووم ، پێکەوە دەبین و بەم شێوەیە ٦ مانگیان بەڕێ کرد

**هێلن** یەکەم جار وای لێک دایەوە کە لەمەودوا دڵەڕاوکێ و دوو دڵی نامێنی بەڵام وا دەرنەچوو ، ئەوان هەموو شەوێ پێکەوە بە تەلەفۆن قسەیان دەکرد و بەگشتی بۆ خولەکێک مامەڵە چەندەها سەعات دەردەدڵی خۆیان دەنێودا دەکرد   شەوێک **دوید** بەگاڵتەوە گوتی   وا بڕوات قەلاش دەبین

- **هێلن** بەو قسەیە زۆر دڵتەنگ بوو و گوتی

- چۆن ؟ !

**دوید** قاقا پێکەنی و گوتی :

- ئایا دەزانی کە ئەمڕۆ چەندەم پارەی تەلەفۆن هاتۆتە سەرێ ؟

**هێلنیش** لەناخی دڵەوە پێکەنی ، **دوید** درێژەی پێدا

- خانمی ئازیز ، دەڵێی لەبیرت چووە کە من جوولەکەم

شەوێک زەنگی تەلەفۆن لێی دا ، **دیوید** دەیەویست قسە لەگەڵ شاری ڕۆم دا بکات ... **هێلن** پێی گوت

خۆ سەفەری ئەڵمانیات لەبیر نەچۆتەوە ؟

بەڵام **دوید** لەبەر سەرقاڵی خۆی پۆزشی هێنایەوە ، وەک ئەوە کە بۆ ئەو کارەی بەپەلە بێت ، بەڵام زەردەخەنە بەڕوویەوە دیار بوو **دوید** دووبارە گوتی

- بەو زووانە پەیمانی هاوسەرێتیمان تەواو دەکەین

**هێلن** چەندەها جار لەبەر خۆیەوە دەکەوتە بیر کردنەوە کەدەبێ چ ڕازێک حەشار درابێ   دەبێ مەبەستی **دوید** لەو قسەیەی چی بێ ؟

تا جارێک لە مایسی ١٩٧٥ کە **هێلن** لە نوسینگەی خۆی سەرقاڵی ئەنجام دانی کاربوو هەواڵیان پێدا بەڕێز **سمحون** لە دەرەوە چاوەڕێی تۆیە ! **هێلن** گوتی

- بەڕێز کێ ؟ !

- بەڕێز **سمحون** ، خانم !

کاتێ **دوید** چۆ ناو ژووری کاری **هێلن** ژنە لێی پرسی :

- مۆڵەتت وەرگرتووە ؟

**دوید** سەری بەمەبەستی نەخێر بۆ لەقاند ، پاشان لێی پرسی

- ئیشی تایبەتت هەبوو ؟ !

جارێکی تر **دوید** بە ئامازەی نەخێر سەری بۆ لەقاند ، **هێلن** قیژاندی

- ئەدی چ بووە ؟

**دوید** بەفایم گوتی

- هاوسەرگیری

سەعات لە ٨ ی بەیانی کەمێک لای دابوو ، **هێلن** هێشتا لە نهۆمی سەرەوەی شوقەکە کە باخچەیەکی خنجیلانە بوو ، دانیشتبوو ، دووەم ئیستکانی قاوەی بەهێمنی نۆش کرد تا ئەوە کە دیتی هەمان سەیارە ڕەشەکەی دروست کراوی ئەڵمانیا لەپەنایەک ڕاوەستاوە ، پاشان جم و جۆڵی **حسێن شوکری** کەلە سەیارەکە دابەزی و بەخێرایی چۆناو شووقەکە خستە ژێر سەرنجەوە **حسێن** بە دڵخۆش دەبینرا و بەسۆزێکەوە دەستی بۆ **هێلن** ڕاوەشاند کە گوایە دوو هاوەڵی کۆنن پاشان پلیکانەکانیان بڕی و سەلامی لێ کردو لەبەر دەمیدا وەستاو گوتی :

- ئایا دەتوانم فنجانێک قاوە لەخزمەتت دا بخۆمەوە ؟ ڕوو خۆشی و سۆزی **دیویدیش** ئاوا بوو ، بەبەزەیی ، سادەو بێ خەم ، **هێلن** ڕاستی گوتبوو کاتێ کە بەسەر **دوید** دا قیژاندبووی کە تۆ نە ئیسرائیلی نە جوولەکە پاشان پێکەنی گوایە کە نوکتەیەکی پێ گووتووە **حسێن شوکری** لە دوای ئەوە کە **عەزیزە** ئیستکانێک قاوەی لە پێش دانا لە **هێلنی** پرسی :

- دوێنێ شەوت چۆن گوزەراند سەرکار ( ملازم ) خانمی بەڕێز ؟

**هێلن** لەکاتێکدا کە خەندەی لەسەر لێو بوو گوتی :

دەتەوێ لەسەر میوانداری و ڕێزو نەریتی میسری یەکان قسە بکەم ؟

- ئەگەر خوا حەز بکات کاتێ بەتەواوی حەسایتەوە

هێلن زوو لەمەبەستەکەی حاڵی بوو و پاشان پرسی

- دەتوانم شتێک لەبەرنامەی ئەمڕۆمان بزانم ؟

- شتێک نیە جگە لە دیدار

- لەگەڵ کێ ؟

- لەگەڵ بەڕێوەبەری ئاسایشی میسر

- کەی ؟

- دوای نیو سەعات

لەکاتێکدا کە دەیەویست هەستێ گوتی :.بەس چاوەڕێی چین ؟

**حسێن شوکری** لەکاتێکدا کە ئاماژەی بە ئیستیکانە قاوەکەی خۆی دەکرد بەدڵ نەرمیەوە گوتی

- مۆڵەتم بدە با قاوەکەم بخۆمەوە

- بۆ کاتمان زۆرە ؟

**هێلن** ئێستا وەک منداڵێکی بەپەلەو بزۆز وابوو ... **حسێن** گوتی :

لەڕاستی دا نا ! بەڵام نۆرەی مۆڵەتەکە گەیشتووە ، پاشان لەکاتێکدا کەلە شوێنی خۆی هەڵدەستا دوا قومی قاوەکەی بەخێرایی فڕ کرد

سەیارە ڕەشەکەی هەڵگری **هێلن** جادەکانی قاهیرەی دەبڕی ، شاری قاهیرە لە ژێر ڕوناکی خۆردا کز دەهاتە بەرچاو وەک ئەوە کە بەئاوی باران شۆردرابێتەوە

شووشەکانی سەیارەکە لە جامی تاریک بوون ، بەشێوەیەک کە **هێلن** دەرەوەی بەتەواوی دەدی ، بەڵام گەشتیاران سەر نشینانی سەیارەکەیان نەدەدی ، **هێلن** هێشتا هەروا خۆی داوەتە دەستی قەدەرو چارەنوس ، لەبەر خۆیەوە بیری دەکردەوە بۆ نەی درکێنم ؟ ئەدی ئەوە نیە کە **دوید** لەو شارەدا لە دایک بووە ، **هێلن** لەمەوبەر داوای لێ کردبوون کە حەز دەکات ئەو ماڵەی کە **دوید** تێیدا ژیاوە ببینێ و دەی زانی کە بەبێ دوو دڵی ڕازی دەبێ ، **هێلن** سوپاسی گەرمی هاوڕێکانی خۆی کرد ، لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٦ یەکەم منداڵی کەبووی یوسف بوو **دوید** لەڕادەبەدەر خۆشحاڵ و بەختەوەر بوو و **هێلن** تا لە خەویش دا نەی دەدی کە ڕۆژێک منداڵی دەبێ ، لەبەر ئەوە خۆی بۆ بەدایک بوون ئامادە نەکردبوو ، دوو ساڵی دوواتر **هێلن** دووەمین منداڵی تریشی بوو و **دویدی** خۆشحاڵ تر کردو ناوی **سولەیمان** یان لێ نا ، ٧ ساڵ بەسەر ئاشنایەتی ئەوان دا تا ئەمڕۆکە **دوید** ئەوی بە دوو منداڵەوە بەجێ هێشتبوو ، تێ دەپەڕی ، **دوید** لەکارە بازرگانیەکاندا سودێکی زۆری بۆ بەجێ هێشتبوون ئەوە جگە لەسامانێک کە هەمیشە لەزیاد بوون دابوو

ڕۆژێک **دوید** کت و پڕ نەخۆش کەوت بەبێ ئەوەی کە ڕابردوویەکی لەم بارەوە هەبووبێ یان لەمەوبەر هەستی بەئازارێک کردبێ نەخۆشیەکەی ئەو لەسەرەتادا گرنگ نەبوو بەڵام بەخێرایی پەرەی سەندو وردە وردە وەک خۆرکە کەوتە گیانی نەخۆشیە سەختەکەیان زۆر درەنگ دۆزیەوە ، ئێستا **دوید** سات لە دوای سات لە مردن نزیک دەکەوێتەوە ، بەڵام **دویدیش** قەت بێ ئومێد نەدەبوو

سەرەڕای ئەوەش کە نەخۆشیەکە ئازاری دەدا هیچ کات خەندە سەر لێوی بەرنە دەدا باشترین پزیشکی دنیای بە دیارەوە بوو بەڵام نەخۆشیە شپرزەکەرەکەی ئەو وەکو هەزار پێ چرنوکی لەلەشی گیر دەکرد

لە دوایین شەودا بۆ **هێلن** بەتەواوی ڕوون بۆوە کە **دوید** دەمرێ زۆر لەڕو بێ توانا بوو بوو ، ئێستا **دوید** بڕیاری داوە تا دوا تەمەنی لەگەڵ ئەو نەخۆشی یەدا هەڵ بکات تا بەبێ دەستەلاتی و دەستەوەستان ڕۆژێک گیانی لێ دەستێنێت هەمان شەو بانگی **هێلنی** کرد ؛ **هێلن** هات و لەپەنای دانیشت ، زۆر ڕەنگی هەڵبزرکا بوو

**دوید** گوتی :

- **هێلن** باش گوێ بدە قسەکانم

- **هێلن** کە زۆر غەمبار بوو ، بەبێ ویستی خۆی فرمێسکی هەڵدەوەراندن

**هێلن** گوتی :

- دەتەوێ حاخام ( مەلای جوولەکان ) ت بۆ بێنم ؟

**دوید** پێکەنی ، **هێلن** هەرگیز ئەو خەندە شاردراوەی کەبەسەر لێوە وشک هەلاتووەکانی **دوید** دا دیار بوون ، لەیاد ناچێتەوە هەرچەندە کەلە ژیان دا کۆسپ و تەگەرەی زۆریشی بێنە سەر ڕێ

**هێلن** گوتی : **دوید** ! **دوید** گوتی :

- **هێلن** ... ئازیزم لەپێش مردنم دا دەمەوێ ڕازێکت پێ بڵێم

- دەتەوێ چ بڵێی ؟

- من پێویستم بە حاخام نیە ، چونکە لەڕاستی دا من جوولەکە نیم !

وای گومان برد کە وڕێنە دەکات ، دەستی بە دەم و چاویدا هێنا

- دەتەوێ کەمێک پشوو بدەی ؟

- **هێلن** ! من وڕێنە ناکەم و ئیتر کات نەماوە

- خوا یاربێ ١٠٠ ساڵ دەژیت ، نیگەران مەبە

ویستی گاڵتەی لەگەڵدا بکات بەڵام **دوید** بە توندی گوتی :

- نە جوولەکەم و نە ئیسرائیلی !

**هێلن** بێ دەنگ بوو ، بۆی دەرکەوت کە وڕێنە ناکات

- من میسریم و بەر لە هەموو شتێکیش موسڵمانم :

**هێلن** گوتی

- **دوید** !

- وە ناوی منیش **دوید** نیە

**دوید** ئەوەی لەکاتێکدا گوت کە هەناسەی لەهەناسە هەڵ دەنگوت و سنگی توند بوو بوو ، چاوەکانی لە ماندوێتیدا شەپۆلیان دەدا ، **دوید** گوتی لەدەزگای ئاسایش بپر بپرسە ڕاستەقینە لای وانە لەناکاو ڕەنگی زیاتر پەڕی و لێوەکانی وشک هەڵاتن و لێدانی دڵی زیادی کرد ، دەت گوت هەزاران وشە لەژێر لێوی دا قەتیس ماوە بەڵام توانای دەربڕینی نیە ، **دوید** دەستی **هێلنی** توند تر گوشی ، ویستی شتێک بڵێ هەوڵی دا دیسان قسە بکات بەڵام نەی توانی هیچ بڵێ جگە لە دوو منداڵەکانم منداڵەکانم پاشان پێکەنی ، هەناسەیەکی قووڵی هەڵ کێشا و سەری داخست

خانم **سمحون** ڕووی بۆ لای پیاوەکە وەرگێڕا کەبەدرێژایی ڕێگا لەپەنای دانیشتبوو تا خۆی لەبیرەوەریە ڕابردووەکان بدزێتەوە ئەو پیاوە ئاماژەی بە باڵەخانەیەک کرد کە کەوتبۆ لای جادەکە ، بەباڵەخانەیەکی ترسناک دەهاتە بەرچاو پاشان گوتی : گەیشتین !

**هێلن** هەموو بیرو زەینی خۆی لەخاڵێکدا کۆ کردبۆوە سەیارەکە دەی ویست بەلای چەپ دا پێچ کاتەوە تالە دەرگای چوونە ژووردا بچێتە ناوێ ، پاسەوانەکان کە هەمیشە بە پێوە بوون ، بەبێ ئەوەی کەسەر نشینانی سەیارەکە ببینن سەریان دانەواند سەیارەکە لەدەرگاوە خۆی پێدا کردو لەبەردەم باڵەخانەی بنەڕەتی ڕاوەستا ، لەوێ دووکەس بە پێشوازیەوە هاتن ئەو دوو کەسە هەر ئەو دوو گەنجە بوون کە**هێلن** لەماڵی خۆیان لە بێرمن دیتبوونی

* * *

لەدانیشتنەکە جگەلە خانم **سمحون** ٣ کەسی تریشی لێ بوو ، بەڕێوەبەری ڕێکخراوی ئاسایش و دوو کەس لە هاوکارەکانی

دانیشتنەکە بەگیانێکی برایەتی زۆرەوە ئەنجام دراو **هێلن سمحون** وای بۆ دەچوو کە یەکێک لەهاوکارەکانی ئەو ڕێکخراوەی لەمەوبەر بینیبێ

لە دوای ئەوە کە بەڕێوەبەر سەرەخۆشی خۆی و هاوکارەکانی بە **هێلن** ڕاگەیاند ، درێژەی پێدا  زۆر دڵگرانم لەوە کە زووتر لەوە نەم توانی سەرەخۆشی خۆمت لێ بکەم ، ئەویش بەهۆی کاروباری زۆری ئاسایشی و سنورداری کارەکانمان

**هێلن** گوتی  ئەو باسە بۆ من شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو ، بەتایبەتی لەو کاتەی کە **دوید** لەسەرە مەرگیدا ئەو ڕازەی بۆ لەهەڵدا دام

**هێلن** پرسی

- ئایا ئەوە ڕاستە کە مێردی من موسڵمان بووبێ ؟

- بەڵێ خانم  هاوسەری تۆ موسڵمانێکی میسری بوو

لەناکاو **هێلن** گەڕایەوە بۆ ڕابردوو و گوتی :

ڕاستیەکەی من سەبارەت بەژیانی مێردەکەم  خۆ تێ هەڵناقورتێنم هەرچەندە ئێستا زۆر لەشتەکانم بەهەڵواسراوی و نادیار ماونەتەوە

دووبارە بێ دەنگی ژوورەکەی داگرت تا ئەوە کە بەڕێوەبەر گوتی

- چ شتێک زیاتربەلاتەوە سەیرە

**هێلن** گوتی  هەندێک جار دەچوومە ژوورەکەی **دوید** ، دەم دیت کەلەسەر ئەرز هەڵتروشکاوە ڕووەو باشوری ڕۆژهەلأت ، بەڵێ  هەمیشە  هەمیشە ڕووەو باشوری ڕۆژهەڵات  کڕنوش دەبات ، خوایە ئێستا ئەو ڕۆژانەم دێتەوە یاد  بەڵام ئەو کات زۆر گرنگیم بە مانە نەدەدا ... ڕووەو باشوری ڕۆژهەڵات لە ژووری خەوتن دا لەسەر ئەرز دادەنیشت و دەی خوێند  ال  ال  کتێبی پێرۆزی ئێوە موسڵمانان ناوی چی یە ؟

- قورئانی پیرۆز

- بەڵێ زیاتر قورئانی پیرۆزی دەخوێندەوە  جارێک لەم بارەوە خۆم تێ هەڵقورتاندو لێم پرسی

وا هەست دەکەم کە زمانی عەرەبی بەباشی دەزانی لەوانەیە لەزمانی عیبری یان ئەڵمانیش هەر وابێ

پێکەنی و وەکو ئەوە کە بیەوێ شتێک بشارێتەوە گوتی

من ساڵەهای ساڵە کە لە ئایینە ئاسمانیەکان دەکۆڵمەوە دوبارە بی دەنگی سەری هەڵدا هەتا **هێلن** دوبارە زاری بۆوەو گوتی

- من لەگەڵ **دوید** دا ڕاستگۆ بووم بەڵێ ڕاستگۆ بووم و ئەو نەی دەتوانی درۆم لەگەڵدا بکات... یەکێک لەهاوکارەکانی فەرمانگەی ئاسایش بێ وچان ، وەکو ئەوە کە بیەوێ کارێکی گرنگ بێنێتەوە یاد ، دەی گوت خانم ! **دوید** نەی دەتوانی ئەو ڕازە بەتۆ بڵێ ، چونکە لەخۆوە نەی دەتوانی بیدرکێنێ ، لەڕاستی دا ئەو ڕازە بەتەنێ پەیوەندی بەمەوە نەبوو **هێلن** بەسەر سامی یەوە گوتی ئێستا هەست بەمەیان دەکەم .

بەڕێوەبەر گوتی بەهەر حاڵ پێت خۆشە بڵێم کە ئێمە ئامادەین بۆ هەر پرسیارێک کەهەتە وەڵامی بدەینەوە ، بەهەمان شێوە کە ئامادەین هەر داواکاریەکی ئێوە بەرز بخەملێنین ، چ سەبارەت بە تۆو چ سەبارەت بە منداڵەکانت ، **هێلن** بۆ بەرچاو ڕوونی گوتی ببورە کاکی بەڕێوەبەر بەهەمان شێوە کە عەرزی جەنابتم کرد هەموو باسەکە بۆ من چاوەڕوان نەکراوو لەناکاو بوو ، وە من لەڕاستی دا ڕۆژانی سەختم بەسەر برد ، ئێستاش ئاسایی یە دەیەها پرسیارم هەیە کە دەمەوێ دەریان برم بەڵام سەبارەت بە داواکاری ، وای بۆ ناچم کە داواکاریەکی دیاری کراوو تایبەتم هەبێ و لەوانەیە بش زانیت و حەتمەن دەزانیت کە **دوید** بۆ من و بۆ منداڵەکانی ملیۆنەها مارک و دۆلاری بە میرات بەجێ هێشتووە ، بەڵام هەست بە بەرپرسیارێتی دەکەم سەبارەت بە پاراستنی گیانی منداڵەکانم

بەڕێوەبەر گوتی : ئەوە شتێکە کە ئێمەین دەبێ بیکەین .

- لە وڵاتی ئێمە ، زۆر بە دڵنەرمی و ڕێزەوە لەگەڵ من دا ڕەفتاری کردووەو ئەو کارەش زیاتر منی سەرسام کردووە

- خانم لەیادت نەچێت کە تۆ هاوسەری قارەمانێکی جەربەزەو بێ وێنەی

**هێلن** بەسەر سوڕمانەوە گوتی : قارەمان ؟ !

( **هێلن** بەدەنگێکی لەرزۆکەوە ددانی لەسەر وشەی قارەمان دەجیڕەوە دەبردن ) و پاشان گوتی : وای بەباش دەزانم کە پرسیارێک بکەم کە کلیلی هەموو پرسیارەکانی منە

- تۆ ئازادیت لەهەر پرسایرێک کە دەیکەیت

- هاوسەری من کێ بووە ؟

بێ دەنگی دووبارە هەمووانی بەخۆدا چوواندەوە ، بەڕێوەبەر لەسەر کورسی یەکەی خۆی جوولەیەکی بۆ کرد ، **هێلن** درێژەی پێدا

- مەبەستی من ئەوە نیە کە ئەو بەناو میسری یە یان نا بەڵکو دەمەوێ بزانم کە باوکی منداڵەکانم لەبنەڕەت دا چ کارە بووە ، منداڵەکانی ئێمە بمانەوێ و نەمانەوێ سۆراغی باوکیان هەڵ دەگرن و من ناچارم کە وەڵامیان بدەمەوە ، **هێلن** لەو کاتەدا خۆی بۆ مەرزەم نەدەکرا ، هەناسە بڕکێی گەیشتبۆیێ ، ماندوو و دەهاتە بەرچاو ، بەڕێوەبەر مۆڵەتی پێدا تا ئەو شتەی کە دەیەوێ بیڵێ ، **هێلن** درێژەی پێدا

- تەنها هیوادارم ڕاستی ببیستم ، هەر لەبەر ئەوە بەڕێوەبەر لەشوێنی خۆی دانیشت و گوتی ڕاستیەکەی هیچ کەس لەسەر ڕووی زەوی ناتوانێ سەبارەت بە هاوسەرەکەت هەواڵی ڕاست و دروستت پێ ڕابگەیەنێ جگە لەکەسێک کە لەگەڵ ئەودا دۆستێکی گیانی بەگیانی بووەو بەشێوەیەکی گشتی نزیکترین کەس بووە لێی .

**هێلن** گوتی :

- ئەو کەسە کێ یە ؟ ئایا دەتوانم چاوم پێی بکەوێ ؟

بەڕێوەبەر ئاماژەی بەکەسێک کرد کە **هێلن** حەزی دەکرد لەپێشدا ئەوی بینیبا و گوتی :

- ئەو لێرەیە بەرێز **عەزیز جەبالی**

**هێلن** یەکسەر بۆ لای **عەزیز** گەڕایەوەو گوتی

- کاکە ئێمە لەمەوبەر یەکتریمان نەبینیوە ؟ !

**عەزیز** کەلە وانی تر زیاتر پەشێوو دڵ بەغەم بوو وەڵامی دایەوە ئەو دیدارە جارێک ڕووی دا

لەناکاو ئەو بیرەوەریە ئاشکرا بوو و **هێلن** گوتی :

بەڵێ ڕۆژی ناشتن تۆ لەوێ بووی لەکۆتایی ڕێ و ڕەسمەکە بەدوای تۆوە بووم ، تۆم نەدۆزیەوە چونکە هەروەک لەناکاو دەرکەوتی لەناکاویش ون بووی

- بۆ من نەدەكرا ماڵ ئاوایی لێ نەكەم ، نەدەكرا بۆ دواجار نەی بینم

**هێلن** گوتی

- بەڵام بۆ نەدە

پرسیارەكەی بەتوندی دەربڕی بەڵام پاشان عەكس بۆوە سەرەنجام وەڵامەكەی پێكاو لێكدا لێكدا بەقسەی هەڵیت و پەڵیت گوتی

- نا شتێك نیە ئێستا هەستی پێ دەكەم ... دەتوانم هەستی پێ بكەم

بەڕێوەبەر پێكەنی و گوتی

- لەوانەیە پێت خۆش بێ وەڵامی پرسیارەكەت بزانی ؟

- بەڵێ لەوانەیە زیاتر لەوەی كە پێویست بكات كاتی تۆم گرتبێ

**هێلن** ئەوەی گوت و پاشان هەموویان قیت بوونەوە ، بەڕێوەبەر گوتی

بێ گومان خۆشت دەزانیت كە هەندێك لەڕازەكانی ناتوانم پێت بڵێم

- دڵنیا بە كە من نابم بەلەمپەر ماڵ ئاوا

- بەئومێدی دیدار

* * *

ئەو شوێنەی كە **هێلن سمحون** و **عەزیز جەبالی** لێی دانیشتبوون ، ساڵۆنێكی بچووك بوو كەبە هەندێك كەل و پەلی وەرزشی گیرا بوو ، دوو پەنجەرەی ڕووەو باخچەی تێدابوو باخچەكە كەمێك بە پشت گوێ خراو دەهاتە بەرچاو **هێلن** لەیەكەمین سات دا دەی زانی كە **عەزیز جەبالی** هەموو هەوڵ و كۆششی خۆی دەخاتە گەڕ تا خەم و خەفەتێك كە وەكو گەردەلول خەریكە ڕای دەماڵێ لێی دوورخاتەوە

ڕووبەڕووی یەك هەریەكەیان پەرداخێك ئاوو ئیستكانێك چای لەپێش دانرا ، بەوردی لێی دەڕوانی ، پیاوێكی ئاسایی بوو ، كەسێكی زۆر بیر تیژ بوو ، بیچمێكی ڕێكی هەبوو

**عەزیز** بەزەردەخەنەوە گوتی

- زۆر باشە لەكوێوە دەست پێ بكەین ؟

- ناوی مێردەكەی من چی یە ؟

- **ڕەئفەت ئەل هەجان**

**هێلن** شیرانی ئەدی ئەوە ئەو ناوە نەبوو کە

- بەڵێ ئەو ناوەی کەلەسەر پاسپۆرتەکەی تۆیە

**هێلن** ویستی هەڵداتێ ، بەڵام کەمێک دانی بەخۆدا گرت

- یەکەمین جار چۆن چاوت پێی کەوت ؟

- **عەزیز** بزەی هاتێ ، کەمێک ڕاڕا بوو

- ببورە خانم من هەتا یەک جاریش چاوم پێی نەکەوتووە !

**هێلن** بەسەر سامیەوە گوتی چاک حاڵی نەبووم ، ئەوان بەزمانی ئینگلیزی قسەیان دەکرد ، **هێلن** ماوەیەک کەوتە گومان و دڵە ڕاوکێ کە چاک لەهەندێک لەقسەکانی **عەزیز** نەدەگەیشت ، هەر چەندە کە **عەزیز** زمانی ئینگلیزی زۆر بەڕەوانی و وەک ئینگلیزەکان قسە پێ دەکرد

**عەزیز** گوتی بەچاکی لێم تێ گەیشتی ؟ من تا ئێستا هەتا یەک جاریش چاوم بە **ڕەئفەت** نەکەوتووە

**هێلن** گوتی وا پێ دەچێت ئەو باسەی ئێمە کاسەیەک بێ زۆر بن کاسەی تری لەژێر دابێ و زۆر ڕازو نهێنی تێدا حەشار درابێ

- ئەگەر ڕاستیەکەت دەوێ وایە

**هێلن** گوتی بەس توخوا بەمن بڵێ **دوید شارل سمحون** یان **ڕەئفەت ئەل هەجان** کێ بووەو چی کردووە !

**عەزیز** کەمێک بێ دەنگ بوو و ئیزنی وەرگرت تا جگەرەکەی بکێشێ ، **هێلنیش** ڕێگەی پێدا **عەزیز** قومی لەجگەرەکەی داو لەکاتێکدا کە چرەدووکەڵی دەحەوا هەڵدەچوو ، داستانەکەی دەست پێ کرد

# بەشی چوارەم

# خۆبەخت کردن گونجاو نیە

پرسیارێک کە **عەزیز جەبالی** بۆ خانم **سمحونی** وروژاند نەک تەنها بەدەر لە ناساندن و ڕێ خۆش کردن بوو لەڕاستی دا دەیەویست مەتەڵەکە هەڵ بێنێ لەو ساتەوە کە بڕیار بوو خانم **سمحون** بۆ قاهیرە بانگهێشت بکرێ ، دەی زانی کەکاتێ **هێلن** ڕاستەقینەی مێردەکەی زانی ، دێتەوە قاهیرە تا لەگەڵ ڕێکخراوی ئاسایشی میسر پەیوەندی بکاتەوە ، ئەوە هەمان ئەو شتە بوو کە **عەزیز جەبالی** و **ڕەئفەت** لەسەری کۆک بوون

**ڕەئفەت** ڕۆژێک بە **عەزیزی** گوتبوو لەئایندەی منداڵەکانم بێ باکم و بەڵێنی دابوو کە ئەو ڕازە بۆ هاوسەرەکەی **هێلن** ئاشکرا نەکات ، پاشان ڕای گەیاند کە لە دوای مردنیشی ، **هێلن** لە دیاری کردنی چارەنوسی خۆیدا سەربەست بێ

**عەزیزیش ڕەئفەتی** باش دەناسی و پەیمان و بەرپرسیارێتی یە پۆلاینەکەی ئەوی سەبارەت بە وڵاتەکەی دەزانی ، **عەزیز** دەی زانی کە خانم **سمحون** کێ یەو چ جۆرە ژنێکە ؟ لەو ساتەوە کە ڕەئفەت لە دیدارێکدا لە ڕۆم لەگەڵ ئەو هەموو سەرقاڵیەی خۆی ڕای گەیاند کە دەیەوێ ژن بێنێ وا حەوت ساڵ تێ دەپەڕی

**ڕەئفەت** گوتی دەمەوێ لەگەڵ ژنە بازرگانێکی ئەڵمانی بەناوی **هێلن** ڕیشتەر پەیمانی هاوسەرێتی گرێ بدەم **عەزیز** دەیەویست ئەو بناسێ و شتێکی لەبارەوە بزانێ ، هەر لەو وەختەوە کە لە شاری خام بووە لە باشوری ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیا تا ئەمڕۆو ئێستاش

**عەزیز جەبالی** دەی زانی کە ڕۆژێک دادێ **هێلن** دێ و پرسیار لەبارەی دویدموە دەکات ئەوەشی بەمافی ئەو دەزانی ، لە لایەکی تر **عەزیز** دەی زانی کەئەو دەبێ وەڵامگۆ بێ بەبێ کەم و زیاد بەو مۆڵەتە سنوردارەش دەبێ هەموو شتێک بەڕاشکاوی بەخانم **سمحون** بڵێ داستانی قارەمانێک کە هەموو ژیانی بەختی وڵاتەکەی کرد بوو ، ئەو **ڕەئفەتەی** کە بەبێ هیچ نغرۆبوون و زیادەڕەویەک یەکێک

لەگەورە ترین و سەرکەوتوو ترین کارە سیخوڕیەکانی مێژووی بۆ بەرژەوەندی وڵات و هەموو موسڵمانان تۆمارکردووە

ئێستا هەموو بیرەوەریە ڕابردووەکان تەوژمیان بۆ سەر هزری عەزیز هێناوە ، کەوتە بیرکردنەوە چۆن دەبێ کە مرۆڤێکی نەبینراو بەم جۆرە ماڵی دڵی مرۆڤێکی تر بکاتە خانەخوێ

٢٠ ساڵی تەواو لەگەڵیدا لەپەیوەندی بەردەوام و یەک لە دوای یەکدا بوو ، لەو ماوەیەدا ڕووداوی زۆر ڕووی دا هیچیان لەمانە ڕووداوی هەڵاتن و ترسنۆکی نین ، هەڵاتن بۆ کوێ ؟ هەرگیز بیری نەدەکردەوە ژیانی ئەو لەگەڵ ژیانی ڕەئفەت دا ئاوا بچەسپێ و گیرۆدەی ببێ ، بەڵام عەزیز لەماوەی ٢٥ ساڵ خەباتیدا وا ڕاهێنرا بوو کە هەموو ئەفسەرێکی هەواڵگر کەلە شتێک دەدوێت دەبێ شتێکی تری لە دەروونی خۆیدا حەشار دابێ ، بۆ نموونە لەگەڵ خیانەت کارێکدا دەبێ وا ڕەفتار بکات کەهەموو بەڵگەڵگەنامەکانی خیانەتی بەسەردا ساغ کراونەتەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەدا وەکو هاوشاریەکی بەڕێزو شکۆمەند ڕەفتاری دەکرد ، چونکە تەنگژەی کات مۆڵەتی نەدەدا کە خیانەتەکەی ئاشکرا بکات ، دیارە کە عەزیز جەبالی خۆی وا پیشان دەدا کەلە ژیانی دا دەتوانێ دوو کەسایەتی لەخۆیدا بەرجەستە بکات ، دوو ئاوەز ا عقل ا دوو ناو دوو ویژدان کە یەکێکیان لەتوانای دیتن دا نیەو ئەوی تریان لەگەڵ خێزان و کومەڵگادا وەکو هەموو خەڵکی ئاسایی بەکاردێنێ ، بەڵام لەڕاستی دا ئێستا عەزیز لەبەردەم پرسیاری هێلن دا تێ مابوو کەدەبێ بڵێت چی ئەگەر پرسی باشە لە کوێوە دەست پێ بکەین ؟ !

*　　*　　*

دەبوا دان پێدابنێ کە عەزیز جەبالی لەسەر هەقە ، بەڵام کێشەکە ئەوە بوو کە نەی دەزانی لەکوێوە دەست پێ بکات ، ئایا عەزیز جەبالی دەبێ باسەکەی لەشەوە گەرمەکەی ئەیلولی ساڵی ١٩٥٨ دەست پێ بکات ؟ ئەوکاتەی کە کۆمەڵێک ئەوراق و فایلیان دابوونێ تا بەوردی لێیان بکۆڵێتەوەو دۆخەکەیان یەکلابکاتەوە کە بۆ یەکەمین جار لەگەڵ ڕەئفەت عەلی سولەیمان ئەل هەجان یان دوید شارل سمحون ئاشنا بوو

هاتەوە یادی کە چۆن ئەو کات لەبەیانیەوە تا شەوێ درێژەی بەکارەکەی دەدا بەشێوەیەک کە ناوی خۆشی لەبیر کردبوو

دەهاتەوە بیری کە چۆن لەگەرمان کراسەکەی دادەکەندو تەنها بە بیجامەو نیو قۆڵێکەوە کاری دەکرد و ئارەقە لەدەم و چاوی هەڵدەچۆڕا ، چونکە ئەو بینایەی کە کارەکانیان تێدا ڕادەپەڕاند نەباوەشێن و نە سارد کەرەوەو هەتا پانکەشی تێدا نەبوو

دێتەوە یادی کەچۆن خەریک بوو لەحەشمەتان دەست لەکاری نیوەشەوان هەڵ بگرێ چونکە تواناو وزەی نەما بوو ، بەڵام لەناکاو وێنەی ڕەئفەتی بەرچاو کەوت وێنەیەکی سەیر ، بەزەردەخەنەیەکی دڵڕفێن و نیگایەکی وێڵ وەک ئەوە کەخاوەنی ئەو ڕوخسارە لەدنیایەکی ون دا داوای یارمەتی بکات دێتەوە یادی کەبە یەکەمین تێڕوانین لە وێنەکە چاوەکانی ڕفاند بوو ، ئاوڕی دایەوەو لەسەر کورسیەکە دانیشت

دووبارە چاوی تێ بڕیەوەو وێنەکە وەرەقەکانی ناو دۆسیەکەی پەڕ بە پەڕ هەڵدانەوە دێڕ بە دێڕی خوێندەوە واقی وڕما دیسان کەوتەوە سەر خوێندنەوەی دۆسیەکە تا شەوی بەڕۆژ سپارد

ئایا **عەزیز** دەبێ لێرەوە دەست پێ بکات ؟ **دوید** لەسەرەتادا لەگەڵ **محسین ممتاز** دا بوو ، کوێخا زادەیەکی گرژو مۆن و دڵ ڕەق و لەهەمان کاتدا سەرقاڵ بوو

ئەو یەکەمین کەس بوو کە **ڕەئفەتی** لەزیندانی تێهەڵچوونەوە لە گرتوخانەدا دیت ، ئەوێ ڕۆژێ **ڕەئفەت** بە تۆمەتی ئەوە کە جوولەکەیەو دەیەوێ لەمیسردا بژی ، دەستگیر کرابوو ، ناوی ئەو لەسەر ئەوراق و بەڵگەنامەکانی لیوی کوهن هەبوو ، ئەو ڕاستی یە پەیوەندی بە ساڵی ١٩٥٤ ەوە هەبوو دادوەری ئەفسەری پۆلیس و ئەفسەری ئاگایی و بەرپرسانی زیندان دانیشتنێکی کورتیان سەبارەت بەتاوو توێ کردن و یەک لایی کردنەوەی دۆسیەی ئەو گەنجە پێک هێنا ، بیچمێکی سەیری هەبوو بەڵام بیر تیژ بوو ، کاری لەڕادەبەدەری ئەنجام دەدا ، ئەوەی کە هەمووانی سەرسام دەکرد ، سروشتی بوونی کارەکانی بوو ، بەسەر خۆیدا زاڵ بوو و هەمووانی لەحاست ناسینی ناسنامەکەیدا دەستەوەستان کرد بوو ، بەڵگەنامەکانی بەردەست ئەویان بە جوولەکە پیشان دەدا بەڵام هەندێکی تر لەبەڵگەنامەکان بەمەسیحی هەندێکی تر کەنەدەکرا گومانیان پێ ببرێ بە موسڵمانیان ناوزەد دەکرد بەڵام بەڵگەنامەو

ئەوراقەکانی نەتەوە بوونی ئەویان بە بەریتانی دەناساند و هەروەها بڵگەنامەی تریش لەبەردەست دابوو کەپیشانیان دەدا کە خوێن و گۆشت و ئێسکانەکانی میسرین !

ئایا دەبێ عەزیز جەبالی داستانی خۆی لەو شەوەدا دەست پێ بکات ! یان لەوێوە کە پەردە لەسەر کوێرەوەریەکانی ڕەئفەت ئەل هەجان هەڵدەدرێتەوە گەنجێکی خەڵکی قاهیرە کە باوکی هەر لەقۆناغەکانی منداڵی دا لەدەست داوە — بەهەمان شێوە کە هەندێك لەفلیمە میسری یەکان ئەو ڕۆژانە یاد دەکەنەوە — لەو ڕۆژگارەدا لەبەر گوشاری هەژاری و نەداری لەماڵ ڕای کردو کوێرەوەری زۆری هاتە ڕێ

ئایا دەکرێ ئەوە سەرە داوی دەستپێکی گرنگ و گونجاو بێ بۆ پرسیاری **هێلن** یان ئەوە کەلە شەوی ۲۲ ی حوزەیرانی ساڵی ۱۹۵۲ دەست پێ بکات

لەو شەوەدا کۆمەڵێك لە ئەفسەرانی گەنجی میسری کە پاشان بەناوی ا ئەفسەرانی ئازاد ا ناوزەد کران کودەتایەکیان دژی ڕژێمی گەندەڵی پاشایەتی وەڕێ خست ، ئینجا هەستیان کرد کە کەوتونەتە نێوان کێشەو بەرەیەکی زۆرو ئاڵۆزەوە ، لەبەر ئەوە ئەو ڕۆژانە بەدەستەواژەیەکی سەردەمیانە مێرگی دڵان بوون ، بەڵکو ئەوان لەگەڵ ڕژێمێکی تێکدەر ڕووبەڕوو بوو بوونەوە کە پایەکانی ڕۆچو بوون ، وا بەبیریاندا دەهات کەدەبێ وڵاتەکەیان لەنوێیی بنیات بنێنەوە

ئەوان شۆڕشیان کردبوو و پاشای لە خۆڕازییان وەدەر نابوو ، شۆڕشێك کە خوازیاری نەمانی هەژاری و نەفامی و نەخۆشی و نەگبەتی بوو ، ئەوان وای بۆ دەچوون کە دووژمنێکی چەکدار لەکەمین دانیشتووەو لەدەرفەتێك دەگەڕێ تا هێرشیان بۆ بەرێ و لەناویان ببات ، خۆزگە گرفتەکە تەنها ئەوە دەبوو کارەساتی گەورە ئەوە بوو کە ئەوان لەحاست ئەو شتە کە بۆ بنیات نانەوە پێویست بوو دەستە پاچەو بێ دەستەلات بوون و لەکەل و پەلی بنیات نانەوەش هەر گەڕێ ئەو گەنجە کەم ئەزمونانە بەلام دڵسۆزانەو بوێرانە هاتنە مەیدان کە ئامانجیان بنیات نانەوەی وڵات بوو لە هەموو بوارەکانی کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابوری و سەقامگیری دەوڵەتی یاسا ، ئەوان نەك لە سفر بەڵکو لەژێر سفریشەوە دەستیان پێ کردبۆوە

ئایا **عەزیز جەبالی** دەبوا داستانەکەی لێرەوە دەست پێ کردبا ؟

*   *   *

- بەڕێز جەبالی !

**عەزیز** چاوەکانی بەدوادا گێڕا ، **هێلن** خۆی لێ لە گێلی داو تەماشای دەکرد و بزەی دەهاتێ

**عەزیز** دەست بەجێ لەناو گێژاوی یادەوەریە ڕابردووەکاندا هاتەدەر ، **هێلن** لە کاتێکدا کە پێ دەکەنی پرسی

توخوا هێندە هۆگری بوو بووی ؟

**عەزیز** نەی دەزانی کە بۆچی لەوکاتەدا **محسین ممتاز** ی بیرکەوتەوە ، نەی دەزانی کە بۆچی سیما دێهاتیەکەی **محسینی** لەبەرچاواندا قیت بۆوە ، بەهەرحاڵ **عەزیز** وەکو هەموو ئەفسەرە ئەزموون دیتووەکانی هەواڵگری ، بوار بەبەرانبەر نادات بە پرسیارەکانیان لەنەخشەی گەڵاڵە داڕێژراو دووری خاتەوە بەڵکو ئەو بە وەڵامە یەک لەدوای یەکەکان لایەنی بەرانبەر بەدوای خۆیدا دێنێ :

- خانم دەڵێن تۆ لە ۱۶ ساڵی دا شای جوانان بووی !

**هێلن** وەک ناسیاوێک بەڕوویەوە پێکەنی و لەهەمان کاتدا لەمەبەستە شەیتانیەکەی گەیی بەڵام ژیرانە دانی بەخۆدا گرت و دەست بەجێ گوتی

- سوپاست دەکەم بەڕێز **جەبالی** ...بەڵام ئەو پەسنە زۆرەی جەنابتان هیچ پەیوەندی یەکی بەپرسیارەکەی منەوە نیە ! **هێلن** نەی دەزانی کەمەبەستی **عەزیز** ئەوەیە ستایشی بکات ، **عەزیز** درێژەی پێدا

- بەڵێ خانم ... تۆ ۱۶ ساڵە بووی کە ڕووداوەکانی ئەو داستانە دەستی پێ کرد

لەناوچەیەکی دوورە دەست لەدەوروبەری قاهیرە جێگەیەک کە نە ئاوەدانی لێ بوو و نەدەنگی سەربزێوێکی لێ دەهات باڵەخانەیەک بوو بەڕواڵەت سەیرو سەمەرەو چۆڵ و هۆڵ ئەو باڵەخانەیە کەوتبۆ یەکێک لە کێڵگە سەر سەوز و دڵڕفێنەکان

لە دوور ڕا ئەو باڵەخانەیە نەوی دیار بوو کە هەندێک شوێنی ڕۆچوو بوون و پێناسەیان لەچۆڵ کردنەکەی دەکرد ، بەڵام کێشەکە تەنها لەکارکەوتنی دیوارەکانی نەبوو بەڵکو نوانی باڵەخانەکەش داڕما بوو ، باڵەخانەکە لە دوو چین پێک هاتبوو ،

چونکە لەوەرگای شلك و تەڕ دەورەی دابوو هەموو دیوارەکانی شێیان هەڵێنا بوو پاسەوانەکەش لەمانگی ڕەزبەردا جل و بەرگی پۆشی بوو ، لەپەنا دەرگای هاتنە ژوور دەوەژنا ، لەسەرەتای دەست بەکاربوونی ئەو باڵەخانەیە نەخۆشخانەیەک دروست کرا لەساڵی ١٩٤٩ ، خاوەنی ئەو پڕۆژەیە پزیشکێکی گەنج و بەتوانا بوو کە ١٠ ساڵ تەمەنی خۆی لەڕێگەی وەدەست هێنانی زانست دا لەزانکۆکانی سویسرا بەسەر برد بوو تا بەشی دەروونناسی بخوێنێ ، بەڵگەنامە زانکۆیی یەکانی ئەو نیشانیان دەدا کە دەبێ بلیمەتێک بێ باوکی یەکێک بوو لەسەرمایەدارەکانی میسر و هەزاران هیکتار زەوی کشتوکاڵی لەژێر دەست دابوو ، بەڵام دایکی لەخێزانە سەرناسەکانی میسر بوو چونکە بەشداری لە پڕۆژە خێرخوازە گرنگەکاندا دەکرد وەکو کۆمەڵگەی پێ پەتیەکان کەلە سەردەمی خۆیدا زۆر ناسراو بوو و لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان پڕ بوون لەهەواڵ و چالاکیەکانیان لەمەڕ کۆمەک بەپێ پەتیەکان ، ئەو ئەنجومەنە پێڵاو و لەعلەیان بەسەردا دابەش دەکردن .

لەبەر ئەوە ئەو پزیشکە بڕیاری دا ئەو پارچە زەویە بکڕێ پاشان پارچەیەکی تریشی هەربە تەنیشت ئەمەوە کڕی .

گەنجەکە زۆر بەئاسانی جادەکەی قیرتاو کرد ، هەروەها ڕێگەی جادەیەکی تریشی بەناو کێڵگەکەدا کردەوە تا ڕاستەوخۆ دەستی بە نەخۆشخانەکە ڕابگات ، پڕۆژەی کێبڵ کێشی کارەباشی بۆ نەخۆشخانەکە بەخێرایی ئەنجام دا پاشان ژمارەیەکی لەپەرستارانی سویسری و فەرەنسی و کارگوزاری میسری لەسەر دامەزراندن ، تەنها ئەو کێشەیەی کە پزیشکە گەنجەکە لەگەڵیدا ڕووبەڕوو دەبۆوە مەسەلەی دابین کردنی ئاو بوو ، بۆ چارەسەری ئەو گرفتەش ئەندازیارانی بەرپرسی پڕۆژەی نەخۆشخانە ، ئەو پڕۆژەیان تەواو نەکرد ، بەڵام چالاکی ڕاکێشانی بۆڕی ئاوی قاهیرە بەهۆی لەکار کەوتنی کابینەو دابین کردنی کابینەیەکی تر دواخرا ، لەبەر ئەوە پڕۆژەی نەخۆشخانە لەگەڵ شکست ڕوو بەڕوو بۆوە ، ئەو کێشەیە لەتواناو بەهرەکانی پزیشکە گەنجەکەی کەم نەکردەوەو هەوڵ و کۆششی لەق نەکرد ، بەڵام ئەوەی کە جێگای سەرنج بوو ئەوە بوو کە ئەو نەخۆشخانەیە تەنها چارەسەری نەخۆشیە دەروونیەکانی تێدا دەکرا

نەخۆشخانە توانی بووی بۆ خەرجی داوو دەرمان سود لەسەرمایەی نەخۆشە دەست ڕۆیشتووەکان وەرگرێ کەبەویستی خۆیان بڕیاری دەستەبەر کردنیان دابوو ، ئەو نەخۆشخانەیە لەگەڵ پێشوازی بێ وێنەی نەخۆشاندا ڕوو بەڕوو بۆوە

لەنیوەی ساڵی ۱۹٥۱ ، نەخۆشخانە خۆی لەسەردانی نەخۆشەکان پاراست و پزیشکە گەنجەکەش لەپڕدا ون بوو ، لەسەرەتادا دەگوترا کە بۆ کڕینی کەرەستەو دەزگای پێشکەوتووی پزیشکی و بۆ تۆکمە کردنی بەهرەکانی چۆتە ئەوروپا ، بەڵام ون بوونی پزیشکە گەنجەکە درێژەی کێشا نەخۆشخانەکە بوو بە جێگەی سەرنج و دڵەڕاوکێ ، کەم کەم پەرستارانی سویسری و فەڕەنسایی بۆ وڵاتی خۆیان گەڕانەوە ، تاقمێک لەنەخۆشەکان چوونەوە سەر کاری خۆیان ، پەرستاران و کارگوزارانی میسریش مۆڵەتیان وەرگرت ، لەبارەی هەڵپەساردنی نەخۆشخانەکە قسەو باسی زۆر دەکرا هەندێکیان دەیان گێڕاوە بۆ کێشەی سۆزداری و هەندێکی تر بۆ

سەرەنجام وابڵاوبوو کە پزیشکەکە بۆ چارەسەری خۆی چۆتە دەرەوە ، پاشان شۆڕشی ۲۳ ی حوزەیرانی ۱۹٥۳ ی جەماوەریی ڕوویدا کە تەوژمێک لە گۆڕانکاری نوێ هاتە کایەوەو سەرانسەری میسری ڕووناک کردەوە هەر بەم هۆیە نەخۆشخانەکەش لەبیرکراو کەس بەوردی نازانێ کە باڵەخانەی نەخۆشخانە لەو وەختەوە کە لە نیوەی دووەمی ۱۹٥۱ بەجێ ما جارێکی تر نۆژەن کرایەوە یان نا

لەنیوەی ساڵی ۱۹٥۲ دەگوترا کەیەکێک لەکارمەندان ، بینایەی نەخۆشخانەکەو تەواوی زەویە پەیوەندی دارەکانی نەخۆشخانەکەی لەباوکی پزیشکەکە کڕیوە کەلە ماڵەوەدا گۆشەگیر بوو بوو ، بەڵام پاسەوانە پیرەکەی نەخۆشخانە هەروا لەشوێنی خزمەتی خۆی مابۆوە

لەدوای چەند مانگێک لەکاتێکدا کەئی وا هەبوو باسەکەیان لەبیر چووبۆوە و دروست لەگەڵ گۆڕانکاریە تازەکانی میسرو سەرهەڵدانی شۆڕشی نوێ پارچە قوماشێک بەسەر دەرگای باڵەخانەکەدا هەڵواسرابوو لێی نووسرابوو فەرمانگەی پلان و توێژینەوە

ئەو ناوە بۆ ئەو کاتە نامۆ بوو و کەس نەی دەزانی ئەو فەرمانگەیە بۆچی دروست کراوەو کاری چی یە ؟ کەس نەی دەزانی کە سەر بە چ وەزارەتخانەیەکە ، هەروەها ڕۆژێک کارمەندان بەپاسێکی کۆن و تۆزو با ا کەناوی هیچ وەزارەتێکی لەسەر

نەنوسرابێ ) ، دەچوونە ناو باڵەخانەکە خاوەنداری تازە داوای لەپاسەوانەکە کرد کە درێژە بەکاری خۆی بدات بەشێوەی نۆرە باڵەخانەی وێڵ کراو ، سەر لەنوێ ڕەونەقی وەرگرتەوە ، لەوە دابوو کەفەرمانگەی پلان و توێژینەوە لەخەم خەڵکی دا نەبێ و کارمەندەکانی زۆر سنوردار کرابوون و هەموویان بەبێ جیاوازی لەو گەنجانە هەڵبژێردرابوون کەزۆر پەیوەست بوون بەکات و ساتەوە،ڕێک لەسەعات ٨ ی بەیانی دەستیان بەکار دەکردو سەعات ٢ ی دوای نیوەڕۆ پاسە شڕەکە دەهات بۆ بردنەوەیان

باڵەخانەکە لەدوای نۆژەن کردنەوە دووبارە ڕێکخرایەوەو کەم کەس لەکارمەندانی باڵەخانەکە دەیان توانی شەو و ڕۆژ لەژوورێکدا هەڵ بکەن .

لەو ڕۆژگارەدا ، پایتەختی میسر لەبەردەم وروژانێکی سیاسی دابوو ، کەس لای لەو ناوچە دوورخراوەیە نەدەکردەوە ، بۆ ئەو کاتە دەستکەوتێکی باش بوو چونکە ئەو باڵەخانەیە دوو ساڵ وەلانرا بوو ، سەرەنجام بەشێک لەڕێکخراوی هەواڵگری و ئاسایشی گشتی میسر بۆ ئەو بینایە گوێزرایەوە

تاقمی کارمەندان کەشەو و ڕۆژیان لەو شوێنە دوورەدا بەسەر دەبرد گروپێکیان لەیەکەمین ئەفسەرانی بەئەزمون و سەرمەشق لێ دەرچوو

لەچوار مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٥٤ ژمارەیەک لەئەفسەرە کارمەندەکانی باڵەخانەکە بەفەرمانگەی پلان و لێکۆڵینەوە ناسرابوون کۆڕێکیان پێک هێنا لێکۆڵینەوەو گەلاڵەی هێندە تۆکمەیان دادەڕشت کەلە دوای نیوەڕۆ تا نزیکەی سەعات ٨ ی شەو درێژەی دەکێشا ، حەسەن سفر و محسین ممتاز ( دووکەس بوون لەو گرووپەی کەلە سەرەتاکانی شۆڕش دا بەچاوساغی یەکەمین دەزگای ئاسایشی میسر هەڵبژێردران ( لەوێدا کۆبوونەوەی خۆیان گرێدا

ئەوان هەرچەند زیاتر بەناو قوڵایی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی کاروبارەکاندا ڕۆ دەچوونە خوار ئەوە دڕندەیی میسریان لەسەر کەندەڵانی هەڵدێرو خلیسکان زیاتر بۆ ئاشکرا دەبوو ، زیاتر وڵاتە پێشکەوتووەکان ، پێویست بوونی ڕێکخراوێکی هەواڵگری و ئاسایشی بەهێزیان هەست پێ دەکردو سەرگەرمی کاری ڕێکخراوەیی خۆیان دەبوون ، لەکاتێکدا کە وڵاتی میسر لەو بارەوە زۆر کزو لاواز بوو و لەهەمان کاتیشدا دووژمن —

ئیسرائیل — سودی لە هەموو ئامێرێکی سیخوڕی وەردەگرت و زل هێزترین هێزی دنیای لەپشتەوە بوو

لەو کاتەدا میسر کۆمەکی لەهەندێک وڵات خواست بەڵام ئەوان جگە لەناردنی پەڕپووت کارێکی تریان نەکرد لەبەر ئەوە لەدوای ماوەیەک ئەو ئەفسەرانە بەتەواوی هەستیان کرد کە دەبێ لەسەر پێی خۆیان بوەستن و چاوبەرەژێری بۆ کۆمەکی هیچ وڵاتێک نەکێشن

لەزانستی هەواڵگری دا هەندێک جار هەندێک کاروبار هەبوون کەمەترسی داربوون بەڵام پیاوانی ئاسایش تینوویەتیان بۆ ناسین و زانین ناشکێ لەمەشیاندا ئەزموونیان وەرگرتووە کە ڕابردوو باشترین مامۆستایە

کۆسپی زۆریان لەبەردەم خۆیاندا هەموار کردووە بەڵام مەحاڵە میسر گەرەکی بێ لەجەستەی ئیسرائیل دا چاوو گوێ یەکی هەبێ

**حەسەن سفر و محسین ممتاز** لەو ڕۆژەدا دەربارەی ئەو باسە قسەو باسیان دەکرد کە پێویستیان بەسیخوڕێک هەیە لەدڵی ئیسرائیل دا بژیت تا ئەوان بگەیەنێتە ترۆپکی هەستیارترین هەواڵگری ئەو باسە لە ڕاستی دا یەکەمین جار نەبوو کەلەو ڕۆژگارەدا دەستی پێ کردبێ بەڵکو چەند مانگێک لەمەوبەر بوو بۆ جێگەی لێکۆڵینەوەو مشت و مڕ و هەر یەکەیان بەبێ توانا لەبارەی ئەو باسەوە کەوتبوونە دەمەقاڵەو توێژینەوە ، لەدوای چەند ڕۆژێک ژمارەیەک لەئەفسەران بوونە جێگەی متمانەو سەفەریان بۆ وڵاتە جیا جیاکان پێ کرا ، لەو نێوەندەشدا سەفەرەکەیان هاوکات بوو لەگەڵ ئەو پڕو پاگەندەیە کە گوایە ئەوانە لەوڵاتانی دەرەوە سەرقاڵی گەشت و گوزارو بەفیڕۆدانی پارەی بەیتول ماڵن ، بەڵام سەرەنجام یەکەمین بنکەی هەواڵگری لەچەندان وڵات دا دەستیان بەکار کرد لەوانەش لەجەنگی جیهانی دووەم دا چالاکی نهێنیان ئەنجام دابوو ، هەندێک لەوان ئاشکرا بوو بوون بەڵام هەندێکی تر لەفەرمانگەی نهێنی مابوونەوە یەکەمین هەنگاو لەو جۆرە چالاکیانە دەستی پێ کرد

**حەسەن سفر و محسین ممتاز** سەرەتا قسەیان لەبارەی بەکرێ گرتنی خزمەت کارێکی ئیسرائیلی یەوە کرد بەڵام ئەوان لەجەنگی جیهانی دووەم بینیبوویان کە ستوونی[1] پێنجەمی بەناوبانگی ئەڵمانیا کەلە هەموو کیشوەری ڕۆژهەڵات دا بێ وێنە بوو چۆن

( ١ ) گروپێك کە لەناوەوەی وڵات دا بەنهێنی و ژێراو ژێر بەقازانجی وڵاتێکی دی کاربکەن و زەمینە بۆ سەرکەوتنی خۆش بکەن ، ئەو زاراوەیە لەسەردەمی جەنگە ناوخۆیی یەکانی ئەسپانیادا پەیدا بوو لەساڵی ١٩٣٩ ، کاتێ کە چوار ستوون لایەنگرانی جەنەڕاڵ فرانکۆ بەرەو مەدرید پێشڕەوی کرد فەرماندەکەیان گوتی جگە لەم چوار ستوونە کەبەرەو پایتەخت دەڕۆن ، ستوونی پێنجەمیش لەناو مەدرید دا بەقازانجی ئێمە کار دەکات ئیدی لەو ڕۆژەوە ئەو زاراوەیە لەناو سیاسەتدا جێی خۆی کردۆتەوەو بەکار دێت (فەرهەنگی گۆڤەندو زنار )

ئەو تۆڕە یەک لە دوای یەکە هەرەسی هێنا ، ئیسرائیل بەئاسانی دەی توانی ئەوکارەی ئەوان جیٚ بەجیٚ بکات چونکە لەکۆمەڵگەی عەرەبی لەوانیش میسر خەڵکی جوولەکەی زۆری تێدا دەژین بۆیە دەبی

ئەوانیش لەخەمی هاووڵاتیانی عەرەبی دابن کە پەنا بۆ ئیسرائیل دەبەن تالەویٚ بژین ، لێکۆڵینەوەو وت و وێژەکان لەم بارەوە درێژەیان کێشا هەتا کار گەیشتە ئەو ڕادەیە کەئەوە کارێکی مەحاڵە لەبەر ئەوە ئەو عەرەبانەی کەلە ئیسرائیل دا کاریان دەکرد کەوتنە ژێر گوشاری چاودێریەکی توندەوە ، هەروەها لەناوەندەکانی هەواڵگری سانسۆریان خرایە سەرو لەچوونیان بۆ هەندێک لەمزگەوتەکان قەدەغەکران ، هەرچەندە حەسەن و محسین زیاتر سەرقاڵی باس و خواس دەبوون هەستیان دەکرد کە تەنافەکەی دەوری گەردنیان زیاتر توند دەبیٚ تا کار گەیشتە ڕادەیەک کەهەموو ڕێگەکان بەڕوویاندا داخران ، هەتا بیریان لەوەش کردەوە کە با باوەڕ پیٚ کراوێکی خۆیان لەنێو پەیڕەوانی هەر ولاتێک هەڵبژێرن بەلام بۆیان دەرکەوت کەواش ناتوانن بەشێوەیەکی هەمیشەیی لەئیسرائیل دا بمێننەوەو لێی داکوتن

سەرەڕای ئەوە کە ئەوان بۆ ماڵی دنیا دەستیان لەچەندان کار وەردەدا بەلام هێشتا بەهاووڵاتیەکی ئیسرائیلی دانەدەنران و لەئیسرائیل دا بێگانەو نامۆ بوون ، ئەوان هەر ئەوەندە دۆستی ڕاستەقینەی کەسێکن کە زیاتر پارەیان بداتیٚ ، بەکورتی ئەو شتەی کەباس و خواسەکەی گەیاندە ئێرە چالاکی خۆبەخشێکی لەخۆ بردوو بوو

ئەو بیرکردنەوەیە لەکاتێکدا بەبیریان داهات کەبەتەواوی هەستیان بەلاوازی و بیٚ توانایی دەکرد لەو کاتەدا لەناکاو محسین ممتاز دەنگی بەرزکردەوە.کەسێکی تر جگە لەمن نیە مڕ دەبیٚ بڕۆم حەسەن سفر بەسەرسوڕمانەوە تەماشای دەکرد ، ئەو محسین ممتازی دەناسی ، لەڕیزی ئەو خۆبەخشانە بوو کەساڵەهای ساڵ بوو لەدۆڵی سویس بەریتانیەکانی گێژو سەرسام کردبوو بەبیٚ ئەوەی کەکەسێک سۆراغی هەڵ کات و پێی بزانیٚ ، ئەو داستانەی کە خۆبەخشەکان و ئەوانەی کە محسین ممتازیان دەناسی ، دەیان گێڕاوە کە بوێری و

ئازایەتیەکەی جۆرە بەر بەرەکانیەک بوو لەگەڵ مەرگ و ڕووبەڕوو بوونەوەدا ئەوەش بۆ محسین کەم نەبوو لەسەرەتادا ئەو بیرۆکەیە لەلایەن حەسەن سفرەوە شیاو بوو لەبەر ئەوەی باوەڕی وابوو کە یەکەمین سیفەتێک کە سیخوڕێک دەبێ هەی بێت ئەمەک و وەفاداریە بۆ وڵات ، کەس لە محسین ممتاز بەوەفاتر نەبوو بۆ میسر ئەوان وا ڕادەهێنران کە نابێ کەس بەقسەی جوان و فریودەر خۆی بە دەستەوە بدات و هەڵ بخەڵەتێت و نابێ شتێک لەپێش لێکۆڵینەوەو توێژینەوەدا لەهەر بوارێکدا بێ بەزۆرە ملێ یەکلایی بکاتەوە ، دەست بەجێ بیرۆکەی بڕیاردانی خۆبەخت کەرێک لەناو جەرگەی ئیسرائیل دا بەمێشکیاندا گوزەری کرد ، بەبێ دوو دڵی گۆڕەپان بۆ هەمووان هەموار بوو.

جوولەکەکان لەو سەردەمەدا ڕێژەیان لەمیسردا زۆر بوو لەناو هەموو چین و توێژەکاندا هەبوون ، بازرگان ، سەرمایەدار ، کرێکار ، کارمەند ، قوتابخانە مامۆستا ، دوکاندار دوکانی تەنەکەو و لە دوو ساڵی ڕابردوودا کۆمەڵگاکەیان بوو بەجێگەی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەو مشتومڕ بەشێوەیەک کەدەت توانی یەک بەیەکی ئەوانە بەتەواوی بناسیت ، ئێستا ئەوەی کە پێویست بوو ئەوە بوو کە لەسۆراغی خۆبەخت کەرێک دابن کەبتوانێ دزە بکاتە نێو کۆمەڵگەی جوولەکە نشین لە قاهیرە ئەوە یەکەمین و گرنگترین هەنگاو بوو

چاخانەکەی متاتیا ! محسین هەرای کرد ، چاخانەی متاتیا ، ئەو چاخانەیە کە مۆڵگەی جوولەکەکان بوو ، شوێنی حەسانەوەو کۆبوونەوەیان بوو ، دەیان توانی کارەکە لەو چاخانەوە دەست پێ بکەن

حەسەن سفر سەبارەت بە محسین ممتاز کەفکرە بلاوەکەی ئەویشی پەرێشان کردبوو لاری نەبوو ، محسین ممتاز ناوی ئەو چاخانە مێژوویەی چەندەها جار لەژێر لێوەوە دووبارە دەکردەوە ، وەک ئەوە کە چەندەها ساڵ بێ بیری لەوەکردبێتەوە

ئاسایی بوو کە کەسێک چووبا نێو ئەو چاخانەیە و باسی خۆی کردبا ، داستانی سەرسوڕهێنەری ژیانی خۆی هۆنیباوە لەگەڵ هاو مەزەبانی خۆی ئاشنایەتی پەیدا کردباو کارێکی بۆخۆی دۆزیباوە بەڵام حەسەن سفر بەخۆتێ هەڵقورتاندن لەو جۆرە گفت و گۆو دم بەدمانە ماندوو وبێ تاقەت دیار بوو بەڵام هەرچەندە کە محسین

**ممتاز** زۆر ماندوو بوو ، ئەو هەڵوێستەی **حەسەن سفریش** ماندوو تری دەکرد بۆیە بەسەریدا شیراند

- دەتوانی پێم بڵێی لەبیری چی دای ؟

**حەسەن** بێ ڕاوەستان گوتی

- ئەو ڕۆژەت لەیادە کە ئینگلیزێک جنێوی پێدای ؟

- ئێمە لەکوێ و ئەو ڕۆژانە لەکوێ ؟ !

- دێتەوە یادت ؟

- بەڵێ     باشە ئیتر چی ؟

- چ کرا ؟ !

**محسین ممتاز** لەو مرۆڤە نموونەییانە بوو کەحەزی لەخۆدەرخستن و لووت بەرزی نەبوو ، ژیان لەگەڵ خۆبەخت کەراندا وا تێکەڵی ناخی بوو بوو کە خۆبەخت کەر دوواشت کەبیری لێ دەکاتەوە گیانی خۆیەتی   ئەو ژیانی خۆی دەکاتە قوربانی بەرژەوەندی گشتی ، لەبەرئەوە لەپرسیاری هاوڕێکەی نیگەران بوو   هەرچەندە کەخۆشی ئەو ڕۆژەی دەهاتەوە یاد

لەیەکێک لەکۆمەڵگا بەریتانیەکان لەدۆڵی سویس بەرپرسیارێتی یەک خرابۆ ئەستۆی **محسین** ممتازەوە ، پیلانی چالاکیەکە داڕێژرا ، وا دەهاتە بەرچاو کەلە هەموو ڕوویەکەوە ئامادەکاری تەواو لەبەرچاو گیرابێ   بڕیار وابوو چەند تەقینەوەیەک لەچاخانەکەی یەکێک لە سینەماکانی سویس کەتایبەت بوو بەپەخشی فلیمە دەرەکیەکان و شوێنی هات و چۆی داگیرکەران ئەنجام بدەن ، کارەکە تێک پەڕێندرا

لەسەر بنەمای نەخشەی گەلاڵە داڕێژراو **محسین ممتاز** چۆناو چاخانەکە بەرێکەوت یەکێک لەسەربازە بەریتانیەکان لەمەستیان تلوتلوی لی دەدا   تووشی **محسین** هات بەبێ ئەوەی کەبەرنامەی کارەکە وابێ ، **محسین** دەرگاکەی هەڵ دەناو هیچ بیری لای ئەو نەبوو ، بەزەردەخەنەوە پۆزشی بۆ سەربازە بەریتانیەکە هێنایەوە ، بەڵام سەربازەکە لەگەڵ **محسین ممتاز** دا لێی دا ڕۆی ، **محسین ممتاز** دەی توانی لەسەربازی کەڕیش بگات ، هەرچەندە لەجنێوەکەی بەڕاستی بێزار بوو بوو ، بەڵام کاتێ کەسەربازەکە گوتی   ئەی عەرەبی پەست !    لەو کاتەدا **محسین ممتاز** کاسەی خۆراگری لەسەریەوە ڕژا و بەمست و پێلاقە کەوتە گیانی سەربازە بەریتانیەکە ، دەم

و چاوی سەربازەکە خوێناوی بوو و کەوتە سەرزەوی ، **محسین** پێش ئەوەی کە خەڵکی دەورەی بدەن بێ وچان قوچاندی و ماددە تەقینەرەوەکەشی هەڵ نەگرتەوەو چالاکیەکە بۆ ماوەیەکی تر دواخرا

*　　*　　*

- دەتەوێ بڵێی چی ؟ !

**محسین** دڵی هاوڕێکەی خوێندەوەو زوو لەمەبەستەکەی حاڵی بوو ، لەکاتێکدا کە **حەسەن سفر** چاکەتەکەی دەکردە بەری و خۆی بۆ ڕۆیشتن ئامادە دەکرد گوتی خۆبەخت کردن گونجاو نیە

**محسین** ویستی ڕەخنەبگرێت بەڵام **حەسەن** لێی لە هەڵڵادا

- هەرتۆ ناڵێم **محسین** ! بەڵکو هیچ خۆبەخت کردنێک ئەمڕۆ بەگونجاو نازانم

لەدوای ئەوە وت و وێژو لێکۆڵینەوە کۆتایی هات و هیچ باس و خواس لەگۆڕێ دا نەمان ، بەڵام خۆبەخت کەرێک کە جنێوی ناحەزانی پێ قبوڵ نەکرێت ناتوانێ لەنێو کۆمەڵگای دووژمنان دا بژیت ، لەبەر ئەوە لەوێ شتێکی دەربارەی وڵات و خەڵکەکەی دەبیست کەلە وانەبوو لەڕێگە لای بدەن و ژیانی بخەنە مەترسی یەوە

بێ دەنگی ژوورەکەی داگرت لەدەرەوەی ژوورەکە دەنگی بۆقان دەهاتە بەرگوێ ، **محسین** سەری بۆ لای سەرۆک و هاوکارو هەم هاوڕێکەشی وەر سوڕاندو گوتی : دەتوانی پێم بڵێی بۆچی چاکەتەکەت کردوٚتەبەر ؟

- دەمەوێ پیاسە بکەم

جارێکی تر **محسین** هەوڵی دا جیای بکاتەوە بەڵام **حەسەن** لەکاتێکدا کەبۆ لای دەرگای ژوورەکە دەڕۆی قیژاندی :

- نامەوێ کاربکەم ، ماندوو بووم ! مێشکم هیلاک بووە ، دەمەوێ پشوو بدەم ، هەتا ئەگەر بۆ دوو سەعاتیش بێ

*　　*

**محسین** باوکی کوێخا بوو ، چونکە تاقانەی خێزانەکەی بوو سەیارەیەکیان بۆ کڕی بوو بەو شەوە **محسین** بێ ئەوەی کە ئامانجێکی هەبێ بەجادەو جادەدا لێی دەخوڕی **حەسەن** گوتی دەی بابە بابڕۆین بزانین دنیا لەدەستی کێ دایە ؟

**محسین** لێی دەخوڕی و جادەی دەبڕی تاگەیشتە ناوەڕاستی شار، ئەو جێگەیەی کە گڵۆپەکان هەڵ بوو بوون و خەڵك لەگەرمەی هاتووچۆ دا بوون و سینەماکان و شانۆکان و چێشتخانەکان کرابوونەوەو بڕیاریان دابوو هەرگیز لەو بارەوە قسەیەك نەکەن ، بەڵام پێش ئەوەی کە **حەسەن سفر** لەپەنا **محسین** سواربێ گوتی : **محسین** !

**محسین** کەلە پشت سوکانەوە قنج دانیشتبوو کەمێك بەلایدا چەمایەوە ، **حەسەن سفر** گوتی : هەرگیز نامەوێ لەبارەی کارەکە وشەیەك بگوترێ

بەم شێوەیە ڕۆیشتن تا خۆیان لەجادەی **سلێمان** دا دۆزیەوە ، جادەیەك کەپڕ بوو لە سینەما و فرۆشگای گەورە ، ڕێك لەناوەڕاستی قاهیرە دابوو لەکاتێکدا کەڕوناکی گڵۆپەکان ، ڕەنگ و جووڵەی خەڵکیان لێك جیا دەکردەوە ، گەیشتنە نزیکی سینەمای ئەمریکی یەکان **حەسەن سفر** داهاتەوە لەکاتێکدا کە تەماشای تابلۆی سینەماکەی دەکرد وێنەی پەڕەشووت بازان و سەربازان و چرە دووکەڵی لەسەر تابلۆکە دیت هۆشی لای خۆی نەما گوتی : **محسین** ئارام بگرە ! **محسین** وچانێکی داو ڕاوەستا

**حەسەن** گوتی : با ئەو فلیمە ببینین !!

**محسین** نارەحەت و بێ تاقەت بوو و زیاتر حەزی دەکرد بچێتە چێشتخانە تا خورە خوڕی زگی بێ دەنگ بکات ،بەڵام **حەسەن** لەکاتێکدا کە ئەوی ڕازی دەکرد گوتی :

- ئەدی بەتەما نەبووین کارەکە فەراموش بکەین
- چۆن دەکرێ فەرامۆشی بکەم
- تۆ لەبیری ئەو دایت و سەیارەی خۆت دەئاژۆی بەڵام من دەمەوێ ئەوەیان بنێمە لاوە ، دەبا پشت گوێی خەین ، ئەو سینەمایە فلیمی جەنگی نمایش دەکات وەرە باپێکەوە ببینین .

بەلای **محسینەوە** قسەی **حەسەن** بایەخی خۆی هەبوو ئەوانە ئەفسەرانی کۆنی سووپا بوون ، لەشەڕی فەلەستین دا بەشداریان کرد بوو ، ئێستا فلیمێکی جەنگی بەسە تا بەئاگا بێنەوە

١٥ قروش بابەتی دوو پلیتیان داو لەبەشی دواوەی ساڵۆنەکە دانیشتن

* * *

**عەزیز جەبالی** لەکاتێکدا کە ئیستکانێکی تری لە قاوەی میسری — کە خانم **سمحونیش** حەزی لێ دەکرد — خواردەوەو گوتی قەزاو قەدەر هەندێک شت دەخوڵقێنێ بەبێ ئەوەی کە دەستی مرۆڤی تێدابێ و ناچاری دەکات کەپەیڕەویی لەیاسایەکی دیاری کراو بکات ، شارستانی ڕۆژئاوا بەهەموو پێشکەوتنی ماددیشەوە ئەو مەسەلە گرنگە لەژیانی مرۆڤ دا بەخۆنەویست دادەنێن بەبێ ئەوەی کەباس و لێکۆڵینەوەی وردی لەبارەوە بکەن و بەگرنگی بزانن

فلیمەکە داستانێکی هەڵەنیە ڕاستەقینەی دەردەبڕی کە **حەسەن** و **محسین** ئەوەیان لەکتێبەکاندا خوێندبۆوە ، فلیمەکە سەکۆیەکی سەرسوڕهێنەری هەبوو و ڕووداوەکەو وردەکاریە هونەری یەکانی تەماشاکارانی حەپەساند بوو ,

فلیم ، گێڕانەوەی داستانی بەناوبانگی یەکێک لەچالاکیەکانی دەزگای ئاسایش و هەواڵگری بەریتانیا بوو لە جەنگی جیهانی دووەم دا

نازیەکان بەپاڵپشتی داگیرکەرانەی فەرەنسا کۆشکێک لە کۆشکەکانی فەرەنسایان کە کەوتبۆ دێ یەک هەڵبژاردو کردیانە ناوەندی هەواڵگری کەلە ڕاستی دا ئەو کۆشکە دەتوانرا بەناوەندی بنەڕەتی هەواڵگری و ئاسایشی ئەڵمانیای نازی لەئەوروپادا ناو ببرێ ، چونکە هەموو بەڵگەنامەکان تایبەت بە ستوونی پێنجەمی ئەڵمانیا کەلە وڵاتانی ئەوروپا بوون لەوێ مۆر دەکران

لەو ناوەندەدا هێزەکانی هەواڵگری بەریتانیا کاتێ لەبوونی وەها ناوەندێک ئاگایان بۆوە هەوڵیان دا تابگەنە بنج و بناوانی کارەکەو لیستی تەواوی بەشی سیخوڕانی ئەڵمانیایان بەدەست هێنا بەبێ ئەوەی کە ئەڵمانیەکان لەو دزیە ئاگاداربن ، ئەوان لەکاتیکدا کە ئەو ناوەندەیان لەلایەن سەدەها پاسەوان و سەگی ڕاوچی و دەرندەوە ئابلۆقە دابوو ، بۆ پەی پێ بردنی دەبوایە بەسەر تەل دڕوودا کە پاڵەپەستۆی بەرزی کارەبایان لەسەر بوو پەڕیبانەوە تا بگەنە باڵەخانەی بنەڕەتی ، ئەگەر فیدایی یەکان

توانیبایان لەو بەرزاییە بەش بپەڕنەوە بەڵام دیسان دەبوایە بەبێ خشپەو هەست و خوست بۆ ناو باڵەخانەکە ڕۆیشتبان بەبێ ئەوەی کە کەس هەستیان پی بکات ، پاشان دەبوایە بکەونە ڕێ بەرەو ژوورێک کە سندووق یان گەنجینەی تێدایە تا گەنجینەکە بشکێنن و لیستی بەشەکان و بەڵگەنامەکان لەبەر بگرنەوەو پاشان لەشوێنی خۆیان دابنێنەوە ، هەروەها هەرچی هەیە ببەن و ئەوجار باڵەخانەکە بەجێ بێڵن و بگەڕێنەوە بۆ بەریتانیا

ئەو کارە وە ئەستۆی یەکێک لەئەفسەرە بەریتانیەکان گیرا بوو ئەویش دەست بەجێ کەسەکانی دەست نیشان کردو نەخشەکەی ڕاپەڕاند کۆشکەکەی خستە ژێر چاودێری و لێکۆڵینەوە بەتایبەتی ڕێگەکانی هاتنە ژوور و دەرچوون ، ژمارەی پاسەوانان ، دەلاقە و ڕۆشنایی یەکان شوێنی پشکنین ، ژمارەی نوقتەکانی پاسەوانی ، ژمارەی سەگەکان هتد

لەسەرەتادا ئەو کارەی بەمەحاڵ دەهاتە بەرچاو بەڵام کاتێ خۆی لەبەردەم قۆناغێکی نیشتمانی گرنگ و پیرۆزدا دەدیتەوە کە وڵاتەکەی لەپەتای پڕوپاگەندە دەپاراست ، گوڕو تینێکی تازە تری بەبەردا دەکرایەوە ، بەڵام زۆر جاران بەناچاری مەحاڵەکان دەبنە ڕاستەقینە ئەوەش هەر وابوو

پشکنینەکان ، مەشق و ئامادەکاری پێویست کۆتاییان هات ، تەنها یەک ڕێگر لەبەردەم دامابوو ئەویش مەسەلەی گەنجینە بوو کەلە دەنگ و باس و هەواڵەکانی ڕێکخراوی ئاسایشی هەواڵگری بەریتانیا دا هاتبوو کە گەنجینە زۆر تۆکمەو قایمەو بەرەمزو ژمارەی تایبەت نەبێ ناکرێتەوەو داناخرێ ، هەروەها لەوێ پیاوێکی هەواڵگری بەریتانی هەڵلایەکی هەڵگیرساند کە دەتوانێ خۆی بگەیەنێتە گەنجینە بێ ئەوەی کەکەس هەستی پێ بکات بەڵام چۆن گەنجینەکە بکاتەوە ؟ خۆ ئەگەر بیتەقێنێتەوە ئەوە بەڵگە نامەکانیش لەناو دەچن و بەدەنگەکەشی پاسەوانەکان بەئاگا دێنەوە ، ئەو کات ئەڵمانیەکان دەزانن کەدزیان لێ کراوەو ئەوانیش دەست بەجێ لەڕێگەی فەرمان پێ کراوانی خۆیان بەهەموو دنیادا جاڕ دەدەن کە دزیان لێ کراوەو باری نائاسایی ڕادەگەیەنن و دەڵێن پشکی هەموو مامورانی ئەڵمانی کەوتۆتە بەردەستی سەرانی ( ئینتلیجنت ) ، ڕێگەچارەش کۆمەکی خواستنە لە ( ئیسکاتلندیارد ) ، لە دیدارێکی دا

لەگەڵ سەرۆک ئیسکاتلندیارد ئەفسەری هەواڵگری گوتی پێویستم بەئەفسەرێکی شارەزاو لێزان هەیە بۆ کردنەوەی گەنجینەکە

دیار بوو ئەوە سەبارەت بە اسکاتلند یارد هیچ گرفتێکی نەبوو چونکە ژمارەیەکی زۆرو زەبەندی شک دەبردن کەدەتوانن بەبێ هیچ دەردەسەریەک گەنجینەکانی هەموو دنیا بکەنەوە

فەرمان پێ کردنەکە لەجۆری بەرزترین پلەی نهێنی بوو و لە هەڵڵادانی ڕازەکەش سادە نەبوو بەڵام لەدوای گفت و گۆیەکی زۆرو درێژخایەن ئەفسەری هەواڵگری ڕازی کرا و باسەکەی بە پۆلیسەکە گوت سەرۆک پۆلیسەکە پێکەنی و گوتی :

- هاورێکەم تۆ پێویستت بەکەسێکی لێزان نیە !

ئەفسەری هەواڵگری بەسەرسوڕمانێکەوە تەماشایەکی کردو ڕاستەو ڕاست بەسەرۆک ئیسکاتلندیاردی گوت :

- تۆ پێویستت بەدزێک هەیە

بیرۆکەی سەرۆک پۆلیسەکە زۆر سادە بوو لەو شوێنانەدا دزەکان بەهەستێکی ئاسایشی زیاترەوە کاردەکەن ، چونکە هەموو هەست و زەینی خۆیان بۆ کردنەوەی سندووقەکە دەخەنە کار لەکاتێکدا کە خەڵکی لێ هاتوو لە بوارەکانی تردا وانین

- ئەفسەری هەواڵگری گوتی ئایا دزەکان سۆراخیان هەیە ؟

سەرۆک پۆلیس

- بەڵێ ... لەبەندیخانە

- ئایا دەتوانم بۆ ئەو کارە قەناعەتی پێ بکەم

- هاورێکەم ، ئەوە ئیتر کاری تۆیە نەک کاری من !

سەرۆک پۆلیسەکە ڕاستی دەکرد ، بەڵام سەیرەکە لەوە دابوو کە ئەفسەری هەواڵگری هەوڵی زۆری بۆ ڕازی کردنی دزەکە بەکارنەهێنا چونکە هەر بەوەندە کە بانگێشەی بۆ کرد ڕازی بوو چونکە دەی زانی کە وڵاتەکەی پێویستی پێیەتی ، ئەو سەرەڕای ئەوە کە چالاکی و فەرمانێکی مەترسی داری قبوڵ کرد ، گوێشی نەدا بەوە کە ئەگەر سەرکەوتوو نەبوو دەبورێت و ئەگەر سەریش کەوت دەبی بە هاووڵاتیەکی

بەڕێزی لێ هاتوو ، بەم شێوەیە دزەکە چالاکی یەکانی خۆی بەدابەزینی بە پەرەشووتی ڕزگار کەرو بازدان لەفڕۆکەوە دەست پێ کرد ، بوو بەیەکێک لە کەسایەتیە مێژوویی یەکان کەسانێک کە بتوانن کاری سەرسوڕهێنەرو لەڕادەبەدەر ئەنجام بدەن هەروەها لەدوای ئەمە هەموو سیخوڕەکانی ئەڵمانیای نازی لەئەوروپا کەوتنە داوەوەو ئەوەش وەک شانازیەک بۆ ئەو مایەوە

سەعات لە ۳ ی دوا نیوە شەو نزیک دەبۆوە و هێشتا ئەو سەیارە بچکۆلەیە لەجادەی سلێمان پاشا لەبەردەم یەکێک لە سینەماکان ڕاوەستا بوو هەرچەندە لەناوەوە دوو پیاو و سەگێک لە حەپە نەدەکەوتن .

ئەوان بە ئارامی قسەو گفت و گۆیان دەکرد ، بەشێوەیەک کە پاسەوانێک کە ئەرکی چاودێری وانی لەئەستۆ دابوو ، ورتە ورتەکەشی نەدەبیستن ، چونکە دەرگای سینەماکە داخرا بوو و فرۆشگاکان پشوویان دابوو پاسەوانەکە خۆی لێ نزیک دەخستنەوە تا بەڵکو سەرە داوێک هەڵ کات ، سەرەنجام لە دوای سەعاتێک گومانی لێ کردن و سەرەنجام تاقەتی نەماو کاسەی خۆڕاگریی لەسەریەوە ڕژا ، بڕیاری دا کارەکە یەکلابکاتەوە ، لێیان چۆ پێش و بەسەر سەیارەکەدا چەمایەوەو گوتی

- برادەران شەو باش

- کەسێک لەپشتی سوکانەوە دانیشتبوو ڕووی تێ کردو گوتی :

- شەو باش سەرکار ( ملازم )

پاسەوان بەشەرم و شکۆوە گوتی

- ببورن کارێکتان هەیە کە لێرە وەستاون ؟ !

- بۆ وێنە چ کارێک ؟

- تۆ لە یەکەم شەوەوە لێرەیت و ئێستا سەعات ۳ ی دوای نیوە شەوە

محسین لەکاتێکدا کە تەماشای سەعاتەکەی دەکرد گوتی :

- ئای خوای گەورە تۆ ڕاست دەکەی سەرکار

کاتێک کە محسین سەیارەکەی هەڵ کرد سەعات لە ۳ ی بەرەبەیانی تێ پەڕی بوو ، ئەو لەکاتێکدا کە دەیەویست بڕوات لێکدا لێکدا داوای لێ بوردنی لە پاسەوانەکە دەکرد ، پاشان ئەو دوو هاوکارە دیسان بەناو شەقامەکانی قاهیرەدا سوڕانەوە چونکە بەدوای ئاسۆیەکی تازەو ڕوون دا وێڵ بوون

# بەشی پێنجەم

# بەشوێن ئاسۆیەکی تازەتردا

**هێلن سمحون** لەشوێنی خۆی جووڵەیەکی کردو لەکاتێکدا کە چاوەکانی دەتروسکانەوە گوتی  ئەو داستانە بۆ من زۆر سەیرو سەمەرەبوو ، هەتا ئەگەر لەمەڕ مێردە ڕەحمەتیەکەی منیشەوە نەبوو ، پاشان بۆ **عەزیز جەبالی** ڕوون کردەوە کە هەمان شەو ، کاتێ کە **دوید** دانی پێدانا کە میسری یەو نەک ئیسرائیلی و موسڵمانە نەک جوولەکە ، دەمەویست بەرپەرچی بدەمەوە ، زۆر لێی توڕە بوو بووم ، پێم خۆش بوو نەی بەخشم چونکە **دوید** منی فریو دابوو  بەدرۆیەکانی قەڵس بوو بووم نەک بەموسڵمان بوونەکەی ! ئەو پیاوەی کە ببوو بەهاوسەرم خۆشم دەویست ، دوو منداڵم لێی بوو بوو ، لەناخەوە خۆشم دەویست و هۆگری بوو بووم

سەیرەکە لەمەدا بوو کە هەرچەند **عەزیز** زیاتر درێژەی بە داستانەکە دەدا ، ترپەو لێدانەکانی دڵی **هێلن** زیاتر دەبوو ، ئەو ئێستا کەمێک شەرمەزارە نەک لەبەر شتێکی تایبەت بەڵکو ئەو ڕووداوە سەیرە سەرنجی ئەوی بۆ ناسینی ڕاستەقینەی هاوسەرەکەی ڕادەکێشا ، ڕاستەقینەی **دوید شارل سمحون**

*   *   *

سەر لەبەیانی ڕۆژی دواتر ، **محسین ممتاز** بەفەرمی بەرپرسیارێتی پێ درا کە بەدواداچوون بکات  کارەکە لەسەرەتادا زۆر سادەو ساکار بوو کەلە بنەڕەت دا وانەبوو ، لەوانە بوو بتوانێ لەو بنکەیەدا سەدەها مرۆڤی زاناو دڵفراوان لە شوێنە گومان لێ کراوەکاندا ببینێ ، بەڵام بۆ وەها چالاکی یەکی نهێنی بەدواداچوونی کەسانی لێزان و دڵفراوان کارێکی زۆر ئەستەم بوو بەڵام نەکردە نیش نەبوو

**محسین ممتاز** دەست بەجێ لەهەمان ڕۆژدا جم و جۆڵی خۆی لەشوێنە جیاوازەکانی شاردا دەست پێ کردو بەهۆی ئەمە کە کاری گرنگی تریشی پێ سپێر درابوو بەڵام ئەو بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو ئەرکە گرنگە هەروا لە هەوڵ و تێکۆشان دا بوو ،

هەرچەندە کەنەی دەتوانی هۆکاری بەدوادا چوونی خۆی بەشێوەیەکی ئاشکرادەربڕی. ڕێک وەکو هەمان ئەو شتەی کەلە نێوان پۆلیسی ئیسکاتلندیارد و ئەفسەری هەواڵگری لە فلیمەکە دا ڕووی دابوو ئێمە نەمان دەتوانی گومان ببەین کە ئەو جۆرە کەسانە دەبێ لەکوێوە دزە بکەن

**محسین ممتاز** کەم ئەزمون بوو ، لەهەمان کاتیشدا نەی دەتوانی ئامانجی خۆی بەئاشکرایی بەهەموو کەس بڵێ

ئەو گەنجە لادێ زادەیە دەی زانی کەبۆچی ململانێیەکی سەخت هەنگاوی هەڵهێناوە چونکە ئەو لە کۆمەڵگەیەکی داخراوی وەکو ئیسرائیل دا کاری نەدەکرد بەڵکو لە کۆمەڵگەیکی کراوەدا کە بەپانتایی یەکەیدا جوولەکەو ئەوروپیەکی بێ ژماری تێدان سەرقاڵی کارەکەی بوو ، لە میسردا کۆچبەرێکی زۆر دەژیان ، لەوانەش ئیتالیەکان ، یۆنانیەکان ، فەرەنسی یەکان ، بەلجیکی یەکان ، بەریتانیەکان ، تورکەکان ، هیندی یەکان ، عەرەبەکان ، ئیسپانیەکان ، ماڵتاییەکان و ئەو کۆچبەرانە لەتەواوی کون و قوژبنی ولات دا هەر لەپایتەختەوە تا بچوکترین لادێ بلاو بوو بوونەوە

کێشەیەکی تری ئەو ئەفسەرە گەنجانە ئەوە بوو کە دەبوایە ڕێکخراوێکی قاڵ بووی میسری پێک بێنن کێشەکە لەکەم ئەزموونیانەوە نەبوو بەڵکو لە شێوازی کارەکەیاندا بوو لەگەڵ کەسانی بانگ هێشتراو و ناوبراو و شێوەی دەست نیشان کردنی ڕەزامەندی یەکەیان ، بەلام ئەو شتەی کە کێشەکەی گەورەتر دەکرد بوونی خودی ئیسرائیل بوو کە توانیبووی ڕێکخراوێکی ئاسایشی تۆکمەو کاراو چالاک دروست بکات بەناوی موساد کە شتێکی هاوشێوەی ئاسایشی ئەوروپا بوو نەک تەنها لەسنوری خۆرهەلاتی ناوەڕاست بەڵکو لەهەموو دنیادا چالاک بوو ، بەلام کارابوونی ئەو ڕێکخراوە بۆ سروشتی کاری ڕێکخراوەکە دەگەڕایەوە نەک بلیمەت بوونی ئیمپریالیزم کە تاقمێک لەهەوڵی برەو پێ دانی دان ، هەروەها ئیسرائیلی یەکانیش درۆو پڕو پاگەندە بەجیهان و بەتایبەتی بەولاتە ئیسلامییەکان بلاو دەکەنەوە تا خۆیانی لەڕادەبەدەر پێ بەرنە پێش ، لەکاتێکدا کەهەرگیز وانیەو واش نابێ

لێرەدا **عەزیز جەبالی** لەقسەکردن وەستا ، تەماشایەکی **هێلن سمحونی** کرد ، وەکو کەسێک کە بیەوێت بەرە لەسەر نهێنی یەک هەڵ بداتەوە ، **سمحونیش** شتێکی لەو بابەتەی هەست پێ کرد ، جەختی لەسەر دەکردەوە تا ڕاستی یەکان بدرکێنێ ،

هانی دەدا **عەزیزیش** بە ڕاشکاوی گوتی ناچارم لێرەدا ڕاوەستم و لە داستانێکدا کەدەی گێڕمەوە خۆم بەبینەر دانێم

پاشان درێژەی پێدایەوە بەڵام ناچارین بزانین کە **محسین ممتاز** بەدوای چ دا وێڵە و لەگەڵ چ گیروگرفتێک ڕوو بەڕوو بۆتەوە ، سەرەنجام **ڕەئفەت ئەل هەجان** لەچ هەل و مەرجێکدا جم و جوڵە ترسناکەکەی خۆی دەست پێ کردووە

**هێلن سمحون** متەقی لێوە نەهات و چاوەڕێی بوو تا **عەزیز** قسەکەی خۆی تەواو دەکات .

ئەو **عەزیز جەبالی** لەسەر هەق دەزانی ، بەڵام بەڕاشکاوی نەی دەزانی چی لەناو خۆیدا حەشارداوە ؟ کەسیش نەی دەتوانی پەی بەو ڕازە ببات ! هەرچەندە ئەو ژنە ئەڵمانیە قسەکانی چەندەها جار پێ دووبارە دەکردەوە بەڵام هێشتا دەرەنجامی قسەکانی بۆ دەرنەکەوتبوو ، ئەگەرسەرنجێک لەو کتێبانە کە خودی ئیسرائیلی یەکان ویان ئەوانەی کە بۆیان نوسیون بدەین ، دەگەینە ئەو ڕاستی یە کە ئەو شتانەی دەربارەی زیرەکی و بیرو هۆشی خۆیان دەڵێن زۆر زیادە ڕەویە و ئەگەر قسەکانیان لەگەڵ ڕاستی دا بەراورد بکەین جیاوازی ئاسمان و ڕێسمانە ! بۆ نموونە موساد دەستپێکی کارەکانی خۆی و هەواڵگری و ئەزموون و لێهاتوویە یەکەی لە دەرەوە وەردەگرێت ، ڕێکخراوە ڕەشەکوژیەکانی ئیسرائیل لەپێش ئەوەی کەفەلەستین داگیر بکەن ، هەر کامێکیان خاوەنی ڕێکخراوێکی تۆکمەو نهێنی بوون ، نەک تەنها لەفەلەستین بەڵکو لەدڵی گەلی موسڵمانیش هەر لێرەوە تا کەنداوی فارس چونکە بەهەموو دنیادا بڵاو بوونەتەوەو جاڕیان داوە ئەندامانی ئەو تاقمەش لەهەموو دنیادا نوێنەریان هەبووەو لایەنگرانی خۆیان چەک و چۆڵ و پارەیان داونەتێ ، ڕاستیەکەی ئەو هەواڵگریە لەساڵی ١٩٤٨ دا بۆ ئیسرائیل کەم نەبوو ، لەکۆتایی دا ئەو تاقمە بچوک بچوکانە لەڕێکخراوێکی گەورەدا کۆکرانەوە تا موسادیان لێ پێک هات

سەرەڕای ئەوەش یەکێتی جوولەکەکان لەپێش پێک هێنانی ئیسرائیل دا لەهەموو دنیا نوسینگەو نوێنەریان هەبوو ، ئەو نوسینگانەش لەنێو وڵاتە عەرەبی یەکان کاریان تەنها کۆکردنەوەی زانیاری بوو بەقازانجی جوولەکەکان ، یەکێک لەکارە پڕ مەترسی دارەکان کە ئەوان ( نوسینگەی نوێنەرایەتی ) لەناو جەرگەی قاهیرەدا ئەنجامیان دابوو باڵەخانەی یەکێتی بوو لەشەقامەکانی قصر النیل ، ئەوانە لەماوەی

جەنگی جیهانی دووەمدا چالاکی سیخوڕی بەرچاویان بەقازانجی بەڵێندەران ئەنجام دا کە بەناوبانگترین و مەترسی دارترینیان ، کێشەی سیخوڕێکی ئەڵمانی بوو بەناوی **هانس ئەبلەر** کە ناوە میسریەکەی **حسێن جعفر** بوو چونکە **هانس ئەبلەر** کوڕی ژنێکی ئەڵمانی بوو کە لەگەڵ ڕاوێژکارێکی یاسایی میسری هاوسەرگیری کرد بوو و ناوی بەرەبابی خۆی بەمنداڵەکەیەوە نابوو

**هانس ئەبلەر** لەماوەی جەنگی جیهانی دووەم دا توانی سەرکەوتنێکی سەرسوڕهێنەر بخوڵقێنێ ، ئەو دزەی کرد بە نێو ئەفسەرە بەریتانیەکاندا کە پایتەختی میسر لەو کاتەدا لەوان جمەی دەهات ، چ ئەوانەی کە لەبەرەکانەوە هاتبوونەوەو چ ئەوانەی کە نیشتەجێی ئەوێ بوون یان ئەوانەی کە بۆ ڕۆیشتن بۆ نوسینگەکانی تری جیهان بە قاهیرەدا تێ دەپەڕین ، توانبوویان لەگەڵ یەکێک لەئەفسەرانی هەواڵگری بەریتانیا دۆستایەتیەکی گیانی بەگیانی پەیدا بکەن ، ئەفسەرێک کە دراوسێی ئەو بوو ، ئەڵمانیا توانی لەڕێگەی **هانس ئەبلەرو** هاوکارەکەی **موفکاستەر** کەلە پەیامەکانی بێ تەل دا شارەزا بوو لە بیابانی ڕۆژئاوادا بەفەرماندەیی دومل سەرکەوتن بەدەست بێنێ کە هەڕەشەی لەکیانی بەریتانیا دەکرد لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا

کاتێک کە گەشتیارێکی بەریتانی بەهەڵکەوت ڕێی کەوتە وێستگەی بێ تەل ، ئەو وێستگەیەی کەپەیامەکانی ئەبلەری تۆمار دەکرد ، دیتی وا لە قاهیرەدا سیخوڕێک بەقازانجی ئەڵمانیا کار دەکات ، بەڵام بەریتانیەکان بەهاوکاری یەکێتی جوولەکەکان توانی بووی پەی بەو ڕازە ببات

بەرپرسی جوولەکەکان ژنێکی بەدناو بوو و بەناوی **ئیویت** کە پەیامەکانی دەگەیاندن ، سەرەڕای ئەوە کە **هانس ئەبلەر** کە بە **حسێن جعفر** ناسرا بوو ، ٢٠ لیرەی ئیسترلینگی دایەو ئەوەندە پارەش بۆ ئەو ڕۆژە کەم نەبوو **ئیویت** بەرپرسی یەکێتیەکە گوتی **حسێن جعفر** دەڵێت ئەو میسری یە بەڵام من دڵنیام کە ئەڵمانیە چونکە لەگەڵ هاوڕەڵەکەی بەزمانی ئەڵمانی قسەی دەکرد و زاراوەی ناوچەی سار ی بەکار دەهێنا ، لەکاتێکدا کەزۆر تورە دیار بوو و لەهەمان کاتیشدا پارەیەکی زۆری پێ بوو ، بەرپرسی یەکێتیەکە داوای لە **ئیویت** کرد کە لەگەڵ هاوڕەڵەکەی خۆیان لەگێلی بدەن و قسە لەگەڵ کەسدا نەکەن ، **ئیویتیش** فرمانەکانی بەجێ گەیاندو ڕەخنەی لەژیانی سیخوڕی ئەڵمانی دەگرت ، ئەو هەموو شەوان لەگەڵ سیخوڕە ئەڵمانیەکە

دەچوون بۆ یانە ( نادی ) تا شەوێک گرەوی خۆی بردەوە و توانی جفرەی تایبەتی پەیامەکان دەست بخات ، پاشان هەموو حەشار دراوەکانی یەکێتی جوولەکەکان کەوتە بەردەستی بەریتانیەکان

ئەوە ڕوونی دەکاتەوە کە بەکریٚ گیراوانی یەکێتی جوولەکە سیخوڕەکانی خۆیان بۆ ماڵە بەدناوەکانیش ناردووە ، بۆ نموونە **لیوتیش** سیخوڕێکی بەئەزموون بوو کە لەگەڵ **هانس ئەبلەر** دا خۆیان بەفەرەنسی یەکی خەڵکی لوبنان دەناساندو زمانی فەڕەنسی و عەرەبیان بەچاکی دەزانی هەروەها زمانی ئەڵمانیش بەهەموو زاراوەکانەوە شارەزابوون بەشێوەیەک کە دەیان توانی زاراوەی سیخوڕێکی ئەڵمانی کە سەرو کاری لەگەڵ ناوچەی ( سار ) دا هەبیٚ بناسنەوە ، یەکێتی جوولەکەکان بەتەنیٚ دەزگایەکی ئاسایشی باش بوو هەر لەڕۆژی بنیات نانیەوە ، زۆر ئاسایی بوو کە ئەو جم و جۆڵە پشت بەهاوکاری جوولەکەکانی ولاٚتانی تریش ببەستیٚ ، ولاٚتانی وەک بەریتانیا ، ئەڵمانیا ئیتاڵیا ئەمریکاو و ڕووسیا ( شورەوی ) و هتد ئەوان لەقاڵبی هاوولاٚتیەکی سادەدا بەو ولاٚتانە وەربوو بوون ، بەم شێوەیە کاتیٚ کە ئیسرائیل دامەزرا تووشی سیخوڕانی بەئەزموون بوو کە هەموو قۆناغ و شێوەکانی سیخوڕیان لەدەزگای ئاسایش و هەواڵگری ولاٚتانی تردا بڕی بوو ، بەو مەبەستە موساد لەگەڵ ئەوەی کە لە ساڵەکانی سەرەتای دەیەمی پەنجاکاندا دروست بوو بوو بەلاٚم بەدەزگایەکی تازە هەژمار دەکرا و خاوەنی ئەزمونێکی زۆر بوو لەدوای ئەوە نۆرەی جوولەکەکانی نیشتەجێی ولاٚتە عەرەبیەکان هات تا کاریگەری لەسەر ڕەوەندی ئابوری و کۆمەلاٚیەتی و هەتا سیاسیش دانێن کە یەکێک لە کارەکانیان برەودان بە کۆمەڵگەی جوولەکە بوو

بەم شێوەیە ئەفسەرانی گەنج کە پێکهێنانی دەزگایەکی ئاسایشی ڕێک و پێک و تازەیان لەئەستۆ گرتبوو لەیەک سات دا خۆیان لەبەردەم ڕەقیبێکی کارادا دیتەوە لەبەر ئەوەی موساد پەیوەندی بە دەزگایەکی ئاسایشی بەتوانای جیهانەوە کردبوو ، پەیوەندی یەک کە سەرەتا لەگەڵ ئاسایشی بەریتانیادا دەستی پیٚ کرد ، پاشان دەستی لەگەڵ دەزگای ئاسایشی فەڕەنسا تێکەڵ کرد و سەرەنجام لەگەڵ ڕێکخراوێکی سیخوڕی ئەمریکا ( سیا ) یەکی گرت ، لەسەر ئەو بنەمایە بەلای ئیسرائیلەوە زۆر ئاسایی بوو کەلە دەهەی ٥٠ سیخوڕی بەتوانای وەکو **ئیلی کوهن** ی هەبیٚ ، ئەو لە میسر لەدایک بوو بوو ، کارەکەی لە ئەمریکای باشور دەست پیٚ کرد پاشان بۆ سوریا گوازرایەوە تا

دزە بکاتە ناو کاروباری دەوڵەتەوە ، بەم شێوەیە خۆی لەنزیکی پلەی وەزارەت نزیک خستەوە ، ئەوە تەنها لەبەر بیر تیژی خۆی نەبوو بەڵکو بەهۆی ئەمەوە بوو کە ئەو زۆر لە کۆڕو کۆبوونەوەو داب و نەریتی و فەرهەنگی عەرەبەکان شارەزا بوو ، بەڵام بۆ میسری یەکان ئاستەنگ بوو کە کۆمەڵگایەک بەڕاست بناسن کە لەمەوبەر نەبووبێ و هیچ فەرهەنگ و بنەچەو ڕەسەنایەتیەکی نەبوو بێ ، بۆیە پێویست بوو کە میسری یەکان لەسفرەوە دەست پێ بکەن ، بەڵام کێشەکە تەنها ئەوە نەبوو بەڵکو ئەوان بەدڵنیایی وە دەیان زانی کەچوون بەپیری جەنگێکی ساردی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ، پێویستی بەسیستەمێکی نهێنی و تۆکمە هەیە ، بەتایبەتی لەو کاتەی کە سەدەی ئەتۆم دەستی پێ کردبوو هەموو ڕۆژان سیستەمی کار لەبنەڕەت دا دەگۆڕا و سیستەمێکی دی دەهاتە گۆڕێ ، بەڵام ئەوان چارەیەکیان نەما بوو جگە لەوە کە دەبوا پێشبڕکێ لەڤەرە بووی کات دا بکەن بۆ ئەوەی بگەنە ئەو شتەی کە دەیەها ساڵە لێی دوورکەوتوونەتەوە ، ئەوەش گورو تین و هەوڵی دەویست ئەو کاتە دەیان توانی بەئامانج بگەن ، ئەوەش هەرچەندە سەخت بوو بەڵام مەحاڵیش نەبوو

* * *

پێشەکی لەبەردەم **محسین ممتازدا** چەند پێشنیازێک خرایە ڕوو کە دەبێ بەدوای چ کەسێکدا بگەڕێ ، مەرجی یەکەمیشی ئەوە بوو کە دەبێ میسری بێ و دۆستایەتی و وەفاداریەکەشی تاقی کرابێتەوە

پەروەردەی لادێی فێری کردبێ کە چۆن ئارام بگرێ و لە چاوەڕوانیدا بمێنێتەوە ، ڕێک وەکو جوتیارانی میسری ، کەچەندەها مانگ چاودێری زەویەکانیان دەکەن ، بەم شێوەیە **محسین ممتاز** بەدوای خەڵکی ناسراوی دەست نیشان کراودا بەسەرانسەری وڵات دا گەڕا ، زۆر ئاسایی بوو بەلایەوە کە لەلای خەڵک بیدرکێنێ و ناوی بەرێ ، یان بڵێ بەدوای تەڵەکەبازێک یان دزێک یان بکوژێکی پیشەیی دا دەگەڕێ بەڵام دەستەواژەی « هۆشیارو دڵنەوا » یان زۆر زاناو بەهۆش لە زەینی واندا نەناسرابوو

کەواتە ئەگەر مەرجی یەکەم بۆ وەها کەسێک ، هۆشیاری و نکوڵی کردن بێ ، ئەوە بێ وچان مەرجی دووەم ئەوەیە کە باشتر وایە جوولەکە بێ ، چونکە جوولەکەکانی میسر گوڕوتین و شێوەیەکی تایبەتیان هەیە لەژیان دا

مرۆڤ ناتوانێ جیاوازی لەنێوان موسڵمانانی میسری و مەسیحیەکی میسری دا بکات ، بەڵام جوولەکەکانی میسر خاوەنی دروشمێکن کە ئەگەر کەسێک شارەزاو ئاگاداری کۆمەڵگای میسر بێ ، ناکەوێتە هەڵەوە ، جوولەکەکانی میسر هەر پلەو پایەکی کۆمەڵایەتیان هەبێ و لەهەر چین و توێژێک بن ئەوە لەپەنا زمانی عەرەبی لانی کەم زمانێکی بێگانەش بەتەواوی دەزانن ،لەو ڕۆژگارەشدا زمانی فەرەنسی زمانێکی بەرمێن و زیندوو بووە

لەنێو جوولەکەکانی میسردا بەس دەی توانی کەسێکی وا پەیدا بکات کەبتوانێ بەفەڕەنسی قسە بکات و زمانی سێ یەمیش بزانێ .

هەبوونی ئەو نیشانەو تایبەتمەندیانە بۆ کەسێک کە خولیای بوو شتێکی پێویست بوو بەڵام **محسین** نەی دەتوانی ئەو قسانە بەئاشکرایی بەهەمووان بڵێ ، بەهەمان شێوە کە لە فلیمی ئەفسەری هەواڵگری بەریتانیا پەنای بۆ سەرۆک پۆلیسی ئیسکاتلندیارد برد **محسنیش** لەگەڵ تاقمێک لە برادەران پەنای بۆ ناوەندی پۆلیسخانە برد

ئەو ئەفسەرانەی کەلە فەرمانگەی وریاکردنەوەدا سەرقاڵی کاربوون ، زۆر بە بڕشت ترو جددی تر بوون لەهاوەڵەکانی خۆی کە ئەفسەر بوون – لەبنەڕەتدا دەیەویست کەسێکی لێزان و بیر تیژی پێ بناسێنن – بەڵام مەحاڵ بوو کە هۆیەکەی بەوان بڵێ ، تەنها کارێک کە دەی توانی بیکات ئەوە بوو کە دابنیشێ و بەگفت و گۆو دەمەقاڵە سەرنجی برادەرەکانی بەلای خۆیدا ڕابکێشێ

**محسین** هەر بەوەندەش لێ نەگەڕا سەری بەگشت یانەو چاخانەو گۆڕەپانەکانی وەرزش دا دەکرد بەڵکو ون بووەکەی خۆی بدۆزێتەوە ، بۆ پیاوێکی وەک ئەو ئاستەنگ نەبوو کە جلی سادە بپۆشێ و لە وێنەی کرێکارو لێخوڕو شاگردی چاخانەکاندا خۆی پیشان بدات یان لەگەڵ ناوەندەکان و خەڵکی جۆراو جۆر لەبەرزترین لوتکەی کۆمەڵگاوە تا نزمترین پلە ناسیاوەتی پەیدا بکات

لەگەڵ ئەوەی کەئەو ئەزموونە سەرنجی ئەوی بۆ لای دۆزینەوەی ون بووەکەی ڕانەکێشا بەڵام ئەو جم و جوڵەش بۆ ئەو بێ سود نەبوو ، بەڵکو زیاد لەڕادە بەسود بوو چونکە بۆی دەرکەوت ئەو کەسانەی کە دەگەنە لوتکەی کۆمەڵگا زیاتر بەخەڵکی هۆشمەند ئاشنا دەبن .

سەری لەچەندان نوسەرو کەسی بەتوانا داو گفت و گۆی لەگەڵ زۆر خاوەن ئوتێلی گەورە گەورە و ئەو کۆڕو کۆمەڵانەی کە ناوەرۆکێکی پڕ بەپێستی خۆیان هەیە ساز کرد ، سەیرەکە لەوە دابوو کە ئەو لەنێو ئەو هەموو چین و توێژانەدا سەرەنجام ون بووە بلیمەتەکەی خۆی لەنێو توێژێکی لادێ نشین دا دۆزیەوە

لەیەکێک لەسەفەرەکانیدا بۆ شاری ( صعید ) دیداری لەگەڵ گرووپێک لە تەڵەکەبازو فریودەر و دزدا کردو تەڕ دەستی و لێهاتوویی لێوە دیتن هەر لە ( اسوان ) ەوە تا ( اسکندریە ) ، محسین حەجمینی لێ هەڵگیرا بوو ، لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەڕۆیشت ، بازاڕ و لادێ و شار نەما سەری پێدا نەکات ، خۆی دەخزاندە نێو گەبجاران و سەرمەستان و تەویلەکانەوە ، لەگەڵیان دادەنیشت تا ون بووەکەی خۆی بدۆزێتەوە ، ون بوێک کە نانی لەگەڵ دا دەخوات و ئاوی لەگەڵ نۆش دەکات و شەو و ڕۆژ لەپەنایەتی ، بەناخۆشی یەکانی غەمبار دەبێ و بەخۆشی یەکانی شادمان

بەهەرحاڵ ئەو دەبوایە لەنێوان حەشیمەتێکی ٢٠ ملیۆنیدا وەها کەسێکی هەڵ نابا ئەوە بوو لەیەکێک لەشەوە گەرمەکانی ساڵی ١٩٥٤ واتە سێ مانگ لەدوای دیتنی هەمان فلیمە ئەمریکی یەکە کەبەچاوێکی سەرۆک و برادەرو هاوکار تەماشای کردبوو

لە دوای ڕۆژێک کە لەکارە برست لێ برەکەی گەڕایەوە بۆ ماڵ ، هەوا زۆر گەرم و سوتێنەر بوو ، ئەو شتەی ئەو دەیەویست حەمامێک بوو بەئاوی سارد و پۆشینی جلی فەراح و ئاسودە تا لە دوای ئەو کارە سەختە پشوویەک بدات و بحەسێتەوەو دڵەکەی جێ بەجێ بێت ، خۆی گۆڕی و کاتێ کە دەیەویست پشوو بدات ، زەنگی تەلەفۆنەکە لێیدا کەسێک لەو لاوە بەتەلەفۆن قسەی دەکرد ، یەکێک بوو لەدۆستە چالاک و کاراکانی ئەو ، ئەو کەسە لەبەندیخانەی ( تێ هەڵچوونەوە ) قسەی دەکرد ، لەناوچەیەک بەناوی ( باب الخلق ) کە کەوتبۆ گۆڕەپانی ( العتبة الخضراء ) و قەلآتی ( محمد علي )

هاوەڵەکەی دەی گوت دیاریەکی سەیرم لە لایە ، دەمەوێ بێی بیبینی !

- چۆنە ؟

- نازانم

- وەڵامێکی سەیر بوو ، وای کرد محسین زیاتر خۆی لە باسەکە هەڵقورتێنێ

- یانی چی نازانم ؟

- ڕاستیەکەت دەوێ نازانم !

محسین بەتوڕەیی یەوە کردیە گاڵە !

- نازانی ، بیچمی ، شێوەی چۆنە ؟

- وەرە خۆت ببینە

- باشە ، ناوی چی یە ؟

- نازانم

- تۆ تێک ئەچووی ؟ حاڵت باشە !

- ئێمە چەند ناوێکمان لایە بەلام ناوی ڕاستەقینەی ئەو نازانم

- خەڵکی کوێ یە ؟

- نازانم

دیسان محسین بەتوڕەیی یەوە قیژاندی :

تەماشاکە ( روشدی ) کاتێ کەدەڵێم ...

پیاوێک لەو سەرەوە قسەکەی بڕی و گوتی :

- لەڕاستی دا کەس نازانێ کەئەو موسڵمانە یان مەسیحی یان جوولەکە ؟

- باشە ، برادەر خۆ تۆ بەتەماشاکردن دەتوانیت بزانی .

- هەرگیز سوودی نیە

محسین کەمێک هێور بۆوەو دیسان پرسیەوە

- تۆمەتەکەی چی یە ؟

- نازانم

مەسەلەکە بەلای محسینەوە بەگاڵتەجاڕی دەهاتە بەرچاو هیچ جددی یەکی تێدا نەدەدی ، بەلام هاواری کرد

- باشە ئەدی بۆچی گرتووتانە ؟

- نازانم

- تووخوا ئەوەش بوو بەقسە ؟

- ئاخر چ تۆمەتێکی دراوەتە پاڵ تەڵەکەبازی دەست بڕین دزی تەزویرکردنی بەڵگەنامە بەڵام خەڵکی تریش هەن کەئەو تۆمەتانەیان دراوەتە پاڵ بەڵام نازانم ئەو کامەیانە لەوانە

**محسین** خاوەنی کەسایەتیەکی تایبەت بوو ئەو شتی جددی بەهەوەنتە وەرنەدەگرت ، هەستی دەکرد لەبەردەم مەسەلەیەکی تایبەت دایەو لەوانەیە مرۆڤ هەمان ئەو شتە ون بووە بێ کەئەو بەدوایدا وێڵە ، بەڵام ڕاستەو ڕاست گوتی:

- من دەمەوێ بێم

کاتێ کە**محسین** گەیشتە بەندیخانەی تێ هەڵچوونەوە سەعات لە ۱۰ ی شەوێ تێ پەڕی بوو ، ئەو هەموو شتێکی بەئامادەکراو دەهاتە بەرچاو لەوێ نوێنەری دادوەری و ئەفسەری کارامەو ئەفسەری بەندیخانە و بەڕێوەبەر ئامادە بوون لەکاتێکدا کەسەر گەرمی خواردنەوەی چای میسری بوون ، **محسین** کێشەکەی بۆ دەرکەوت گەنجە گیراوەکە نزیکەی ۲۵ ساڵێک دەبوو ، سوپای بەریتانیا لە لیبیا بە تۆمەتی ئەوە کە ئەو لە جوولەکە هەڵاتووەکانی میسرە گرتبوویان ، ناوی ( **لیوی کوهن** ) ی لەخۆی نابوو ، بەڵام پاسپۆرتێکی دەست کاری نەکراویشی بەناوی ( **جونی برات** ) ( پێ بوو ، کاتێ کەلە قاهیرە پەنجەمۆریان پێ کردووە ڕاگەیەندراوە کەئەو ناوێکی تریشی لێ یەو موسڵمانە ! ناوی **ڕەئفەت سلێمان ئەلهەجانە** ، لەشوێنی تریش ڕاپۆرتی متمانە پێ کراو هاتووە کە ناوبراو لەیەکێک لەئوتێلە گەورەکانی قاهیرەدا کاری سەیرو سەمەرەی ئەنجام داوەو لەوێ پاسپۆرتێکی بەناوی **دانیل مارتان** دەرێناوەو کەهەمان پاسپۆرتیان پێ نیشان داوە بەزاراوەی هاووڵاتیەکی فەڕەنسی ( کەزمانی ئینگلیزی بەچاکی بزانێ ) گوتویەتی ناوی ڕاستەقینەم ئەوەیانە

پاشان لە ئەسکەندەریەوە ڕاپۆرتێکی تر هاتووە ( دیارە لەپاش ئەوە کە لە لیبیا وە دەریان ناوەو هەڵیان داوە بۆ میسر ) ڕاپۆرتی پەنجە مۆرکراوەکەی ئەسکەندەریە دەری خستووە کە ئەو خاوەنی دۆسیەیەو ناویشی **عادل مرقص** ە بابەتەکە زۆر سەرسوڕهێنەر بوو ئەو لێکۆڵینەوانانەی کەلەسەر ئەو ئەنجام دەدران نەگەیشتنە ئەنجامێکی ڕوون و بنەبڕ ، ئەوان لەکۆتایی دا ناچار بوون کەهاوکاری لەپۆلیسی نێو نەتەوەیی لە ئینترپول بخوازن سەرەنجام پۆلیسی نێو نەتەوەیی ڕای گەیاند کەئەو

کەسە لەبەریتانیاو فەرەنساو ئەمریکاو ئەڵمانیاش بەتۆمەتی جۆراو جۆر لەژێر لێکۆڵینەوەو تاقیبات دایە و لەو وڵاتانەش زۆر ناوی لێ یە گەنجەکە کاتێ ڕاپۆرتی پەنجە مۆرکراوی لەقاهیرەوە بۆ هاتەوە دانی پێدانا کە لەوسانە وەختەدا ناوی ڕەئفەت سلێمان ئەلهەجان بووە ، بەڵام ناوە ڕاستەقینەکەی احمد العلایلی ەو لەیەکێک لە لێکۆڵینەوەکانی تر دانی پێداناوە کە موسڵمانە بەڵام پاشان قسەی خۆی خواردۆتەوەو گوتویەتی لەڕاستی دا مەسیحیم بەڵام لە سێیەمین لێکۆڵینەوەدا گوتویەتی بەریتانیەکان هەقیانە کەمنیان گرتووە چونکە من جوولەکەیەکی میسریم و دەمەویست هەڵێم

ئەو شتەی کە لێکۆڵەرەوەکانی سەرسام دەکرد و ئاگرەکەی هەڵدایساند ئەوە بوو کە لەوکاتەدا مەسەلەی دیاری کردنی ڕەگەز لەمیسردا زۆر ڕێک و پێک و تۆکمە نەبووەو سەرنجی زۆری نەدرا بۆیێ ، دوو پاسپۆرتە ئەمریکی و فەرەنسایی یەکە باوەڕ پێ کراو بوون و ئەمریکی بوون یان فەرەنسایی بوونەکەیانی دەسەلماند ، بەم شێوەیە لێکۆڵینەوە لەبارەی ڕەگەزو ئایینی ڕاستەقینەی ئەو نەگەیشتە ئەنجامێک لێکۆڵەوەرەکانیش ئیتر ماندوو بوو بوون ، بەم جۆرە کەوتنە بیری پەیوەندی کردن بە محسین و گوتیان بەڵکو ئەو گەنجە هەمان ئەو کەسە بێ کە محسین چەندەها مانگە بەدوایدا دەگەڕێت

محسین بەسەرنج و دیقەتەوە گوێی بۆ هەموو قسەکان گرت ، پاشان مۆڵەتی خواست کە دۆسیەی تۆمەت بارەکە ببینێ ، دۆسیەکەی دڕاند پاشان داوای لێ کردن تا دانیشتنێکی ئاسایی تر ئەنجام بدەن تا بتوانن بەناونیشانی کارمەندێک یان ئەفسەرێک قسەی لەگەڵدا بکەن .

بەم جۆرە دانیشتنەکە پێک هات ، هەر بەم شێوەیە کە دانیشتنەکانی تر بەئاسایی دەربارەی چەندان باس ڕێک دەخران ، ژوورێک کە دانیشتنەکەی تێدا ڕێکخرا تاڕادەیەک گەورە بوو و لەکەرەستەو شتومەکی زیادە بەتاڵ کرابوو و جگەلە مێزێک و چەند کورسی یەک و دۆڵابێکی کۆنە کە زالکەکەی کرابۆوە و شتێکی تری تێدا نەدەبینرا لەبەرانبەر مێزەکەش دەرگایەک هەبوو کە بەدیوی حەوشەی بەندیخانەکەدا دەکرایەوە ، نوێنەری دادگاو ئەفسەری پۆلیس دانیشتبوون ، محسنیش لەپەنا بەڕێوەبەرەکە دانیشتبوو ئەو ئێستا وەکو یەکێک لەهاوکارانی فەرمانگەکە

وابوو هەموویان جلی ئاساییان لەبەردابوو دیارنەبوو کە کام لەوانە سوپایی یان کارمەندن ، ئەوانیش نەیان دەزانی کە **محسین** چی دەوێ ، ئەو شتەی کە **محسین** دەیەویست ئەوەبوو کە بیریان بڵاو نەبێ و کەسیش لەئامادەبوان گرنگی و بایەخێکی تایبەتی بۆ دانەنرێت ، هەروەک ئەوە کە ئەم کارمەندێکی سادەیە ، لەڕاستی دا زۆری پێ خۆش بوو کەبەهیچ جۆرێک نەبێتە مایەی تێ ڕامان و سەرنجی گەنجەکە بۆ ئەوەی ئەویش بەئازادیەکی تەواوەوە ناخی دەروونی خۆی هەڵڕێژێ بەبێ ئەوەی کەوا هەست بکات کەئەو لەژێر تاقی کردنەوەو توێژینەوە دایە ، تۆمەتیاریان بانگ کرد ، دەرگاکە کرایەوە ، گەنجەکە ڕەشتاڵەیەکی مام ناوەنی بوو ، دەم و چاوی هەڵقرچابوو وەک ئەوانەی لەبەر سووری هەتاو کاردەکەن ، دەم و چاوی بەکەسێکی نامۆ نەدەچوو وەک ئەوە کەدەڵێی لەمەوبەر چەندەها جاری تر بینیوەتی ، سیمای لەنەجیب زادەکان دەچوو بەبێ ئەوەی کە ئەو شێوە ڕوخسارە لەچاوی کەسیاندا مابێتەوە ، لوتێکی قیت و درێژی هەبوو ، لێوەکانی باریک بوون و بە شێوەیەک کە پێ دەکەنی نەت دەزانی کەئەو پێکەنینە گاڵتەجاڕیە یان خۆی لەگێلی دەدات

چاوەکانی لەیەکەم سات دا بەخەواڵوویی دەهاتنە بەرچاو ، وەکو چاوی ئەوانەی کە مادده هۆشبەرەکان دەخۆن ، چەنەگەیەکی درێژی پێوەبوو ، مووەکانی چڕو پڕ بوون ، جلەکانی چڵکن و کۆنە دیار بوون ، وادەهاتە بەرچاو کەلە مێژبێ خۆی نەگۆڕیبێ

لەسەرەخۆ دەجوڵایەوە بەسەر هەنگاوە شلەکانیدا دەکەوتەوە گەنجەکە بەکەسێک کەخۆی بە دەستی چارەنوسێکی نادیارەوە سپاردبێ ، هاتە ژوورەوە دەستەکانی کەلەبچە کرابوون ، زنجیرە ئاسنینەکە لەگەڵ جوڵان دا دەنگێکی لێ دەهات ، لەگەڵ هاتنە ژوورەوەی بێ دەنگی هەموو ژوورەکەی داگرت گەنجەکە چەند هەنگاوێک دوور لەبەردەم مێزەکە ڕاوەستا ، چاوی بەهەموو ئامادەبوان دا گێڕا ، وەک ئەوەی کە هەموو ئەوانە بناسێ و بزانێ لەنێوان ئەوان و ئەمدا چ دەگوزەرێ ، کاتێک کە چاوی بە دەم و چاوی **محسین** کەوت کەلە پەنا بەڕێوەبەر وەک کارمەندێکی ئاسایی دانیشتبوو ، کەمێک حەپەساو سێرەی چاوەکانی لەسەر **محسین** ڕاگرت ، چاوەکانی دەبریسکانەوەو زەردەخەنەیەکی ون لەسەر لێوەکانی نیشت

- هۆی کوڕە وەرە پێشێ !

گەنجەکە هاتە لای نوێنەری دادگا

- بڵێ بزانم ناوت چی یە ؟

دیسان نیگەرانی و دڵەڕاوکێ دەم و چاوی داگرتەوە ، بەدەنگێک کەماندوویەتی پێوە دیار بوو ، پچڕ پچڕ گوتی

- دیسان پرسیار دەکەیەوە قوربان ؟

ئەفسەری پۆلیس شیرڕاندی :

- بەچاکی وەڵام بدەوە سەگباب

گەنجەکە بەبێ لا لێ کردنەوە بوێرانە گوتی

- ئاخر خۆ من پێم گوتی جەناب سەروان[1]

- ئەو کوڕە لەکوێ دەزانێ کەمن ئەفسەرم ! گەنجەکە قاقایەکی گاڵتەجاڕی لێدا کەلە هەموو وەڵامێک باشتر بوو

نوێنەری دادگا دووبارە لێی پرسیەوە

- بەبێ شێر و ڕێوی هێنانەوە وەڵامی پرسیاری من بدەوە ناوت چی یە ؟

- **لیوی کوهن**

نوێنەری دادگا پەڕەکانی دۆسیەکەی دڕاندن و گوتی :

- واتە تۆ **احمد العلايلی** نیت ؟ !

- **علایلی** دیسان کێ یە قوربان ؟ نوێنەری دادگا پاسپۆرتە ئەمریکی یەکەی دمرێناو ڕای دەوەشاند

- بەس بزانم ئەو پاسپۆرتە هی کێ یە ؟

گەنجەکە بەزمانی ئینگلیزی گوتی :

- ئی منە قوربان

- واتە تۆ جونی براتی ؟●

- ئەی باشە ئەو ناوە بۆ لەبەرانبەر وێنەکەی تۆ نوسراوە ؟

دیسان دووبارە نوێنەری دادستان ئەو پەڕانەی کەلەبەر دەمی دابوون دڕاندنی

- باشە **عادل مرقص** یش هەر تۆی ؟ !

[1] پلیەکی ئەفسەریە بەواتای سەروەر یان پێشەوا دێت .

- ئەو لە ئەسکەندەریەیە

- ئەدی ڕەئفەت ئەلهەجان کی یە ؟
- قوربان من لەخزمەتتـر دا عەرزم کردی کە ئەوە ناوی منە ، ئامادە نی قبوڵی بکەی ؟ !
- واتە تۆ مسوڵمانی ؟
- خوای تاقانەم قبوڵە
- موسڵمان و ناوەکەت لیوی کوهن ؟ !
- دین بۆ خواو نیشتمان بۆ هەمووان
- گاڵتەجاڕی وەگەڕ دەخەیت سەگباب ؟
- خۆ دروشمی شۆڕش نیە کە لەسەر دیوار نوسرابێ ؟
چرکەکانی کات لەوەستان نەدەکەوتن یەک سەعات و نیو بوو کە دانیشتنەکە دەستی پێ کردبوو
ئەو ڕاپۆرتە دەڵێت کە تۆ ئەمریکی و ئەو یەکە دەڵێت فەرەنسایی و ئەو دۆسیە دەڵێت میسر وڵاتی ڕاستەقینەی تۆیە!
- زەوی خوا فراوانە
کاسەی حەوسەلەی نوێنەری دادگا لەسەریەوە ڕژا و نەڕاندی
- واتە خۆت نازانی کێی ؟ حەسەن ... مرقص یان کوهن ؟
هەموو لە پێکەنینان ئاوەژوو بوونەوە ، دەنگی نەڕەی نوێنەری دادگا هەروا دەبیسترا
ئامادەبوان لەدانیشتنەکەدا پێ دەکەنین وەک ئەوە دەچوو کە بیانەوێ نمایشێکی شانۆیی هونەرمەندی بەناوبانگی میسری نجیب ریحانی تەماشا بکەن لەدوای چەند خولەکێک پێکەنین تۆمەتبار کەسەری خۆی بەردابۆوە سەری بەرز کردەوە و قەدە چەماوەکەی ڕاست کردەوە ، لەناکاو چاوە خەواڵوەکانی تروسکانەوە ، بەلای محسین دا ئاوڕی دایەوە ، وەک ئەوەی کە بووبێتە مرۆڤێکی تر
چەندەها سەعات چاوەڕوانی کرد بەڵام شوێنەواری ماندوێتی لەڕوویدا دیار نەبوو ، لەو کاتەدا گوتی
- ئەو جۆرە دانیشتنانە تامێکی تریان هەیە
ئەفسەری پۆلیس ویستی بکێشێ بەسەرو گوێلاکیدا بەڵام ، ئەو درێژەی پێدا

- بەم جۆرە ئیتر پێویستم بەکۆت و زنجیرو کەلەبچە نیە

ئەوەی گوت و کەلەبچە بەستراوەکەی لەبەرچاوی هەموان کردەوەو لە کاتێکدا لەخۆشیان سەمای دەکرد هاتە بەردەم مێزەکەو شتەکانی لەسەر مێزەکە فڕێ داو زەردەخەنەیەکی هاتێ ، لەو کاتەدا **محسین ممتاز** لەسەر کورسی یەکەی خۆی جێ گۆڕکێی کرد

ئەفسەری پۆلیس هەستاو تەماشای کەلەبچەکەی کرد کە گوایە هێشتا باوەڕ ناکات کە گەنجەکە لەو دەم و دەستەدا و لەبەردەم هەمووان کەلەبچەکە بکاتەوە

گەنجەکە پێکەنی و ئەفسەرەکە هەروا لە کەلەبچەکەی دەڕوانی بەڵام کەلەبچەکە داخرابوو !

بەرەو لای گەنجەکە گەڕایەوە بەڵام گەنجەکە بەئەسپایی بانگی کردو گوتی :

- ئیدی چیت لەکیسەکە دایە مارگر ؟

ئەفسەرەکە گوتی : دەتوانیت کارێکی تر بکەیت ؟

- سکەیەکت هەیە ؟

- دەتەوێ کڵاو بنێیە سەرم ؟ سەگباب

- خۆ من ناتوانم لەدەست تۆ هەڵێم

ئەفسەری پۆلیس سکەیەکی گەورەی کۆنی سەوزی لەگیرفانی خۆی دەرێناو گەنجەکە وەری گرت و ئاماژەی بۆ لای دۆڵابەکە کرد لەو سەری ژوورەکە

- لەپشت دۆڵابەکە ١٠ چرکە ون دەبم ... پاشان ئێوە سکەکە بدۆزنەوە

مەسەلەیەکی سەرسوڕهێنەر بوو ئێستا شانۆیەکی خۆنەویست لەنێوان گەنجەکەو ئەفسەرەکەدا نمایش دەکرێ ، تەماشای یەکتریان دەکرد ئەفسەرەکە بۆ شوێنی خۆی گەڕایەوەو ئاماژەی بەگەنجەکە کرد تا دەست پێ بکات گەنجەکە بۆ لای دۆڵابەکە ڕۆیشت و گوتی سکەکە لەلای منە بەڵام هیچ کەس ناتوانێ بیدۆزێتەوە

ئەفسەری کارامە خەندەیەکی گاڵتە جاڕانەی هاتێ و ڤیت بۆوە دوبارە پێکەنینی ئامادەبووان دەستی پێ کردەوە ئەفسەرەکە کون و قوژبنی جلەکانی گەنجەکەی پشکنی ، چەند خولەکێک تێ پەڕی بەبێ ئەوەی کە ئەفسەرەکە بتوانێ سکەکە برفێنێ ، لەو کاتەدا ئەفسەری پاسەوانی بەندیخانەکەش بڵند بوو و پێکەوە

پشکنیان ، ئەوانیش بەدیقەتێکی وردەوە کەوتنە گەڕانی ، کونێکی لە چاکەتەکەی دابوو ئەوەندە دەستیان پێداکرد هەتا چاکەتەکە دڕا ، تەماشای جلەکانی ژێرەوەشیان کرد بەلاّم شتێکیان نەدۆزیەوە ، گویّ و لوت و زاریشیان پشکنی دیسان هیچیان دەست نەکەوت ، ئەو کارە جادوگەریە هێندە بەلای ئەوانەوە ئەستەم بوو ، بۆیە ئەفسەری بەندیخانە گوتی

- باشە سکەکە لە کویّ یە ؟

گەنجەکە زاری هەڵدڕی ، دوو ددانی دەستکردی کەلە شەویلگەی خوارەوە دابوو دەرێناو سکەی گۆڕین لەبن ددانەکاندا وردو خاش بوو بوو ، پاشان لەبەردەم چاوی ئامادەبووان دا لاسکەکانی یەک لە دوای یەک کردەوە ، ئەو سەین و بەینە ماوەیەکی زۆری خایاند  لەو ماوەیەدا گەنجەکە زۆر کاری سەرنج ڕاکێش و جادو ئاسایی ئەنجام دا ، بەلاّم سەیرەکە لەوەدابوو کە ئەو زۆر بەڕێزەوە قسەکانی دەکرد ، دەت گوت لەناو خێزانێکی بەڕێزدا گەورە بووە

گەنجەکە هەر کارێکی کە ئەنجامی دەدا ڕاڤەی دەکردو لێکی دەدایەوە و بنچینەو فێڵەکانی باس دەکرد ، وەکو ئەوە کە هاوکاری وان بیّ ، لەناکاو هەموو ئەو پەردانەی کەلە نێوان ئەم و ئەواندا بوون هەڵدرانەوە ، کات دەهات و تیّ دەپەڕی ، پیّ دەچوو کە کوڕەکەیان دۆستانە بیّ ، پاشان لێک جوودابوونەوە و شەو گەیشتە نیوە بەبیّ ئەوەی کە کەسێک بزانیّ ئەو گەنجە کیّ یە ؟ **حەسەن مرقص** یان **کوهن** ؟ ئایا میسری یە یان فەڕەنسی و یان ئەمریکی ؟ ئایا موسڵمانە یان مەسیحی یەو یان جوولەکەیە ؟

کاتی دانیشتنەکە کۆتایی هات ، **محسین ممتاز** بەهاوڕیّ ئەفسەرەکەی خۆی گوت  وابزانم ئەو گەنجە بۆ ئەو کارەی کە دەمانەویّ گونجاو بیّ ؟ پێویستی بەلێکۆڵینەوە و تیّ فکرینی زیاتر هەیە  لێی دا ڕۆیشت و بەناخی ئەو مرۆڤە سەرسوڕهێنەرەدا ڕۆچۆ خوار ، لەسەرەتادا وای دەهاتە بەرچاو کە چارەنوس دیاریەکی بەنرخ و کەسایەتیەکی نموونەیی بۆ هێنابیّ ، بەدڵنیایی یەوە ئەو میسری بوو و پێست و گۆشت و خوێنیشی میسری یە بەلاّم سودی لەتایبەتمەندی و کلتوری جوولەکەکانی میسر بینیی بوو ، ئەو زمانی فەڕەنسی وُ ئینگلیزی بەباشی دەزانی ، بەو قەدو بیچمە جەربەزەیەی و بەو توانا بیّ وێنەیەی کەهەی بوو دەیتوانی خۆی وەک یەکێک لەخەڵکی

باشوری فەرەنساو لێوارەکانی بەندەری فارس پیشان بدات یان تولون ، لە لایەکی ترەوە دەی توانی خۆی وەک کوڕی یەکێک لەعەرەبەکانی دانیشتووی بەریتانیا لێ بکات ، بۆ نموونە باوکی لەگەڵ ژنێکی بەریتانی هاوسەرگیری کردووەو لەدوای ئەمە ئەو ناسنامە بەریتانیەی وەرگرتووە گەنجەکە بەڕاستی عەنتیکە بوو و بەڕواڵەت زۆر گونجاو دەهاتە بەرچاو

بەڵام ئایا لەڕووی کەسایەتیشەوە گونجاو بوو ؟ ئەگەر گونجاویش بێ ئایا خۆشی ئەمەی قبوڵە ؟ وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارانە کارێکی ئاسان نەبوو ، چونکە وای پێویست دەکرد کە دەبوا محسین ئەو گەنجەی لەنزیکەوە ناسیبا ، پێویست بوو هەڵس و کەوتی لەگەڵدا بکات و لەگەڵی هەڵستێ و دانیشێ و گفت و گۆو وت و وێژی لەگەڵدا بکات و لەبوغرایی یەکەی بکۆڵێتەوەو بچێتە ناو دەروونی و دڵی لێ وەرگرێ ، خوڵق و خووە بنەڕەتیەکەی بناسێ و لەپێش هەموو ئەوانەشدا پێویست بوو کە بنەچەو ڕاستەقینەکەی بناسێ کە ئەو کێ یە ؟ ئایا ئەو جونی براتە ؟ یان دانیل مارتان یان احمد العلایلی یان ڕەئفەت عەلی سلێمان ئەلهەجان یان عادل مرقص ؟ ! بەس دەبوایە ئەو متمانە بەخۆی پەیدا بکات کە ئەو حەسەنە یان مرقص یان کوهن !

* * *

دوو هەفتە بەسەر ئەو شەوەدا تێ پەڕی بەبێ ئەوەی کە محسین شتێک دەربارەی ئەو گەنجە لە هاوڕێ ئەفسەرەکەی بپرسێ ، ئەفسەرەکە دڵنیا بوو کە محسین بۆچوونی خۆی سەبارەت بەو گەنجە گۆڕیوە ، دیار بوو کەهەموو خەڵکی ناو ژووری بەندیخانەی تێ هەڵچوونەوە هیچیان دەربارەی گەنجەکە نەدەزانی و پاشان بەتەواوی پشت گوێ خرا وەکو هەزاران هەزار کەس کە تووشی ئەو حاڵە دەبن و پاشان وێنەیان لەبەرچاوان ون دەبێ ، لەدوای ماوەیەک بەهۆکارێکی نادیار فەرمانی گواستنەوەی گەنجەکە بۆ بەندیخانەی ناوچەی حەزرەتی زەینەب دەرکرا بەڵام سەیرەکە لەوە دابوو کە دۆسیەکەی ئەو هیچی لەخۆ نەگرتبوو و وەک ئاوی زوڵاڵ وابوو ، بۆچی ئەو لەبەندیخانەی تێ هەڵچوونەوە بۆ ئەو بەندیخانەیە دەگوازرێتەوە ؟ ! بەڵام کاتی کە فەرمانێک دەربارەی گواستنەوەی ئەو بۆ بەندیخانەی میسری تازە دەرکرا ،

فەرمان پێ کراوی بەندیخانە دەست بەجێ گواستیەوەو هەموویان لەخۆشیان خەنی بوون چونکە لەشەڕی ئەو نهێنی یە قوتاریان بوو

گەنجەکە دەربارەی بەڵگەکانی گواستنەوەی خۆی لەبەندیخانەیەکەوە بۆ بەندیخانەیەکی تر دەی پرسی بەڵام کەس نەبوو وەڵامێکی دروستی بداتەوە بۆ خۆشی دیسان وەڵامێکی دەست نەدەکەوت

گەنجەکە لەبەندیخانەی میسری نوێ یەک هەفتەی تەواو مایەوەو لەدوای ئەوە گوازرایەوە بۆ بەندیخانەیەکی تر لە جیزە ، بەڵام لەوێش وەکو بەندیخانەی ناوچەی حەزرەتی زەینەب و میسری نوێ ، دیسان دۆسیەکەی و گومان و تۆمەتەکەی نادیار بوو کاتێ کە گەنجەکە لەتۆمەتەکەی خۆی دەپرسی وەڵامێکی دڵنیاکەری نەدەبیست ، لەدوای سێ ڕۆژ بڕیارێکی تازە لە بەندیخانەی جیزە وە دەرچوو لەمەڕ ئەوە کەدەبێ دەست بەجێ بۆ بەشی تایبەتی بەندیخانەی زەیتونە بگوازرێتەوە گەنجەکە گەیشتە بەندیخانەی زەیتونە لەناوچەی زەیتونە کە گەڕەکێکە زۆر لەقاهیرەوە دوورەو دەڵێی لەشارێکی ترە ، لەسەعات ۱ ی دوای نیوەڕۆ گەیشتە وێ ، بەڵام ئەو جارەیان حەواڵەی بەندیخانە نەکرا بەڵکو وەک دەست بەسەرێک بەکاتیی هێڵدرایەوە ، لەکاتێکدا کە کەلەبچەی لەدەستی دابوو تا تەسلیمی نوێنەری دادگای بکەن بەڵام نوێنەری دادگا ڕۆژێک لەدوای گرتنەکە هات گەنجەکە ئەو شەوە لەهەمان ژووردا لەسەر تەختەدارێک خەوت ، کاتێ کەچۆ بەردەم نوێنەری دادگا چاوە خەواڵوەکانی بۆ هەڵنەدەهاتن ، لەبەردەم نوێنەری یاسایی ڕەق ڕاوەستا

ئەو ئێستا ئامادە بوو کە سزای دۆزەخ بچێژێ بەڵام لەو سەرگەردانیە ڕزگاری بێ ، لەپڕدا بەهۆی ئەوە کە نوێنەری دادگا ئەوی بینی بەتوندی فەرمانی بەپاسەوانەکە کرد کە کەلەبچەی لەدەستی بکاتەوە ۲٤ سەعات بوو کە دەستەکانی کەلەبچە کرابوون ، گەنجەکە لەناو ترسێکی نادیاردا هەستی بەئارامی دەکرد ، کاتێ چاوی بڕیە نوێنەری دادگا و ئەویش گەنجێکی تازە کاربوو ، واپێ دەچوو کە تازە کۆلیژی تەواو کردبێ و کەم ئەزموون بێ ، نوێنەری دادگا دەیەویست ناوەڕۆکی دۆسیەکەی بدڕێنێ و قسەی هەڵیت و پەڵیتی بەسەر زمان دا دەهات بێ وچان سەری بەرزکردەوەو لەگەنجەکەی پرسی

- تۆ احمد العلایلیت ؟

گەنجەکە ویستی قسە بکات ، بەڵام نوێنەری دادگا بەخۆ نواندنێکەوە و وەکو ئەوە کەبیەوێ بەهەر نرخێ بێ لەشەڕی ئەو دۆسیەیە ڕزگاری بێ ، لەکاتێکدا کەلەسەر لاپەڕەکانی دۆسیەکە شتێکی دەنوسی بەدەنگێکی بەرز گوتی بەدانی ۲۰ لیرە ئازاد دەکرێی

گەنجەکە کە ئەوەی بیست باوەڕی نەدەکرد ، شادیەکی سەیر دای گرت و گوتی

- ئێستا ۲۰ لیرە لەکوێ بێنم ، من کە هیچم نیە

نوێنەری دادگا بەدڵتەنگی و نارەحەتی یەوە سەیری کردو لەو کاتەدا لە پشت سەری گەنجەکە دەنگێک هاتەبەر گوێ :

- سزا ئامادەیە جەنابی

گەنجەکە لەپڕدا ئاوڕی دایەوە ، حەپەسا ، وەکو کەسێک کەزەبرێکی لەسەری درابێ ، **محسینی** دیت کەلە بەردەمی ڕاوەستاوەو تەماشای لێکۆڵەرەوە دەکات و ئەویش بەنا بەدڵی لە **محسین** دەپرسێ

- ئێوە چی ئەون ؟

- خاڵۆزا

- چ لەبارەی سزاکەوە دەزانی ؟

**محسین** پارەی لەگیرفانی دەرێناو گوتی :

- قوربان ئەوە یەکەم جاریشی نیە

نوێنەری دادگا لە کاتێکدا کە شتێکی لەسەر پەڕەکانی دۆسیەکە دەنوسی

**محسین** گوتی :

- بەڵێ بەڵام ئەوە دوایین جاریەتی قوربان ئەوە دوایین جاریەتی

نوێنەری دادگا وەڵامی نەدایەوە و سەرقاڵی کاری خۆی بۆوە ، لەکاتێکدا کە گەنجەکە وڕو کاس دەهاتە بەرچاو ، **محسین** لەڕقان پێی گوت

- تاکەی دەتەوێت ئابڕوی ئێمە ببەی

نوێنەری دادگا **محسینی** بانگ کرد

- لەدەرەوە بانگت دەکەن لێرە نا دەی فەرموو بۆ دەرەوە تۆو ئەو

ئەوەی گوت و زەنگەکە لێیدا ، پاسەوان هاتە ژوورو نوێنەری دادگا گوتی :

- ئەو دوانە ببەن تا سزاکە تیٚ کەن

گەنجەکە لەیەکەمین سات دا محسینی ناسی ، ئەو شەوەی ناو بەندیخانەی تیٚ هەڵچوونەوەی وەبیر هێنایەوە کە شەوێک ئەوی لەبەندیخانەیەکەوە بۆ بەندیخانەیەکی ترو لەخانەیەکەوە بۆ خانەیەکی تر گواستنەوە بەبیٚ ئەوەی کە هۆیەکەی بزانیٚ ویستی قسەیەک بکات بەڵام دەم و چاوە چرچ و لۆچەکەی محسین بوونە ڕێگری ، پاسەوان بەمستەکۆڵە وەپێش خۆی دا تا پارەی سزاکە بدات گەنجەکە جگە لە خۆبەدەستەوەدان چارەیەکی تری نەبوو بۆ چارەنوسە نادیارەکەی ، کارەکە ئەنجام دراو گەنجەکە ئێستا لەگەڵ محسین ممتاز لەدەرەوەی بەندیخانەن بەڵام باوەڕی نەدەکرد کە بەربووە ، چەند هەنگاوێک لەولاتر محسین وەکو کەسێک کە بیەویٚ سەیارەیەک بکڕیٚ لەدەوری هەڵات پاشان بەتوندی بەگەنجەکەی گوت :

- سواربە

گەنجەکە لەپەنا محسین سوار بوو ، دەمت گوت سەیارەکە بۆ بیچمی ئەو گچکەیە سەیارەکە بۆ شوێنێک دەڕۆی کە گەنجەکە نەی دەزانی کویٚ یە ، سەری خۆی بەردابۆوە ، پاش کەمێک سەری هەڵبڕی و لەمحسینی پرسی

- قوربان جگەرەت پیٚ یە ؟

محسین پاکەتە جگەرەکەی لەگیرفانی دەرێناو بەبیٚ ئەوەی کە قسەیەک بکات ، لەبەردەمی داینا

گەنجەکە جگەرەیەکی پیٚ کردو کاتیٚ ویستی قسەیەک بکات ، چاوەکانی محسین زاری بەست و لەهەمان کات دڵنیای کردەوە کە مۆڵەتی قسەکردنی نی یە

محسین سەیارەکەی خۆی لەناوچەیەکی ئارام و دوور کە کەوتبۆ جادەی نێوان میسری تازەو قاهیرە لەژێر درەختێکدا ڕاگرت کە بەدرێژایی جادەکە ڕوێندرا بوون .

گەنجەکە بیٚ دەنگ بوو و قسەیەکی نەکرد تەماشا کردنەکەی محسین هەروا ڕکابەرانە بوو بۆیە گەنجەکەش بیٚ دەنگ بوو

محسین ڕووی تیٚ کردو بەدەنگێکی نەرم گوتی ئێستا من دەمەویٚ تەنها یەک شت لەبارەی تۆ بزانم

گەنجەکە گوتی

- قوربان چ شتیٚ

# بەشی شەشەم

# دۆستێکی گیانی بەگیانی بەڵام هەتا بڵێی بێ بەخت

خانم **سمحون** گوتی   هەست دەکەم مێژوو دووبارە دەبێتەوە ، **عەزیز جەبالی** دەستی هەڵگرت و جاڕدرا کە بۆ خواردن ئامادەبن ، شتێک کەلە هەموو شتان زیاتر سەرنجی **سمحونی** بەلای خۆیدا ڕادەکێشا زەین ڕوونی و بیر تیژی **عەزیز جەبالی** بوو چونکە ڕووداوەکەی بەوردی تۆمارکردبوو ولە زەینی دا هێشتبوویەوە ، هەروەک ژیانی لەگەڵ واندا بردبێتە سەر

نانی نیوەڕۆ بریتی بوو لەخواردنی ماسی و پەتاتە کەبەشێوەیەکی فەرەنسایی سوورکرا بۆوە ، هەروەها عەلاگەیەکی پڕ لە زەلاتەی تازەو پێش خۆرێکی پڕ لە گۆشتی سارد لەگەڵ سەوزەو پەتاتەی وردکراو لەپەنای دانرابوون

کاتێ کەبڕیاردرا بۆ ژوورەکەی تر و بۆ سەرمێزە بچکۆلەکەی نان خواردن بڕۆن، خانم **سمحون** حەزی دەکرد کە هەر لەهەمان ژووردا خواردن بخوات تا پاشکۆی داستانەکەببیستێ،خانم **سمحون** بەهەمان شێوەکەلەسەرسفرە دانیشت،پێکەنی وگوتی

- بەدڵنیایی یەوە تۆ دەزانی کەمن حەزم لە چ خواردنێکە

**عەزیز** بەشەرمەوە پێکەنی و وەڵامی نەدایەوە بەڵام خانم **سمحون** درێژەی پێدا

- ئەگەر کەسێک ڕۆژێ لە ڕۆژان بەمنی گوتبا کە ڕۆژێک دەبێ تۆ نان لەلای ڕێکخراوەکانی ئاسایشی جیهان دەخۆی ، بەشێتم دادەنا

**عەزیز** بەدەنگێکی نزم و تێکەڵ و پێکەڵ ورتە ورتێکی کرد

- خانم   ژیان گەورەترە لەوە کە ئێمە بتوانین هەمووی بزانین

گەنجەکە خواردنەکەی لەسەر مێزەکە بەجێ هێشت ، بیچمێکی دێهاتی هەبوو ، دەت گووت لەکێڵگەیەک ڕاهاتووە ، لەکاتی وت و وێژدا بیرێک بەدڵی خانم **سمحون** داهات ، بەڵام بەچاکی نەزانی قسە بە **عەزیز** ببڕێ ، دەستی لەخواردن کێشایەوە ، **عەزیزیش** دەستی کێشایەوە ، **سمحون** پرسی

- تۆ بەدرێژایی ڕووداوەکە لەکوێ بووی ؟ !

- لەبەرەی سنوری فەلەستین و میسر بووم

عەزیز درێژەی پێدا

( ستوان ) [1] بووم لە سوپای میسر ( درێژەی پێدا )

لەجەنگ دا دۆخێکی تر هەبوو

عەزیز بۆ ماوەی چەند خولەکێک بێ دەنگی هەڵبژارد ، هەندێکی تر دەربارەی پێداویستی یەکانی گەشتوگوزاری میسر قسەی کرد و ئەوەش بۆ خانم سمحون زۆر جێی تێ ڕامان بوو ، دوای ساتێکی تر عەزیز جەبالی گەڕایەوە سەر داستانەکەی

* * *

محسین و گەنجەکە هێشتا لەژێر سێبەری دارەکە دانیشتبوون ئێستا هەردووکیان لەیەکتریان دەپرسی تۆ کێی ؟ !

محسین دەیەویست بزانێ کە ئایا گەنجەکە لەگەڵیدا ڕاستگۆیە یان نا ؟

محسین دەبوایە وەک ڕاهێنەرێکی باخچەی ئاژەڵان کە ئاژەڵی دڕندە ڕام دێنێ ڕەفتار بکات ، ڕاهێنەری باخچەی ئاژەڵان دەنگی دێنێتە سەر شێوەی قامچی و ئاژەڵەکەی پێ دەترسێنێ بەبێ ئەوەی کە قامچیەکە بەر لەشی ئاژەڵەکە بکەوێ بەڵام ئەگەر ئاژەڵەکە زەبری قامچیەکە بچێژێ ئەوە لەگەڵی ڕادێ و کارەکە لێرەدا کۆتایی دێ

* * *

ئاخر گەنجەکە یەکەم جاری بوو کەلەبەردەم کەسێکی بێ ناسنامەدا دەستە پاچە دەبێ لەبەرخۆیەوە دەی گوت ئەو پیاوە بەو بیچمە ڕاستەقینەو ئەو زەردەخەنە ئەفسوناویە کێ یە ؟ ئەو پیاوە کە لەبەندیخانە قوتاری کردو دووبارە ژیانی بەبەردا کردەوە ، کێ یە ؟ کەدەی بینێ نایناسێ و ناویشی نازانێ کارەکەی نازانێ و هەتا نازانێ چی لێ دەوێت ؟ گەنجەکە لەگەڵ ئەو هەموو لێ هاتوویی و ئازایی و بەرچاو ڕوونیەی خۆی داوای هاوکاری کرد ، دەست بەجێ زانی کەئەو ئەفسەرە بەڵام چ جۆرە ئەفسەرێک ؟ سەری سوڕما کەدەی دیت لەپەنای دادەنیشێ و سواری سەیارەی دەکات بەبێ پاسەوانی و بەبێ هەڕەشەو چاو لێ سوور کردنەوە گەنجەکە

(1) پلەبەکە لە پلەکانی ئەفسەری بەواتای ڕاست و دروست و ئەمین دێت .

لەبەرخۆیەوە کەوتە بیرکردنەوە   ئێستا بەئاسانی دەتوانم دەرگای سەیارەکە بکەمەوەو بە تیژ ڕەویەک کەبە خەیاڵی کەس دا نەهاتبێ هەڵێم  بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا وای نەکرد   نا نا هەڵ نایێم بزانم ئەو کابرایە چی دەوێ لێم !

- بەڵێنت پێ دەدەم کەهەموو شتەکان لەکاتی خۆیدا دەزانی ، ئەو کاتە نهێنی یەکان هەموو ئاشکرا دەبن و بەڕە لەسەر هەتیوان هەڵ دەدرێتەوە

**محسێن ممتاز** بەم جۆرە وەلاَمی چاوە پڕ لەپرسیارەکانی گەنجەکەی دایەوە کە ناکرێ سەرسامیەکەی خۆی لەو بشارێتەوە چونکە ئەفسەر ناخی هزری خەڵک دەخوێنێتەوە

- پێم بڵێ   تۆ کێی ؟

گەنجەکە زۆر حەزی لەخۆ بەدەستەوەدان بوو

- تەماشاکە قوربان   هەموو ئەوەی کە لەمەوبەر گوتم بۆ فریودان و فێڵ بوو

**محسین** هەرکە وشەی فریوی بیست برۆیەکانی هەڵتەکاندن ، ئەو وشەیە لەو قسە باوانە نەبوو کە میسری یەکان دەیان گوت   گەنجەکە حەپەسانی **محسینی** دیت ، پاشان بەدڵنیایی یەوە گوتی

- ڕاستە   فریو   سەیرە کەس نایەوێ قبوڵی بکات

- چ شتێک ؟ !

- ئەوە کەناوی من **ڕەئفەت ئەلهەجانە**

لەهەمان کاتدا خەندەیەکی شادمانی دەم و چاوی **محسینی** داگرت

بەدڵنیایی ئێوەش قسەی من قبوڵ ناکەن و بەمن دەڵێن ساختەچی ، فێڵ باز

**محسین** وەلاَمێکی نەدایەوە ، بەلاَم خۆشی لەپێکەنین پاراست

- قوربان ئەوە بەڕاستی ناوی منە   **ڕەئفەت عەلی سلێمان ئەلهەجان** !

بەدڵنیایی یەوە ! ، دیسان **محسین** لە قاقای پێکەنینی دا ، بەشێوەیەک کە دەم و چاوی بەتەواوی سوور هەڵگەڕا

گەنجەکە دووبارە لەهەڵلاَی دا

- دەتەوێ پێت بسەلمێنم

- بەس چیرۆکی لیوی کوهن چی یە ؟

- حەزم نەدەکرد بەریتانیەکان لە لیبیارا بم گێڕنەوە

محسین سوکانی سەیارەکەی بادایەوە وەکو ئەوە کە ئەو سەرە داوە بەسی بێ و گوتی :

- یا اللە بابڕۆین

- بۆ کوێ ؟

- بۆماڵەکەت

*        *        *

ئێستا لەو وەختەوە کە محسین ممتاز گەنجەکەی لەیەکێک لەشەوەکانی ئابی ١٩٥٤ لەبەندیخانەی تێ هەڵچوونەوە دیتبوو ، ئەو کاتەی بیرکەوتەوە کەپێکەوە لەجادەی نێوان کێوی هیلوپلیس و کێوی عەباسیە لەیەکێک لەڕۆژەکانی ئەیلولی هەمان ساڵ دەسوڕانەوە

چەند هەفتەیەک تێ پەڕی بوو بەڵام بێ هودە نەبوو ، پێویست بوو کە محسین لەبارەی گەنجەکەوە زیاتر بزانێ بێ گومان زاڵ بوون بەسەر وەها کەسایەتیەکدا یەکلایی کردنەوەی مەحاڵ بوو ، هەرچەندە خوا بیر تیژی یەکی تایبەتی پێ بەخشی بوو ، چونکە ئەو گەنجە نەک هەر تەنها پۆلیسی میسری بەڵکو پۆلیسی نێو نەتەوەیشی گێژو وڕکرد بوو ، بۆیە دەرەقەت هاتنی کەسێکی وەها هێندەش سادەو ئاسان نەبوو و محسین دەبوایە قووڵ بوو باوە بەبنج و بناوانی گەنجەکەداو دەبوا زانیبای کە گەنجەکە تا چەند لەقسەکانی دا ڕاستگۆیە

هەر لەو وەختەوە کە محسین ممتاز بەندیخانەی بەجێ هێشت هەمیشە ئەو پرسیارەی لەخۆ دەکرد

- ئەو گەنجە کێ یە ؟ کوێندەریە ؟ ناوی ڕاستەقینەی چی یە ؟

لەسەر دۆسیەی گەنجەکە دوو ناوی بیانی و ناوێکی جوولەکەکان و سێ ناوی میسری بەرچاو دەکەوت ، دوو ناوە بیانی یەکە یەکێکیان جونی برات بوو و ناوی دووەم دانیل مارتان ، ئەو ناوەی کە ئەوان لێی دڵنیا بوون و دڵیان ئاوی دەخواردەوە

بەڵام بەلای **محسینەوە** ئاسان بوو کەشتێک لەبارەی ئەو دوو کەسە ئەمریکی و فەڕەنسی یە بزانێ بەتایبەتی کاتێ کە ئەوان لەمیسریش نەدەژین **محسین** پەیوەندیەکی بەهێزی لەگەڵ کارمەندانی فەرمانگەی هات و چۆدا هەبوو ، هەر بەهۆی ئەوانیشەوە گەیشتە ئەو ڕاستی یە کە **دانیال مارتان** گەنجێکی فەڕەنسی یەو بۆ سەفەرێکی کورتی زانستی هاتۆتە میسرو لەپاشماوەی ئاسار دەکۆڵێتەوە وەکو هەر قوتابیەکی زانکۆ پاشان لەئوتێلەکانی ناوەڕاستی قاهیرەدا بۆ ماوەی دووهەفتە دەمێنێتەوە بەڵام پاسپۆرتەکەی بەساختە دەردەچێ و توانیبووی پاسپۆرتێکی تر لەباڵیوزخانەی فەرەنسا لە قاهیرە وەربگرێ و پێی بۆ وڵاتەکەی خۆی بگەڕێتەوە هەواڵێک کە **محسین ممتاز** متمانەی پێ پەیدا دەکرد ئەوەبوو کە ناکرێ ئەو گەنجە **دانیل مارتان** بێ :

بەڵام شێوازێکی تر کە **محسین ممتاز** لەکاتی لێکۆڵینەوەدا سەرنجی ڕادەکێشا زۆر سەیر بوو چونکە لە نوسینگەی فەرمانگەی هات و چۆدا یان فڕۆکەخانە هیچ پیاوێکی بەریتانی بەناوی **جونی برات** نەهاتبۆ میسر بەڵام چاوی بەدۆسیەی خوشکی بەناوی **جوان برات** کەوت کەبەمەبەستی گەشتوگوزار هاتۆتە وڵات و لەدوای سێ هەفتە مانەوەو گەشتوگەڕان بەناو بەرو بازاڕی قاهیرەدا لەناکاو پاسپۆرتەکەی ون دەبێ

ئەو یەک هەفتەی تر لەمیسر دەمێنێتەوە و پاشان پۆلیس ئاگادار دەکاتەوە کە دەیەوێ بگەڕێتەوە ، خۆ ناسینەوەی ناوە جوولەکەیی یە کە کارێکی سادە بوو ، **محسین** دەی توانی خەڵکی جوولەکەی بەینی قاهیرەو ئەسکەندەریە لێک هەڵاوێرێ ، بەڵام چونکە جوولەکەکانی میسر لەو ڕۆژانەدا لەشۆڕشی میسر ترسابوون مەسەلەکە پێویستی بە کاتی زۆر هەبوو ، بەڵام ناوە عەرەبی یەکانی بریتی بوون لە **عادل مرقص** و **احمد علایلی** و **رأفت الهجان** ، **محسین ممتاز** خۆی بۆڕانەگیراو هەر سوور بوو لەسەر لێکۆڵینەوە ئەو لێکۆڵینەوانە تا ناوچەی بحیرە و رشید و ناوچەکانی دەوروبەری پایتەختی دووەمی میسر درێژکرانەوە ، **محسین ممتاز** لادێ نشین بوو ، بەڵام مەسەلەی خێزان و تیرەو ڕەچەڵەک لای ئەو بەپلەی یەکەم دادەنران چونکە خەڵکی لادێکانی میسر ، لەکاتی خوازبێنی دا بێ وچان دەپرسن

زاوا لەکام خێزانە ؟ پاشان لەبراو خوشک و مام و خاڵی زاوا یان بووک دەپرسن بەڵام ئەوان ئەو کارە بە دووزمانی ناکەن ، بەڵکو زۆر گرنگی بەڕەسەنایەتی خێزانی

و ناسینی بنج و بناوانی کۆمەڵایەتی دەدەن ، چونکە **محسین ممتاز** هەندێک لەخەڵکی خێزانە گەورەکانی علایلی دەناسی ، لەدوای ٢٤ سەعات لێکۆڵینەوە دەرکەوت کە **احمد علایلی** ئێستا لەژیان داماوەو ژیانی ئاسایی خۆی بەسەر دەبات خێزاندارەو خاوەنی دوو منداڵەو لەیەکێک لەبانقەکاندا سەرقاڵی کارکردنە ئەو هەواڵگریە لەماوەی ٢٤ سەعات دا دەستەبەرکرا چونکە **محسین** دەی زانی کە چۆن لەگەڵ هەر مەسەلەیەکدا هەڵ بکاو چۆن گرێ کویرەکان بکاتەوە ئەو بەدرێژەدان بەلێکۆڵینەوەکان گەیشتە ئەو ڕاستی یە کە ڕۆژێک لەڕۆژان بەبەڵگەیەکی نادیارەوە **احمد** پاسپۆرتەکەی ون کردووە و پاشان ئەو مەسەلەیەی بەنوسراو بەپۆلیس ڕاگەیاندووەو پاسپۆرتێکی نوێی دەرهێناوەتەوە ئایا ئەو گەنجە پیشەی دزینی پاسپۆرت بووە ؟ سێ دۆخ لەو شەش ناوانەی کە گەنجەکە پڕوپاگەندەی بۆ دەکرد پاسپۆرتەکانیان ون بوو بوو ، بەڵام لەنێو دەیەها نیشانەو پرسیار کەلە بارەی کەسایەتی گەنجەکەوە دەکرا لەناکاو مژدەی تەولوبوونی لێکۆڵینەوەکەو بەتایبەتی لەمەڕ ناوی **ڕەئفەت عەلی ئەلهەجان** درا بە **محسین** .

لەو سەرو بەندەدا **محسین** سەفەری بۆ گوندەکەی **ڕەئفەت ئەلهەجان** کردبوو و لەگەڵ گوند نشینەکاندا گەوتبوو وت و وێژ، **محسین ممتاز** تێ گەیی کە بەرەبابی گەورەی ئەل هەجان لەمیسردا خاوەنی سێ تیرەیە ، تیرەیەک لە بحیرە و تیرەیەکی تر لە **میاک** و سێ یەمیان لە ڕۆژهەڵاتی میسردا نیشتەجێن ، بەم شێوەیە ئەوجار لێکۆڵینەوە سەبارەت بەو سێ تیرەیە لە بەرەبابی هەجان بەخێرایی یەکی تۆکمە کراو ئەنجام درا ، لەڕاستی دا کارەکە هێندەش ئاسان نەبوو ، بەڵام ڕاپۆرتی گەیشتوو لەقاهیرەوە دەری دەخست کە ئەفسەرێک لەسوپای میسر بەپلەی **سەرگۆرد**[1] بەناوی **محمد رفیق** لەگەڵ ژنێک لەبنەماڵەی ئەل هەجان و **میاک** هاوسەرگیری کردووە **محسین ممتاز محمد رفیقی** لەسەردەمی زانکۆوە دەناسی ، **محمد رفیق** لەخوێندکارە کۆنەکان بوو کە **محسین** سەردەمێک سەرۆکیان بوو کە ئێستا لێکۆڵینەوەکەی **محمد رفیقی** لە ئەستۆ گرتووە ، لەناکاو ئاشکرا بوو کە هاوسەری **محمد رفیق** ناوی **شریفە علی سلێمان الهجانە** هەر وەک کە گەنجەکە دەیگوت ناوم **ڕەئفەت سلێمان ئەل هەجانە**

(١) پلەیەکی ئەفسەری یە

بەلام بەراورد کردنی ئەو ناوانە جێگای سەرسوڕمان بوو خۆ دەکرا برای بێت یان ئەوە کە قسەکانی پڕوپاگەندە بن ئەو ڕۆژە **محسین ممتاز** بەڕواڵەت هێور دەهاتە بەرچاو بەلام لەڕاستی دا دەت گوت دەیەوێ باڵ بگرێت

پرسیارێک کەلە زەینی دا دووبارە دەبۆوە ئەوە بوو کەئایا بەڕاستی گەنجەکە دۆزرایەوە و مەتەڵەکە هەڵهات ؟ ئایا بنچینەو ڕەچەڵەکی ئەو بەتەواوی دۆزرانەوە ؟ بەهەرحاڵ دەنگ و باس و ڕاپۆرتی گەیشتوو کەئەو پشتی پێ دەبەستن دەریان دەخست کە خانم **شریفە** کچی خوا لێ خۆش بوو **علی سلێمان الهجانە** ، چاودێری خوێندنگای نموونەیی و ئیتر ئەو خوا لێ خۆش بووە لەژنی یەکەمی سێ منداڵی بەناوەکانی **عادل** و **سلیم** و **محمود** هەبووە و کاتێ کە هاوسەری یەکەمیشی وەفاتی کردووە لەگەڵ بێوەژنێک هاوسەرگیری کردووەو لەویش دوو منداڵی هەبووە ، کوڕێک و کچێک بەناوی **ڕەئفەت** و **شەریفە** ، بەلام هاوسەری دووەمی بەنەخۆشی سەخت ماڵ ئاوایی کردووە ، ئەویش لەدوای هاوسەرەکەی زۆر غەمبار و دڵگران دەبێ و لەدوای چەند ساڵێک دەمرێت لەوکاتەدا سەرپەرشتی **ڕەئفەت** و **شریفە** بەبراکانی سپێردراوە ، **ڕەئفەت** زۆر خۆشەویست دەبێ و گەوهەرو دوڕی دانە دانە دەبێ ، بەشێوازێکی لێوەشاوە گەورە دەکرێ و سەرەنجام هەموو ئەو کاردانەوانەی کە بنەماڵەکەی دەرهەق بەو ئەنجامیان دەدا کاریگەریان نەبوو دەبونە بڵقی سەر ئاو بەلام واش نەی توانی خوێندنەکەی تەواو بکات .، لەدیدی وان دا ئەو هەمیشە بارگرانی بوو بەسەر بنەماڵەکەیداو بەشێوەیەک کە هەموو خزمان دەرگای ماڵەکەیان بەڕوودا دادەخست جگە لە خوشکەکەی **شەریفە** کەلە دوای وەرگرتنی دیبلۆم شووی کرد، بەلام بەهۆی تانەو تەشەر لێدرانی لەسەر براکەی هەندێک جار بانگی دەکردە ماڵەکەی خۆی هەرچەندە مێردەکەی **سەرگۆرد**[1] **محمد رفیق** پێی خۆش نەبوو و حەزی نەدەکرد چڕو چاوی براکەی ببینێ یان هەتا ناویشی ببیستێ ، جارێک یەکێک لە هاوەڵەکانی پرسیاری لێ کرد کەسێک بەناوی **ڕەئفەت** ئەل هەجان دەناسی ؟ ! لەناکاو سەرگۆرد **محمد رفیق** لەڕقان ڕەش داگەڕا و کردی بەهەرا کەنە ئەو دەناسێ و نەدەیەوێ بیشی

(1) پلەیەکی لەشکەری یە

ناسێت و هیچی لەبارەوە نازانی ، پاشان درێژەی پێدا من ماڵەکەی خۆمم لی قەدەغە کردووەو ماڵو منداڵەکەم هەموویان خۆی لیّ دەپارێزن

پاشان لایەنی بەرامبەر لەو هەموو داخ لەدڵیەی **محمد رفیق** سەری سوڕما ، چ جای ئەوە کە هیچی دەربارەی سەرەتاکانی باسەکە نەدەزانی **محمد رفیق** لەشوێنی خۆی جووڵەیەکی کردو گوتی ئەو ئێستا لەکام بەندیخانەدا دەی گوزەرێنیّ ؟ هاوەڵەکەی **محمد رفیق** نیگەران بوو و بڕیاری دا سیناریۆیەک وەگەڕخات ماوەیەکە گەنجێک بۆ داخوازی کچێک هاتووە لەو نزیکانەی خۆمان و خۆی **بەڕەئفەت عەلی سلێمان** ئەل هەجان ناساندووە و ماڵی کچەش داوایان لەمن کردووە کەلە بنەماڵەکەیان بکۆڵمەوە ، سەرگورد رفیق هوشیاری دا بەهاوڕێکەی و داوای لیّ کرد کە کچە و ئەو بنەماڵەیە لەو گەنجە بپارێزیّ و نەیەڵیّ توخنی بکەون چونکە ئەو گەنجە سەرسەری و فێڵبازو نەخوێندەوارە و لەهەمان کاتیشدا دزێکی زۆر زیرەکەو لەبەندیخانەیەکەوە دزە دەکات بۆ بەندیخانەیەکی تر ، ئەو بۆ خۆشی نازانیّ چ دەکات و چۆن خۆی دەبات بەڕێوە جا هەر ئەوە ماوە ژنێکیش بەخۆیەوە سەرگەردان بکات

**محسین ممتاز** خۆشحاڵ بوو کە توانی لەماوەیەکی زۆر کورت دا بەوردی گەنجەکە بناسیّ ، بەڵام خۆشحاڵیەکەی لەکاتێکدا زیادی کرد کە لێکۆڵینەوەکانی بەدەست کەوتنی وێنەیەکی **ڕەئفەت** و خوشکەکەی کۆتایی هات

ئێستا بۆی دەرکەوت کەئەو **ڕەئفەت عەلی سلێمان** ئەل هەجانە ، **محسین ممتاز** پیّ دەکەنی وئەو پێکەنینەش دوو واتای هەبوو ،یەکیان لەبەرئەوە چونکە گەنجەکە درۆی لەگەڵدا نەکردبوو و دووەمیان چونکە گەنجەکە لەبنەڕەتدا میسری بوو.

سەعات نزیکی ٢ ی پاش نیوەڕۆ بوو کە سەیارەکەی **محسین** لەبەردەم یەکێک لەکەبابخانە ناسراوەکانی گۆڕەپانی ازهار ڕاوەستا ، **محسین** لەناو سەیارەکەدا هۆڕنێکی لێدا پیاوێک کە بەرپرسی کەبابخانەکە بوو سەری هەڵێناو کاتیّ **محسینی** دیت بەدەست ڕاوەشاندن سڵاوی لیّ کرد ، کەبابچیەکە یەکێک لەشاگردەکانی بانگ کردو ڕۆژنامەیەکی پێچراوی دایێ و ئاماژەی بەسەیارەکە کرد ، پیاوەکە زۆر بەپڕ تاوی ڕۆژنامەکەی دا **بەمحسین** ، **محسین** لەسەر کورسی پێشەوەی سەیارەکەی دانا ، پاشان پارەیەکی دا بە شاگردەکە – پارەکە ٥ قروش بوو – ئەو بڕە پارەیە لەو کاتەدا تەنها

خەڵکی دەوڵەمەند دەیانتوانی بیدەن کاتی کە سەیارەکە کەوتە ڕێ بۆنی کەباب برسێتی گەنجەکەی وروژاند لەدوای چەند خولەکێک و لەکاتێکدا کە ڕۆژنامە پێچراوەکەی لەدەست دابوو ، لەسەیارەکە دابەزی ، گەنجەکەش لەگەڵ ئەودا دابەزی

گەنجەکە غیرەتی بڕ نەکرد قسەیەک بکات تەنها جارێک داوای جگەرەی کردو **محسینیش** بەسەر لەقاندن ڕەزامەندی دەربڕی ، گەنجەکە جگەرەکەی داگیرساندو کەوتە بیرکردنەوە پاش ئەوەی کە **محسین** سەیارەکەی ڕاگرت هەموو پێکەوە کەوتنە ڕێ تاگەیشتنە گۆڕەپانی سلێمان پاشا ، **محسین** چۆ ناو باڵەخانەکە کە لە دەوروبەری گۆڕەپانەکە بوو ، **ڕەئفەت** بەبێ ئەوەی کە قسەیەک بکات کەوتە دوای ، چوونە ناو باڵابەرەکەو بۆ دوانهۆمی سەرەوە پێیەلاچوون ، دوای چەند هەنگاوێک **محسین** لەبەردەم دەرگا ڕاوەستا ، دەرگای کردەوە و لەکاتێکدا کە دەچۆ ژوورەوە گوتی : دەرگا لەپشت خۆتەوە داخە

**ڕەئفەت** هاتە ژوورو دەرگای لەپشت خۆیەوە داخست خۆی لەماڵێکی بچکۆلانەی سادەدا دۆزیەوە

گەنجەکە بەسەرسوڕمان و واق وڕمانەوە تەماشای **محسینی** دەکرد ، ڕۆژنامە پێچراوەکەی لەسەر مێزێکی بچکۆلانە کە چوار کورسی لەدەورە دانرا بوو دانا گەنجەکە ڕەخنەی گرت و کردی بەگاڵتە

- جەنابی ئاغا بمان بەرەوە بۆ بەندیخانە

**محسین** پێکەنی ، جگەرەیەکی داگیرساند و خۆی لەسەر کورسی یەکە توند کرد ، بەبێ ئەوەی کە هیچ کاردانەوەیەک لەخۆیدا پیشان بدات ، **ڕەئفەت** گەڕایەوەو دوبارە ناڕەزایی دەربڕی

- لانی کەم لەبەندیخانەدا دەزانم لەکوێم بەلام لێرە

**محسین** بەتاسەوە قسەکەی بڕی ئەدی من نەم گوت کەتۆ لەماڵی خۆتی

- ماڵی خۆم ؟ ! واتە چۆن چۆنی ؟

تەنها وەلامەکەی بێ دەنگی بوو

- چۆن چۆن ماڵی من ؟

دیسان وەلامەکەی هەر بێ دەنگی بوو پاشان درێژەی پێدا

- جەنابی ئاغا ، سوپاست دەکەم ، من دەڵێی شێت دەبم

**محسین** بەدەنگێکی خۆماڵی گوتی ئایا ئێرە باشتر نیە ؟ !

گەنجەکە درێژەی بەنارەزایی یەکەی دا

- دیارە کە باشترە بەڵام ئەگەر بەچاکی بزانم

- جگەرەیەک داگیرسێنە

گەنجەکە جگەرەیەکی داگیرساندو لەرقان شتێکی درکاند دوایە هاتەوە سەرخۆی و پرسی

- باشە لانی کەم دەبێ بزانم ، کە ئەو هەموو سۆزە لەبەر چی یە ؟ !

- تۆ چ ناوێکت لە لیبیا بە بەریتانیەکان گوتووە ؟

- **لیوی کوهن**

- باشە تەواوە ... لێ گەڕێ با ناوت بۆ هەمیشە **لیوی کوهن** بێ

گەنجەکە بەترسەوە لە هەڵلآی دا

- ئەوە چ داستانێکە ؟

**محسین** لەدوای ئەوە کە جگەرەکەی تەواو کرد هەستا پێ و گوتی

- لەژووری نوستن کۆت و شەڵوارێک بدۆزەرەوە ، هەرچەندە کە نوێش نین بەڵام لەوانەش باشترن

- من پێویستم بەکۆت و شەڵوار نیە ... من دەمەوێ باسەکە بزانم

- هەروەها چەند کراسێک و دەستە سرێک و یەک دانە بۆینباخ و هتد

- کاکە دەبەرت مرم ئەو باسەم بۆ یەکلاکەوە دیقم کرد

**محسین** ١٠ لیرەی میسری دەرێناو بۆی لەپەنا خواردنەکەی دانا

- ئەو ١٠ لیرەیە بۆ ئەوەیە کە جگەرەی پێ بکری و پێی بچی بۆ سینەما

- ئای خوای گەورە

گەنجەکە قسەیەکی وای کرد هەتا **محسینیشی** هێنا پێکەنین

**محسین** گوتی :

- دەمەوێ حەمام بکەی ، پشوو بدەی ، کەیفی بۆ بکەی و خەمی دنیا بەبادەی ، هەر کارێکی کەپێت خۆشە بیکەی ، چونکە خوا حەز بکات سبەینێ سەعات ١٠ ی بەیانی دێمەوە لات

* * *

گەنجەکە شتێکی نەبوو کە بیلی تەنها ڕەزامەندی دەردەبڕی بەوڕ و کاسی بەدوای **محسین** دا لاقەکانی لەدوای خۆی ڕادەکێشان

**محسین** لەکاتێکدا کە بۆ لای دەرگاکە دەڕۆی گوتی

- هەست بەگومانی ئاستەنگێک دەکەم لەبەردەمت دا لەبەر ئەوە ئەو شتەی کە بە بەریتانیەکانت گوتووە لە لیبیا لێرەش هەر ئەوە بڵێ

گەنجەکە بەگورجی هاتە لای و گوتی

- باشە بۆچی ؟

- هەموو خەڵك لەمڕۆ بەدواوە دەبێ بزانن کە ناوی تۆ **لیوی کوهنەو** تۆ جوولەکەیت و لەمیسر هەلاتوویی و سوپای بەریتانی دوبارە تۆیان گێڕاوەتەوە

گەنجەکە لە حاستی ئەو دەستەواژانە جگە لە بێ دەنگی نەی دەتوانی هیچی تر بڵێت ... **محسین** درێژەی پێدا ئەو شتەی کەدەبێ ببێ و ئەو شتەی کە دەبوا ببا بێ چەندو چوون دەبێ جێ بەجێ بکرێ ، **محسین** دەرگاکەی کردەوەو ویستی ماڵەکە بەجێ بێڵێ ، بەلأم گەنجەکە کردی بەگاڵتە

- قوربان

**محسین** گەڕایەوە ، گەنجەکە شیشە کەبابێکی بەدەستەوە بوو گوتی

- قوربان ئەوەت لەبیر چوو

**محسین** گوتی :

- ئەوە خواردنی نیوەڕۆی تۆیە میرزا **لیوی** چەند ڕۆژێکە کە هیچت نەخواردووە ، ئەوەی گوت و پاشان گەڕایەوە بەبێ ئەوەی کە وشەیەك بدرکێنێ ون بوو

گەنجەکە چاوی بەڕۆژنامە پێچراوەکە کەوت ٣٦ سەعات بوو کە تامی خواردنی نەکردبوو پارەکەی وەلانا ، ڕۆژنامەکەی کردەوە بە مڵچە مڵچ دەستی بەخواردن کرد

* * *

لەپێش زەردە پەڕدا **ڕەئفەت عەلی سلێمان** ئەل هەجان ویستی ماڵەکە بەجێ بێڵێ ، وەك ئەوەی کە مرۆڤێکی تر بێ ، دەم و چاوی شوشت و مووەکانی شانە کرد و

جلی خاوێنی لەبەر کرد ، **ڕەئفەت** سەلامی لەپاسەوانەکە کرد کە لەناو باڵەخانەکەدا لەسەر کورسی یەک دانیشتبوو

- شەو باش

پاسەوانەکە هەستا پێ و وەڵامی دایەوە

- شەوباش میرزا **لیوی**

بەم جۆرە **ڕەئفەت** ئەل هەجان هەستی کرد کە دەبێ ناوی خۆی لەم شەوەوە بگۆڕێ و هەتا ئاشکرا دەبێ وەک جوولەکەیەک بمێنێتەوە

سەعاتی سەر دیوارەکە سەعات ١٠ ی بەیانی پیشان دا ، لەو ساتەدا **محسین** زەنگی ماڵی **ڕەئفەت** ئەل هەجان یان هەمان **لیوی کوهنی** لەراندەوە ئەنجامی پیلانەکەی دوێنێ ی بەتەواوی سەری گرتبوو ، چونکە لە سەعات ٨ ی بەیانی ڕا ڕاپۆرت لەسەر ڕاپۆرت لەسەر هەر جم و جۆڵێکی **لیوی کوهن** گەیشتبوونە دەستی ، ئەو دەی زانی کە گەنجەکە دووپاکەتە جگەرەی بەنرخی کڕیوە ، پاشان چۆتە سینەمایەک کە فلیمی بیانی لێ داوەو لە دوای بەجێ هێشتنی سینەماکە چووە بۆ چاخانەیەک کە خواردنی ناوداری هەبووە تێری خواردووەو بۆ ماڵ گەڕاوەتەوە بەڵام ئەوانە بۆ **محسین** گرنگ نەبوون ، بەڵکو ئەو شتەی کە گرنگ بوو ئەوە بوو کە کاتێ گەنجەکە دەرگاکەی کردەوە بیچمەکەی وای پیشان دەدا کە چۆتەوە دۆخی ئاسایی خۆی و هێور بۆتەوە

- سڵاو **لیوی** !

گەنجەکە قسەی بڕی و گوتی

- **لیوی** ئەوجار کێ یە ؟

**محسین** درێژەی پێدا ، گوایە کە هیچی نەبیستووە

- تەماشەکە من دوو کارم لەتۆ دەوێ

- چ کارێک ؟

- یەکەم ئەوە کە بەتەواوی دڵنیا بیت

- قوربان ئەگەر بتەوێ شتێک لەمەڕ جوولەکەکان بزانی من ئامادەم

- **لیوی** ! ! **محسین** بە توڕەیی وریایی بەگەنجەکەدا !

- **لیوی** من شتێکی ترم لە تۆ دەوی

- چی ؟

- ئەوە کەتۆ ڕەئفەت ئەل هەجان لەبیر خۆت بەریتەوە ڕەئفەت ئەل هەجان بەیەکجاری لەیادکە

- بەڵام قوربان ناوی ڕاستەقینەی من ڕەئفەت ئەل هەجانە ، سوێند دەخۆم

محسین قسەکەی بڕی و گوتی

- باشە دەزانم .

گەنجەکە مات بوو ، لەبەرخۆیەوە دەی گوت

- دەزانی ؟

- بەڵێ دەزانم

- کەواتە تۆ قسەکەی منت بەدڵە

- هەڵبەتە

محسین ممتاز ڕووی وەرگێڕا ، جگەرەکەی داگیرساند و بۆ چەند چرکەیەک بێ دەنگ بوو

گەنجەکە گوتی

- بەڵام لەپەنا خۆت داڵدەمان دەیت

محسین هەوڵی دا قسەیەک بکات بەڵام گەنجەکە درێژەی پێدا

- بەیەک مەرج

- کام مەرج

- بەو مەرجە ڕۆژێک بەسەرهاتەکەم بەتەواوی بۆ باس بکەی

محسین تەنها بەزەردەخەنەیەک وەڵامی دایەوە ، گەنجەکە گوتی

- قوربان ئێستا چیت لەمن دەوێ ؟

- دەمەوێ لەتان و پۆی داستانی ژیانی تۆ بگەم

گەنجەکە تەماشایەکی کرد و غەم و خەفەتێکی زۆر لەڕوخساری نیشت باوەڕی وابوو کە دەبێ لەخزمەتی کەسێکدا کە ناوەکەشی نازانێ خۆی بەدەستەوە بدات

گەنجەکە گوتی :

- باوەڕم پێ دەکەی ؟

- باوەڕ دەکەم

گەنجەکە گوتی    ناوی من ڕەئفەت عەلی سلێمان ئەل هەجانە ، بابم خوا لێی خۆش بێ مامۆستا سلێمان ئەل هەجان چاودێری خوێندنگای نموونەیی بووە ، ۳ برام هەن کە لەمن گەورەترن بەناوەکانی عادل و سلیم و محمود و خوشکێکیشم هەیە بەناوی شەریفە کەلە من بچوکترە

گەنجەکە بەم شێوەیە داستانی ژیانی خۆی دەست پێ کرد

بێ گومان ڕەئفەت بەناز پەروەردە کرابوو بەڵام مرۆڤێکی گەندەڵیش نەبوو ، کە ئەو ۵ ساڵ بوو خوشکەکەشی شەریفە ۳ ساڵ زیاتر نەدەبوو کە دایکیان مرد ، دووای ماوەیەک دایکیشیان ماڵ ئاوایی کرد ، ئەو قۆناغی شەشەمی سەرەتایی کردبوو ، لەو سەردەمەدا ئەو قۆناغە بایەخی زۆری هەبوو ، تەمەنی ئەو لەو وەختەدا ۱۲ ساڵ بوو ، لەبەر ئەوە براکانی گوتبویان ناتوانین لەزانکۆ ناوی تۆمار بکەین ، بەناچاری لە قوتابخانە ناوەندیەکان ناو نوسی دەکەن چونکە لەو سەردەمەدا ئەو جۆرە خوێندنانە بەشوم و خراپ دادەنران و دەکەوتنەبەر تانەو تەشەر ، بەڵام بۆیە ئەو جێگەی ڕەخنە نەبوو چونکە چاودێری خوێندنگاکە بوو و براکانیشی هەموویان خوێندکاری زانکۆ بوون ، بەهەرحاڵ لەقوتابخانەیەکی ناوەندی بۆ بەشی بازرگانی هەڵبژێردرا ، لەو بەشەدا قوتابییەکان بۆ کاری بانقەکان و کۆمپانیاکان و ژمێریاری ئامادە دەکران ، گەنجەکە لەخوێندنەکەی خۆی بەتایبەتی لەشێوازی زمانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی دا زۆر سەرکەوتوو بوو

بانقەکان و کۆمپانیاکانی ئەو سەردەمە بەزۆری بیانی بوون و زمانی بیانیش برەوی هەبوو ، گەنجەکە تا ساڵی سێ یەم خوێندنەکەی بەسەرکەوتوویی بەڕێ کرد بەبێ ئەوەی کە دوو دڵی و دڵەڕاوکێ ڕووی تێ بکات ، بەڵام لەساڵی چوارەم دا لەکاتێکدا کە چەند مانگێکی نەمابوو بۆ وەرگرتنی دیبلۆم و تازە ۱۶ ساڵانە بوو ، برایەکەی ژنی هێناو ئەویش ناچار بوو لەگەڵ واندا ژیان بەسەر بەرێ ، دووبەرەکی نێوان ڕەئفەت و برایەکەی دەستی پێ کرد

ئەو دوو بەرەکی یە کاریگەریەکی قووڵی لەسەر گەنجەکە بەجێ هێشت ، بەلای ئەوەوە ئاسایی نەبوو کەبراکەی لەبەردەم خێزانەکەیدا سووکایەتی پێ بکات لەکاتێکدا کە هاوتەمەن بوون ، زەبری کوشندەتر ئەوە بوو کەلە تاقی کردنەوەی

کۆتایی سەرنەکەوت ، هەر ئەوەندەش بوو بەمایەی ئەوە کە لە خولی دووەمیش سەرنەکەوێت ، دووبەرەکی ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دەبوو ، کاربە بۆنبەست گەیشت و ساڵی دواتر گەنجەکە تووشی دڵەڕاوکێ بوو ، ژیان لەوماڵەدا بۆ ئەو بوو بە دۆزەخێکی داخراو ، پاشان بڕیاری دا کە پێش ئەوەی خوێندنەکەی تەواو بکات هەڵێ و خۆی لەدەریای پڕ لە کارەساتی ژیان قوتار بکات

بەم شێوەیە پێی نایە ١٨ ساڵی ، لەو وەختەدا خۆی بەتەنهاو دابڕاو دەزانی نەماڵێکی هەبوو و نەحەشارگەیەک و نەخێزانێک .

لەوەختی شەڕی جیهانی دووەم دا هونەری سینەما برەوی زۆری لەمیسردا پەیداکردبوو و سینەما مۆڵەتی کاری بۆ هەزاران گەنجی میسری دەستەبەر کردبوو هەتا ئۆردوی سوپای بەریتانیاشی گرتبۆوە ، گەنجەکە هیچ ڕێگەیەکی لەبەردەم دا نەمابۆوە جگە لەوە کەرێی سینەما بگرێتەبەر ، ئەو ناچار بوو لەخراپترین ئوتێل و ژووردا ژیان بەسەر ببات ، بەڵام داخی گرانی ئەو دابڕانی بوو لەدیدەنی خوشکەکەی کە جار جارە دەچوو بۆ لای و سێبووری دەهات

بۆ وی هەناسەدان لەناو هەوای سینەمادا کارێکی وا ئاسانیش نەبوو ، بۆیە وازی لەسینەماش هێنا ، ڕۆژێک لەیەکێک لە ڕۆژنامەکاندا ئاگاداریەکی دەربارەی دامەزراندن لەکۆمپانیایەکی بیانی نەوت خوێندەوە لەو سەردەمەدا هەموو کۆمپانیاکانی نەوت لەمیسردا بەبێ جیاوازی لەدەریای سوور سەرقاڵی کاری هەڵکەندن بوون و مەرجەکانی دامەزراندنیان زۆر سەخت بوو ، چونکە زۆربەی کارمەندانی ئەو کۆمپانیا دەرەکیانە جوولەکە بوون و هەریەک لەوان چەندەها زمانی دەزانی

ڕەئفەت لەگەڵ دەیەها کەس لە هاو تەمەن و هاو ساڵاکانی خۆی داواکاری پێشکەش کرد ، ڕەزامەندیەکەی ڕاگەیەندرا ، بەلای ئەوەوە شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو ، پاشان سەفەری کرد بۆ دەریای سوورو سەرقاڵی کاربوو ، یەکێک لە هۆکارەکان کە ڕەئفەت ئەل هەجانیان ناچار کرد بەدوای ئەو کارەدا بگەڕێت ئەوە بوو کەچیدی نەی دەتوانی خوشکەکەی ( شەریفە ) ببینێ چونکە ڕێی پێ نەدەدا ، ئەو نەی دەویست ببێتە ئاستەنگ بۆ خوشکەکەی لەهەمان کاتیش دا هەر نەدەکرا نەشی بینێ ، بەڵام کارکردن بۆ ئەو لە دەریای سووردا تاقە ڕێگە بوو بۆ خۆ خافڵاندن و هەڵاتن و دەربازبوون ، بەمتمانەی تەواوەوە دەست بەکار بوو

ئەو ئێستا هەست بەسوودی فێربوونی دوو زمانی ئینگلیزی و فەڕەنسی لە کاروکاسبی خۆیدا پی دەکات ، لەقاهیرە کتێبی بیانی کڕی لەهەندێک لە کارمەندو ئەندازیارە بیانی یەکان چەند کتێبێکی گرنگی خواست و بەنا بەدڵی کەوتە سەر خوێندنەوەیان لەڕاستی دا ئەو کتێبانە ئاسۆیەکی تازەو نوێیان لەبەردەم ئەودا کردووە ، هێشتا چەند مانگێک تی نەپەڕی بوو کە بوو بەجێگەی ئێرەیی کارمەندە بیانی و جوولەکەکانی کۆمپانیاکە ، جگە لە قسەهێنان و بردن و بەدخوویی شتێکی تری لەهاوکارەکانی خۆی نەدی ، ئەوان ڕۆژ بەڕۆژ ژێر پێیان دەکولاندو جێگەیان پێ لەق دەکرد تا ڕۆژێک سەر لەبەیانی دیتی وا هەڵیان داوەتەوە بۆ قاهیرە کەهەرگیز چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەی نەدەکرد ، کاتێ کە ڕەئفەت ئەل هەجان بەنا بەدڵی گەڕایەوە قاهیرە نەی دەویست ئەوەی بەسەر ویدا هاتووە دووبارە بێتەوە

خوشکەکەی لەو سەرو حەددەدا منداڵێکی بوو ناوی نا **تاریق** **ڕەئفەت** هەروەک جاران خۆشی دەویست ، هەر کاتێ خوشکەکەی بیردەکەتەوە حەزو خولیاکانی دەخرۆشاو ئازاری پێ دەگەیی ، هەموو دەرگاکان بەڕوویدا داخرابوون ، جگە لە هەڵاتن تروسکایی یەکی دی بەدی نەدەکرد ، بۆیە دەست بەجێ هەوڵی دا بگەڕێتەوە دەریای سوورو هیچ ڕێگە چارەیەکی دی جگە لە دەست کێشانەوەی بەدی نەدەکرد

ئەو ئێستا لەکاری خۆیدا ئەزموونی بێ وێنەی بەدەست هێناوە پاشان سەفەری کرد بۆ دەریای سوور بەبێ ئەوەی کە دەست لەکارەکەی بکێشێتەوە ، سەر لەنوێ کارامەیی و دەست ڕەنگینی خۆی پیشان داو سەرکردەکانیش لێی خۆش بوون بەلام دیسان غەریزەی ئێرەیی پێ بردنی هاوکارەکانی تەنگیان پێ هەڵچنی و تەنگە تاویان کرد ، لەگەڵ تاقمێک کە هەموویان بیانی بوون لەمیسری یەکان باشتر یان نەبوو ، دیسان کە یەکێک لەلای بەڕێوەبەر دوو زمانی کرد بوو ، بۆیە دوای ماوەیەک خۆی لەکۆمپانیایەکی تر دامەزراند

دوای ئەوەی کە ڕووداوەکەیان لەبەڕێوەبەر حاڵی کرد تێ گەیی کە دەست کێشانەوەی **ڕەئفەت** لە کۆمپانیای پێشوو ناهەق بووە بەڵام بەپێی یاساکانی پەیڕەو لێ کراوی ئەو کاتە کۆمپانیاکان نەیان دەتوانی خەڵکی بێ مۆڵەت و لەسەر کار لادراو دابمەزرێنن بۆیە بەیەکجاری لەسەر کار لادراو هەموو مافەکانی زەوت کران و سەر لەنوێ گەڕایەوە قۆناغی بێ بەشی و سەرگەردانی

لێرە ڕەئفەت لە قسەکردن وەستاو تەماشای **محسینی** دەکرد ، **محسین** لەو کاتەدا بەبێ خوستی گوێی لی دەگرت ، گوایە سەرتاپای جەستەی بۆ کردووە بە گوێ و گوێ لەداستانی ژیانی ئەو گەنجە قوڕ بەسەرو بێ بەختە دەگرێ

**محسین** بێ دەنگ بوو ، گەنجەکە جگەرەیەکی داگیرساندو درێژەی پێدا

- جەناب باوەڕ دەکەی ؟

**محسین** بە سۆزەوە گوتی

- چ شتێ دەبێتە مایەی ئەوە کە باوەڕ نەکەم

- ئاخر خودی من      خۆشم باوەڕ ناکەم      بۆ هەر لایەک دەڕۆم حیفریتێک لەبن پێم دا سەوز دەبێ

بۆ چەند چرکەیەک گەنجەکە بێ دەنگی هەڵبژارد پاشان کردی بەگاڵە

- بۆچی      ئاخر بۆچی من دەبێ وابم ؟ !

# بەشی حەوتەم

# خەم نامەیەکی تێ شکاو

خانم سمحون گوتی ئەو شتەی کە عەزیز جەبالی دەیلێ گێڕانەوەی خەمنامەیەکە ، عەزیز پێکەنی و گوتی :

کاتێ کە ئەو بەسەرهاتەم بۆ یەکەمین جار لە محسین ممتاز گوێ لێ بوو دەت گوت شانۆیەکی تەنزاوی ( کۆمیدی ) هونەرمەندی میسری نەجیب ڕێحانی دەبیستم

- تەنزاویی ؟ !

پاشان عەزیز وەڵامی دایەوە

- بەڵێ خانم بەرواڵەت خەڵکی میسر بەهۆی ئەو هەموو زەبرو دڵشکان و ماف پێ ڕەوانەبوونەی کەبە درێژایی سەدەیەک لەدوای یەکەکان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ستەم دا چەشتیان جگە لە تەنزو گاڵتەجاڕی شتێکی تر نەبوو خانم سمحون کەلە مەبەستەکەی حاڵی نەدەبوو بەسەر سوڕمانەوە بڕۆکانی هەڵ تەکاندن و عەزیز درێژەی پێدا هەندێک ناوبڕ کەلە شانۆو فیلمەکاندا هەیە بەڕادەیەک تەنز ئامێزن کە خەڵکی لەپێکەنینیان فرمێسک لەچاویان دێتە خوارو خەنی دەبن

عەزیز ئەوەی گوت و لەکاتێکدا کە ئاخی هەڵدەکێشا درێژەی پێدا

- بەهەرحاڵ ئەوە شتێک نیە جگە لە دەستپێکی داستانەکە

چاوەشین و پڕ لە پرسیارەکانی سمحون ڕاچڵەکین ، عەزیز دووبارە درێژەی پێدا

- بەڵێ خانم سمحون ئەو شتەی کەتۆ بەخەم نامە ناوی دەبەی شتێک نیە جگە لە دەستپێکی خراپەیەک

بەدبەختی یەک کەلە بەریتانیاو ئەمریکاو کەنەداو فەرەنساو بەلجیک و هۆڵەنداو پاشان ئەڵمانیاش بەرۆکی گەنجەکەی گرت بۆ ئەوە بوو تا جارێکی تر بگەڕێتەوە میسر تا دووبارە قۆناغێکی تازەتر لەژیانی ئەو گەنجەدا دەست پێ بکاتەوە

* * *

بەم شێوەیە ڕەئفەت ئەل هەجان لەدوای ئەوە کەڕاستی کارەکەیان بۆ ڕوون بۆوە ، لە دوو کۆمپانیای نەوت دەرکراو سەر لەنوێ خۆی لە ئاوارەیی و سەرگەردانی دا دیتەوە ، لەبەرخۆیەوە دەی پرسی ئەوجار بۆ کوێ بڕۆم

لەسەرەتای کارەکەدا هەموو ڕێگەکانی بەڕووی خۆیدا بە داخراوی دەدیتن تەنها ڕێگەیەک لەبەردەم دا مابوو ، بەڵام گەڕانەوەی بۆ سینەما بەلاوە خۆش نەبوو زۆر دڵتەنگ بوو ، لەناکاو ( **زکری بیگ** ) ی کەوتەوە یاد

**زکری بیگ مختار** بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی میسری بەناوبانگ بوو کە ماددەی کیمیایی بەرهەم دەهێنا

ئەو لەکاتی فەرمان پێ کردن دا بۆ دەریای سوور ، ڕۆژێک **ڕەئفەت** ئەل هەجانی ناسی بوو ، **زکری بیگ** زیرەکی و شێوە قسەکردنەکەی ئەوی بەزمانی بیانی بەلاوە پەسند بوو بۆیە داوای لێ کرد تاباشتری بناسێ بۆ ئەو مەبەستەش بانگهێشتی کرد بۆ ئەسکەندەریە

گەنجەکە سەفەری کرد بۆ ئەسکەندەریە و چاوی بە زکری **بیگ** کەوت ، بەڕوو خۆشی و لاواندنەوە میوانداری لەگەنجەکە کرد ، لەبیستنی بیرەوەری یەکانی گەنجەکە زۆر نارەحەت بوو ، دەست بەجێ کارێکی لەکۆمپانیا گەورەکەی خۆی بۆ دەستە بەر کرد

دووساڵ بەسەر کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی دووەم دا تێ دەپەڕی ، لەو کاتەدا **ڕەئفەت** ئەل هەجان بۆیەکەمین جار لە دوای مردنی باوکی ، هەستی دەکرد کە ئارامی و سەربەخۆیی خۆی لەدوای ئەو هەموو ئاوارەیی یە دۆزیوەتەوە ، ئەو هەموو هەوڵ و کۆششی خۆی لەپێناو ڕاپەڕاندنی کاروبارەکاندا بەکاردەهێنا ، بەشێوەیەک کە لە دوای چەندان مانگ بوو بەمایەی شانازی و سەرسوڕمانی زکری بیگ ، ئەویش وەک کەسو کارەکانی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکرد

هەروەها زکری **بیگ** بۆی دەرکەوت کە لەگەڵ خێزانی ئەل هەجان دا پەیوەندیەکی قوڵی بەرەبابیان هەیەو لەوانەیە ئەو مەبەستێکی تایبەتیشی لەگەڵ ئەودا لەبەرچاو گرتبێ بەتایبەتی لەدوای خزمایەتیەکەی لەگەڵ **شەریفەدا** ، ئەو هەمیشە وای

هەست دەکرد کە گەنجەکە بەڕاستی لەسۆزو خۆشەویستی دایک و باوک بی بەش بووەو ئازارێکی زۆری لەدەست بەدڕەفتاری براکانی چێشتووە

**زکری بیگ** زۆر بەزەیی بەگەنجەکەدا دەهاتەوە و ڕێزی لی دەگرت لەبەرامبەر ئەوەشدا گەنجەکە بەرخۆدانی زیاتر لەخۆدا پیشان دەدا ، **زکری بیگ** هەر ئاماژەیەکی بچوکی کردبا **ڕەئفەت** پێیەوە پابەند دەبوو و دەست بەجی کارەکەی رادەپەڕاند هەتا کار گەیشتە ڕادەیەک کە **زکری بیگ** خۆزگەی دەخواست زاوایەکی وا گوێ ڕایەڵ و گونجاوی هەبا ، ئەوی بۆ نانی ئێوارە بانگهێشت کردو بەماڵەوەیانی ناساند ، دوای ماوەیەک گەنجەکە متمانە بەخۆ بوونی لادروست بۆوە ، **ڕەئفەت** دوای ئەوە کەوتەوە بیری خوێندنەکەی ، لەساڵی ١٩٤٩ خۆی بۆ زانکۆ ئامادەکرد ، ئەو دەیەویست خولی چوار ساڵەی ئامادەیی بەیەک ساڵ ببڕێت

**ڕەئفەت** هەر زوو بوو بەیەکێک لەگەنجە بەڕێزو دیارەکانی کۆمپانیاکە بەتایبەتی کاتێ کە **زکری بیگ** لەبەرپرسیارێتی یەکی نهێنی دا ناردی بۆ یەکێک لەلقەکانی کۆمپانیا لە قاهیرە کە بەڕێوەبردنەکەی لەئەستۆی کارمەندێکی کۆن دا بوو بەناوی **باسیلی جبران** ، **باسیلی جبران** هەروەک باس دەکەن ماری خۆش خەت و خاڵ بوو و دەستی لەژمێریاری و حساباتی کۆمپانیاکە وەردەدا کەسیش نەی دەتوانی لەکەداری بکات ، فەرمانداری **ڕەئفەت** ئەوە بوو کە ڕاستەقینەو ناوەڕۆکی حسابەکان دەرخات و کرۆکی شتە شاردراوەکان بخاتە ژێر باس و لێکۆڵینەوە ، ڕۆژێک **ڕەئفەت** سەری لەخێزانەکەی دا لەکاتێکدا کە ئەمڕۆ ئەو کارمەندێکی ڕێز لێ گیراوی کۆمپانیایەکی بەناوبانگە ، شادی و بەختەوەری **شەریفە** جێگای باوەڕکردن نەبوو

**ڕەئفەت** چەند دیاریەکی بۆ **تاریقی** بچکۆلە هێنابوو ، **تاریقیش** زۆر هۆگری خاڵی بوو ، هەڵوێستی **ڕەئفەت** لەنێو خێزانەکەیدا قسەو باسی زۆری هەڵایساند بەشێوەیەک کە هەندێکیان لایەنگری ئەو بوون و هەندێکیش دژی هەندێکی تر کە **شەریفە** لەسەروی هەموویانەوە بوو ، دوا ڕۆژەکەیان بە ڕوناک و درەوشاوە لێک دەدایەوە بەتایبەتی لەدوای دیداری یەکێک لەبراکانی بۆ کۆمپانیاکەو دیتنی شوێن و پایە گرنگەکەی ئەو

تاقمی دووەم بەچاوێکی سووک و گاڵتەجاڕیەوە تەماشای پایەی ئەویان دەکردو دەیان گوت : گورگ زادە سەرەنجام هەر گورگی لێ دەردەچێ

ڕۆژەکانی ساڵی ١٩٤٩ بۆ **ڕەئفەت** خۆشترین ڕۆژەکانی ژیانی بوون ئەو بەرادەیەک شادمان و خۆشحاڵ بوو کەئاگای لە کایەکانی **باسیلی جبران** نەما لەکۆمپانیاکەدا **باسیلی جبران** داوێکی بۆ داناو **ڕەئفەت** بەدل سافی تێی کەوت و هێندەی پێ نەچوو کەبە تۆمەتی تێوەگلان لەدزینی پارەی گەنجینەی کۆمپانیاکە تۆمەتبارکرا ، بۆ **ڕەئفەت** ئەوە زەبرێکی کوشندە بوو بەشێوەیەک کەلە دوای ئەو سەین و بەینە نەخۆش کەوت ، هەر لەسەر شوێنی حەوانەوەی کە ژیانی تێدا بەسەر دەبرد خانەنشین کرا

هەواڵ **بەزکری بیگ** گەیشت بەلام باوەڕی نەکرد هەرچەندە کە بەڵگەکان لەوە دانەبوون کەباوەڕ نەکرێن ، جەستەی گەنجەکە بەرادەیەک چەمایەوە کە هەتا **باسیلی جبرانیش** دڵی پێ سووتا ، ئەو پڕو پاگەندەی دەکرد کە تەواوی ئەو پارەیە لەژوورەکەی ئەودا دۆزراوەتەوە ئەگەر پارەکە بگەڕێندرێتەوە بۆ گەنجینە ئەوە کۆمپانیاکەش ڕازی دەبێ بەبێ ئەوەی کار بگاتە دادگا

* * *

ڕەئفەت بەتوڕەیی لە **محسین** ممتازی پرسی :

- قوربان ، باوەڕم پێ دەکەی ؟

**محسین** بەدڵگەرمیەوە لەهەڵلای دا

- **لیوی** باوەڕ بە قسەکانت دەکەم

- باوەڕ بکە براکانم قسەکانی من باوەڕ ناکەن بەلام قسەکانی **باسیلی جبران** باوەڕ دەکەن

دەنگی **ڕەئفەت** لەکاتێکدا کە فرمێسک بەچاوەکانیدا دەهاتەخوار پتر نووساو دوای ماوەیەک دووبارە گەڕایەوە سەر قسەکانی خۆی و گوتی

- هیچ کەس قسەکانی منی باوەڕ نەدەکرد جگە لە **شەریفەی** خوشکم و **زکری بیگ**

ڕۆژێک **زکری بیگ** بەو پەڕی دڵنیایی یەوە گوتی ڕەئفەت من قسەکانی تۆ باوەڕ دەکەم و دەزانم کە تۆ بی گوناحی ، بەلام ئەوە هەڵەی تۆ نەبوو ، ئەوە هەڵەی

من بوو چونکە تۆ ناتوانی دەرەقەتی **باسیلی جبران** بێی بەڵام چارەیەکم نەبوو ئێستاش ناتوانم تۆ دوبارە بگەڕێنمەوە بۆ کۆمپانیا

ماوەیەک بێ دەنگی باڵی کێشا ، **ڕەئفەت** وەک مار پێچی دەخواردەوە **محسین** لێی پرسی :

- ئەدی پاشان ؟

- پاشان سوێندم خوارد کەلە میسردا نەمێنمەوە

- سەفەرت کرد ؟

- **زکری بیگ** خۆی تێ هەڵقورتاندو منی لە کۆمپانیایەکی گواستنەوەو هاتوچۆی دەریایی ا بەندەر پاشا ا بەناو نیشانی یاریدەدەری کارگێڕی کەشتی دامەزراندو لەدوای ١٢ ڕۆژ سەفەرم کرد

**محسین** دەیەویست لەو ولآتانەی کە گەنجەکە بینونی بپرسێ ، بەڵام خۆی بوارد دەت گوت گەنجەکە واقی وڕماوە ، وا دەهاتە بەرچاو کە بەدەم ئازارێکی دەروونی یەوە دەناڵێنێ ، **محسین** بەسۆزەوە پرسی :

- لیوی ؟

گەنجەکە بەهات و هاوارەوە گوتی

- ئاخر ئەگەر ئەو شتەی کەلە دەرەوە ڕووی دا بۆت باس بکەم باوەڕ دەکەی ؟

* * *

دووایین بەندەر کە کەشتی میسری لوتس لەنگەری تێدا گرت ، لیورپول بوو لەڕۆژئاوای بەریتانیا **ڕەئفەت** لە هەموو ماوەی سەفەرەکەیدا چوو بۆوە ناو قۆزاخەکەی خۆی لەلایەک سووربوونی هاوکارەکانی بوو بۆ بەشداری کردنی لەگەمەیەکی سەر گەرمی بێ سەرەنجام ، لە لایەکی دی زەبرێک کە **باسیلی جبران** لێی دا زۆر جەرگ بڕو تێک شکێنەر بوو بەشێوەیەک کەژیانی لێ تاڵ کردبوو و بەهیچ کلۆجێ حەزی لەگەڕانەوە نەبوو بۆ ولآتی خۆی

لەکاتی بێ کاریدا لەسەر تەختەبانی کەشتی یەکە دادەنیشت و تەماشای لێوارەکانی ئاوی دەریای دەکردو لەئاسۆیەکی بێ کۆتایی دەڕوانی دنیا لەبەر چاوانی

بێ نرخ بوو بۆوە هەوڵی دەدا کە ڕێگەی دەرباز بوون بۆ خۆی بدۆزێتەوە بەڵام تەنها ڕێگەیەک کە دەی توانی بیگرێتەبەر ، هەڵاتن بوو

گەنجەکە گوتی بڕیارم داوە نەگەڕێمەوە بۆ میسرو نەبۆ ڕابردووم

لەوڕۆژەوە کە کەشتی لوتس لەبەندەری لیورپول لەنگەری گرت ئەویان بەزۆر بۆ چاخانەیەکی بچوک دەبرد بەڵام ئەو هێشتا هەر مەست و خومار بوو

لەوێ ڕۆژێ دا کەوتە بیری ژن هێنان لەگەڵ کچێکی بەریتانی هەژار ، کچێک کە لە خێزانێکی ئاینی دا گەورە بوو بوو

کەشتی یەکەیان چەند هەفتەیەک لە لیورپول دا ڕاوەستا تا بۆ سەفەرێکی دوورو درێژ هەندێک لەپارچەکانی نوژەن بکەنەوە ، لەو چەند ڕۆژەدا ڕەئفەت زۆر شەرمەندەو چاو بەرەژێری دەستگیرانەکەی بوو بوو ، بەڵام وای بۆ دەچوو کە بەوکچە شاد نابێ ، بۆچوونێک کە لە ناخی بیرو باوەڕەکەیەوە هەڵدەقولا هەرچەندە کە خێزانی دەستگیرانەکەی لەگەڵیدا نەرم و نیان بوون بەڵام ڕەئفەتیش هەوڵی دەدا تا بە هەر شێوەیەک کە دەکرێ لەحاست نەرم و نیانەکەی واندا بێ

دەستگیرانەکەی کامی داوای لێ کرد کەلە بەریتانیادا بمێنێتەوە چونکە کۆمەڵگای بەریتانی ویزای نیشتەجێ بوونی دەدایێ ، هەر لەو سەرو بەندەدا بوو کە ڕەئفەت تووشی ژانە دڵێکی سەخت بوو سەرەنجام گوازرایەوە بۆ نەخۆشخانەو نەشتەرگەری ڕیخۆڵە کوێرەی بۆ کرا ، کەشتی یەکە بەبێ ئەو کەوتە ڕێ و ڕەئفەتیش بەناچاری لەبەریتانیا مایەوە

ڕەئفەت ١٠ ڕۆژ لە نەخۆشخانە خەوێندرا پاشان گوازرایەوە بۆ ماڵی بەڕێز ئیدوارد فۆلف باوکی دەستگیرانەکەی ، فۆلف لەهەمان شەودا کە ئەوی لەنەخۆشخانە هێنایەوە بۆ ماڵ لە دوای جەنگی جیهانی دووەم بوو کەقەیرانی ئابوریەکەی لەمێژوودا بێ وێنە بوو و خەڵک بەدەست هەژاریەوە گیری خواردبوو و کەمتر کەسێک دەی توانی کارێکی وابکات ، لە کاتێکدا کە هەموو خێزانەکەی لەبەر سۆبە دانیشتبوون گوتی : من مەسیحیەکی مەزهەبیم و خۆشحاڵم کە کچەکەشم دڵخوازی خۆی هەڵبژاردووە بەڵام ئەگەر بێتە سەر دینی ئێمە زیاتر خۆشحاڵ دەبم

* * *

ڕەئفەت وای دەزانی کە هەموو دنیا بەسەریدا ڕووخاوە چونکە ئەو هەموو گومانەکانی لەبەرچاو گرتبوو و خۆی بۆ هەر ڕوداوێك ئامادە کردبوو بەڵام ئەو شەوە قسەکانی بابی دەستگیرانەکەی چەکوچێك بوون لەسەری دەدران ، ماوەیەك وڕو کاس بوو بەچاکی نەی دەزانی کە چ وەڵامێك بداتەوە کاتێ کە بێ دەنگی یەکە درێژەی کێشا ، **فۆلف** کە دەیەویست زوڕنای خۆی هەڵ کات گەنجەکەی وەقسە هێناو گوتی ئێستا پێویست ناکات بڕیاری کۆتایی لەو ساتەدا وەرگری ، دەزانم کە بڕیارەکە هەروا سادەش نەبوو ، بەڵام لەپێش بیرکردنەوە لەو باسە واپێویست دەکات کە لەگەڵ باوکە **جوشام** بەرپرسی کلیساکەی ئێمە گفت و گۆ بکەی

**ڕەئفەت** مۆڵەتی خواست تا دەربارەی ئەو تەنگانەیە بیربکاتەوە ، ئەو ئێستا نەجێگەیەکی هەیە تێیدا بژی و نەپارەیەکی هەیە زگی خۆی پێ تێر کات

بەڵام بەئاشکرایی بە ( کام ا ی گوت ئەو مەسەلەیە بەم جۆرەش کەتۆ لێکی دەدەیەوە هێندە سادە نیە وەك موسڵمانێك ئەگەر دان بە پەیامی حەزرەتی مەسیح دا نەنێم دینەکەم تەواو نیە ، چونکە مەرجی موسڵمان بوون لەدوای دوو شەهادەکە ئەوەیە کە دان بە پێغەمبەرانی پێش حەزرەتی محمد ( د خ ) یشدا بنێم ، بەڵام ئەو دینەی کەبەویستی خۆم هەڵم بژاردووە وازی لێ بێنم و دینێکی تر هەڵبژێرم ئەوە مەحاڵە ، دیسان درێژەی پێدا ئومێدەوارم کە هەست بەمە بکەی

**کامی** گوتی ئەو مەسەلەیە بەلای ئەوەوە بایەخێکی نیەو هانی دەدا کە **ڕەئفەت** ئەگەر لەسەر دینی خۆی بمێنێتەوە ئامادەیە شووی پێ بکات بەمەرجی هەر کەس لەسەر دینی خۆی بمێنێتەوە بەڵام گرفتەکە لێرەدایە کەباوکە **جوشام** لەو شارەدا تاقە کەسێکە کە دەتوانێ کارێکی بۆ پەیدا بکات و کێشەی نیشتەجێ بوونی لەبەریتانیا بۆ چارەسەر بکات و ئەگەر بیەوێ دەتوانێ ناسنامەیەکی تازەشی بۆ دروست بکات ، هەروەها کامی گوتی باوکم پێش ئەوەی کە لەگەڵ تۆدا قسە بکات ، هەموو لایەنەکانی کارەکەی لەبەرچاو گرتبوو ، تۆش کارێك مەکە کەببێتە مایەی سەرزەنشتی ئەو

**ڕەئفەت** لە فەلەندەرخانەیەکدا کە گۆشەیەك بوو لەماڵی **فۆلف** دەژیا هەرچەندە کە وەکو کوڕی ماڵ ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکرد هەر ئەوەش وای کردبوو کە

خۆی بەشەرمەزار بزانی لە لایەکی تریش ئەو خۆی بە زیندانیەک دادەنا چونکە لەو ولاتەدا زۆر نامۆو تەنها بوو

مانەوەکەی لە لیورپول چەندەها مانگی خایاند و لەگەڵ باوکە **جوشامیشدا** چەندەها جار چاویان بەیەک کەوت بەشێوەیەک کە چاو پێکەوتنەکانیان بە کۆڕو کۆمەڵە ئاینی یەکان دەچوون ، سەرەڕای ئەوەش لەهەموو چاوپێ کەوتنەکاندا ڕەفتاری **ڕەئفەت** وابوو کە سەرکەوتن دەستەبەر دەکات ، سەرەنجام خۆڕاگری ئەو بوو وای کرد کەتا کەشتی لوتس لە هیند نەگەڕێتەوە بەریتانیا بەجێ نێلێ

ئەو لەدوا سانەکانی ماڵ ئاوایی دا سوپاسی هەموو خۆشەویستانی ماڵی دەستگیرانەکەی کردو یەک بەیەک پێی گوتن:

- پێویستە زۆر بەجددی لەخەمی شکۆمەندی دینی ئیسلام دابن

لەکاتی ماڵ ئاوایی لە دەستگیرانەکەی دەگریاو دەی گوت ئازیزەکەم چاوەڕوان بە دڵنیابە ڕۆژێک دیسان دەگەڕێمەوە ! بەڵام خۆشەویستی **ڕەئفەت** بۆ دینی محمد مستەفا ا د خ ) گەورەتر بوو لەوە کەبکەوێتە ژێر کارێگەری فرمێسکی بەزەیی.

لەو کاتەدا ئەو بەسەربەرزی گەڕایەوە بۆ ولاتەکەی بەڵام هەر لەگەڵ گەڕانەوەی بۆ نوسینگەی کۆمپانیا لەگەڵ حوکمی دەرکردنەکەی ڕووبەڕوو بۆوە

**ڕەئفەت** لەکاتێکدا کە جانتایەکی پڕ لەدیاری و چاو ڕۆشنی لەبن هەنگڵی نابوو ، نوسینگەی کۆمپانیاکەی بەجی هێشت ، دیاریەکی بۆ زکری **بیگ** و ماڵ و منداڵەکەی و دیاریەکی دیشی بۆ خشکەزاکەی ( **تاریق** ) و خوشکەکەی ( **شەریفە** ) هێنابوو کە چەندە تامەزرۆی دیتنەوەی بوو

**ڕەئفەت** بەتەنهاو بە دڵێکی بەخەمەوە بۆ قەراخ پارکەکە ڕۆیشت ، بەبی هیچ ئامانجێک نەدەسەکنا دەهات و دەچوو لەناکاو ڕاچڵەکی و شریخەیەک لەمێشکی هەستا ئێستا کە دەرەقەتی ژیان نایێم بۆچی ململانێی لەگەڵدا بکەم ؟ ! دەست بەجێ جانتاکەی بەرەو ڕووی دەریا هەڵڕشت تالە دەست خۆشەویستان ڕزگاری بێ و دوبارە ڕێگەی بەندەر بگرێتەوە بەر

* * *

ڕەئفەت حەوت ڕۆژی تەواوی لەیەکێک لەهەرزانترین ئوتێلەکانی ڕۆخ دەریا گوزەراند بەبێ ئەوەی کە بکەوێتەوە بیری خاوو خێزانی

پاشان سواری کەشتی یەک بوو بەرەو بەندەری ( مارسی ) ڕۆیشت ، لە کەشتی یەکە لەگەڵ چەند گەنجێکی میسری دا ناسیاوەتی پەیدا کرد کە بۆ خوێندن دەچوون بۆ فەرەنسا ، برسێتی لێ برابوو ، شتێکی شک نەدەبرد جگە لە پلیتێکی پلە ٣ و کەمێک فرانکی فەرەنسی

لەبەندەری مارسی لەچەند ڕۆژێک زیاتر نەمایەوە ، سەرنجی دا کە چارەیەکی نیە جگە لەمە کە سەفەر بکات بۆ پایتەختی فەرەنسا ، لەبێ پارەییان هەموو ئەو ڕێگە دوورو درێژەی بە پێیان بڕی تا خۆی گەیاندە پاریس چونکە کۆچبەرانی عەرەب لەپاریس دا زۆر بوون ، پۆلیس نەدەپرژایە سەر پۆلێن کردنیان یان کۆچە نایاسایی یەکەیان ، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە کۆمەڵگای فەرەنسا هاواری لەدەست بێ کاری لێ هەستا بوو ، ئەوەش نەک تەنها هەر فەرەنسا بەڵکو هەموو وڵاتانی ئەوروپی گرتبۆوە ، ماوەیەک لە پاریس مایەوە بەبێ ئەوەی کە بتوانێ کارێک بۆ خۆی پەیدا بکات ، لەو کاتەدا بۆ لای لیورپول کەوتە ڕێ ، (( کامی )) وای دەزانی ڕەئفەت لەبەر ئەو گەڕاوەتەوە ، زۆر خۆشحاڵ بوو بەڵام دوای ماوەیەک گوڕو تینی پێش وازی یەکەی نیشتەوە ، ڕەئفەت بەبێ ئەم لاو لا گوتی : من لە دینەکەم هەڵ نەگەڕاومەتەوە

کامی لەکاتێکدا کە یاری بەقۆپچەی چاکەتەکەی دەکرد گوتی :

– هەوڵ بدە لانی کەم لەبەردەم قەشەدا خۆت دەرخەی !

– ئەوەیان ناتوانم

کامی چاوەکانی خۆی بۆ لای ئەو وەرچەرخاند ڕەئفەت لەکاتێکدا کە پێدەکەنی درێژەی پێدا

– کامی من پێویستم بەکات هەیە تا تواناو لێ هاتوویی خۆم بەوان بسەلمێنم . ئومێدەوارم ئەوان مەسەلەی دینی من فەرامۆش بکەن

کامی بەدۆخێکی گومان و دڵەڕاوکێ تەماشای کرد پاشان ڕەئفەت درێژەی پێدا:

– لەڕاستی دا زۆرم لەگەڵ باوکە جوشام دا باس کردووە بە یەقین دەزانم کە ئەو سەبارەت بەدینی مەسیح زۆر سەر سەخت و ڕەگەز پەرستە بەڵام عەزیزەکەم

ئەوەش دەزانم کە بەڕێوەبەرانی کۆمپانیاکان جگە لە پارە دانویان لەگەڵ هەموو شتێکی تردا دەکوڵێ

قسەی گەنجەکە سەرنج ڕاکێش بوو ، کامیش هەستی بەو دۆخە دەکرد ، هێندەی نەبرد کە باوکە جوشام بەدڵی کامی ڕەئفەتی لەیەکێک لە تۆڕەکانی گەشتو گوزاردا سەرقاڵ کرد

* * *

هەر لە مارسی یەوە تا پاریس و لە لەندەنەوە تا لیورپول خەڵکێکی زۆر گاڵتەیان پێ دەکردم و بەگەبجاڕیان دەزانیم بەڵام من قوتی نەمر نەژی خۆم بەزەبری مست و پێلاقە پەیداکرد ، ڕۆژێک لە پاریس خوخدەیەکی شەیتانی و فریودانم بەسەردا هات کە منیش دەتوانم ببم بە ملیۆنێر ! حەزەکانی مرۆڤ وایە منیش وەکو هەموو خەڵکانی دنیا دەمەوێ دەستم لەکارێکی واگیر بێ کەلەبەر منەتی براکانم بچمە دەرو ڕاستەقینەی خۆمیان پێ بسەلمێنم ، ڕۆژێک کەلە کۆمپانیایەکی گەشتو گوزار لە لیورپول دەستم بەکار کرد دەم زانی کە باوکە جوشام مەسەلەی دینی فەرامۆش کردووە ، بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیاش هەر وا

* * *

چرکە ژمێری سەعاتی قەد دیوارەکە سەعات ٢ ی پاش نیوەڕۆی پیشان دەدا ، دەنگێک لەباڵەخانەکە هەستا

کاتێ کە ڕەئفەت دەرگای کردەوە چاوی بەپاسەوانی بیناکە کەوت کە خواردنی بۆ هێناوە ، پاسەوانەکە گوتی : ئەوە کەبابی کاک لیوی یە

ڕەئفەت لە محسینی ڕوانی و ئاماژەیەکی کرد کە خواردنەکەی لێ وەرگرێ ، ڕەئفەت وەری گرت و گوتی پارەکەی چەند دەکات ؟

پاسەوانەکە گوتی ئەدی پارەکەت لە لایەن هاوڕێکانتەوە نەدراوە ؟

ڕەئفەت سوپاسی کردو ٥ قرۆشی پێ بەخشی و درێژەی پێدا

- تۆ قەت هیچت لەبیر ناچێ

لەگەڵ ئەوەدا کاغەزە پێچراوەکەی کردەوە چونکە هەردووکیان برسیان بوو ، دەستیان بە مڵچە مڵچ کردو سەر گەرمی خواردنەکە بوون

تۆزی غەم و خەفەت کە دەم و چاوی گەنجەکەی داپۆشی بوو وردە دەڕەوییەوەو **محسینیش** بە دیقەتەوە ئەو دۆخەی خستبۆ بەرچاودێری و سەرنجەوە **ڕەئفەت** لێی زیاد کرد یەکەمین کار کە ئەنجامم دا ئەوە بوو کە بە بەڕێوەبەری کۆمپانیا ا **توماس کوک** ) م گوت ، پێشنیاز دەکەم کە ڕاکێشانی گەڕیدەکانی میسرو تەواوی وڵاتانی ئیسلامی بۆ من دانێ کۆمپانیای **توماس کوک** کۆمپانیایەکی نێو نەتەوەیی و پڕ حەشیمەت بوو و لەهەمان کاتدا سەفەرکردنی گەڕیدە میسری یەکانی وە ئەستۆ گرتبوو

بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە ئەوەی بەمایەی گاڵتەجاڕی دەزانی و دەی گوت کۆمپانیای **توماس کوک** خەڵکی زۆری هەیەو بۆ ئەو مەبەستەش واباشترە تۆ ڕێگەیەکی تر بۆ پارە بگریە بەر ، گەنجەکە پێی گوت :

- هەموو ئەوانە دەزانم بەڵام چۆن تاقیان بکەمەوە !

بەڕێوەبەر بەدۆخێکی تایبەت شانی هەڵتەکاندو **ڕەئفەت** دەستی بەسەفەرەکەی کرد بەرەو لەندەن ، لەباڵیۆزخانەی میسر لە لەندەن **ڕەئفەت** توانی بەهاوکاری کەسانی بەتوانا سەرنجی بەرپرسان بۆ لای خۆی ڕابکێشێ ئەو چاک لەبارێی دەزانی کە چۆن ڕەفتار لەگەڵ خەڵکدا بکات بەتایبەتی لەگەڵ خەڵکی میسر

کەسایەتیە سەرنج ڕاکێشەکەی و شان و شەوکەت و شێوازە بێ هاوتاکەی لایەنی بەرانبەری بە خێرایی ڕازی دەکرد ، هەستی نیشتمان پەروەری لەنێو میسریە نیشتەجێکانی باڵیۆزخانەدا هەڵایساند بوو بەشێوەیەک کە لێی گەڕابوون چارەنووسی خۆی بسازێنێ .

بەهەرحاڵ ئەو لەچەند ڕۆژێک زیاتر لە لەندەن نەمایەوەو دوای ئەوەی کە گەڕایەوە لیورپول و بەهۆی گرێ بەستە یەک مانگیەکەی ٢٠٠ پۆندی بەریتانی پەیدا کرد

کامی **فۆلف** ئێستا لە هەموو کەس خۆشحاڵ و بەختەوەرترە ، نەک تەنها چونکە پەیمانێکی پتەوی لەگەڵ دەستگیرانەکەی بەستووە بەڵکو لەبەرئەوە کە باوکە

**جوشامیش** مەسەلەی دینی لەبیر خۆی بردۆتەوە سەرکەوتن بەدوای سەرکەوتن دا دەهات گەنجەکە گرێ بەستی بەسوودی زۆر بەست و کاروباری کۆمپانیاکەش برەوێکی زیاتری بەخۆیەوە بینی و گورج و گۆڵ تر بوو ئێستا بەرزە فڕی و مەرامەکانی گەیشتوونەتە لوتکەو ئاسۆ دوورەکانی لێواری ئۆقیانوسی ئەتڵەسی تا لێوارەکانی ئەمریکا هەموار دەکەن

لەمەڕ ئەو گرێ بەستە ئاڵۆزانەدا سوودێکی یەکلایەنە بە کۆمپانیاکە دەگەیشت ، کاتێ کە گەنجەکە بۆ چوونی خۆی بەبەڕێوەبەری کۆمپانیاکە گوت ، بەڕێوەبەر بەبێ مشتومڕ ڕازی بوو ، باسەکە بۆ گەنجەکە ئاڕادەیەک چاوەڕوان نەکراو و شادی بەخش بوو چونکە ٥٠٠ پۆندی لە کۆمپانیا داواکرد بوو و تەنها ١٠٠ پۆندی وەرگرتبوو ، کۆمپانیای ڕێگەو بانی **توماس کوک** پلیتێکی فڕۆکەی لە کۆمپانیای هەوایی فەرەنسا دایە تا بچێتە نیۆرک ، ئێستا ئەو پیاوانە لە پەرەسەندن دایە

**کامی** هەتا فڕۆکەخانە لەگەڵیدا ڕۆی بەو ئومێدەی کە چەند هەفتەیەکی تر سەردانی یەکتری بکەنەوە بەڵام نەی دەزانی کە ئەوە دواجاریەتی ئەو ببینێتەوە ، هەر کە گەنجەکە گەیشتە نوسینگەی کۆمپانیا لە نیۆرک خۆی بە بەڕێوەبەرەکە ناساند بەڵام شتێکی چاوەڕوان نەکراو ڕووی دا و ئەویان بەتۆمەتی دزینی پلیتی فڕۆکە لە کۆمپانیاکە دەرکرد ئەوجارەیان زۆر گوێی نەدایێ و مەسەلەکەی زۆر بەهەند وەرنەگرت چونکە تێ گەیشت کە هەموو ئەو پیلانانە بۆ دانەوەی ٤٠٠ پۆندەکەیە ، ڕاما کە ئیتر ناتوانێ کارێک بکات چونکە ئۆقیانوسێک کەوتبۆ بەینی ئەو و بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە

دیسان بەدڵێکی بەغەمەوە وەکو مشکێکی بریندار ئارامی لێ هەڵگیرا بوو و کونێک نەما بوو سەری پێداکا

ئەو دیسان بەتاوانێک کە هێشتا بەسەریدا ساغ نەبوو بۆوە سزای دەچێشت ، ئێستا ڕۆژ بەڕۆژ پارەکەی کەم دەبێتەوە ئەوجار فێڵێکی تازەتری هێنا ، توانی لەیەکێک لەکۆمپانیا گەڕۆکەکان کارێک پەیدا بکات ، هەر زوو زوو بەهۆی بیر تیژی و ناسیاوەتی خۆی ئەو بیرۆکەیەشی سەری گرت

بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە ئەوەندە متمانەی پێ کرد کە کار گەیشتە ئەو ڕادەیە کە چەکەی پارەی بخاتە ژێر دەستەوە تا کارەکان باشتر بەڕێت بەڕێوە و چاکتر ڕایان بەڕێنێ ، هەرچی ویست دایان پێی و دوای چەند ڕۆژێک هەموو پارەکانی گەڕاندەوە ، پاشان چەکەیەکی لێ داواکردن بەڵام بەبڕێکی زیاتر و دوای چەند ڕۆژێک ئەویشی دایەوە ، پاشان چەکەیەکی بەبڕی ٥٠٠ دۆلاری لێ داواکردن پاشان سەفەری کرد بۆ کەنەدا ، زۆر لە کەنەدا مایەوە ، دەی زانی کە ئێستا تۆمەتەکەی دوو ئەوەندە بۆتەوەو لە ( مونترال ) یش لەدەست پۆلیسی ئەمریکا بێ منەت نەبووە ، دەست بەجێ بیرێکی تازەی بەمێشکدا هات ، ٥٠٠ دۆلاری لە یەکێک لەبانقە ناسراوەکان دانا پاشان چەکێکی دەستی وەرگرتەوە ، لەو سەردەمەدا بڕی دیاری کراو لەسەر چەکە دەستی یەکان دەنوسرا ، چەند ڕۆژێکی نەبرد کە بەیەک جار هەموو بڕەکەی بەچەکەیەک لەبانقەکە ڕاکێشایەوە و چەکە دەستی یەکەی لە لای خۆی هێشتەوە کە دەری دەخست کەلە حسابەکەیدا ٥٠٠ دۆلاری هەیە ، پاشان چوو بۆ ئەوروپا ئەوروپا لەو کاتەدا هێشتا مۆرکی مارشاڵی پێوە بوو و دۆلاری ئەمریکی لەهەموو وڵاتانی ئەوروپا سەبارەت بە تەواوی یەکەکانی دراو بایەخی زۆر بوو ، فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی پاریس نیشتەوەو ئەوە دووەمین جاری بوو کە گەنجەکە پێی دەنایە پایتەختی فەڕەنسا ، بەلایەوە ئەستەم نەبوو کەبە ئەسپایی ئاگای لەخۆبێ .

ئەو هێشتا لە لایەن پۆلیسی ئەمریکاو بەریتانیاوە هەر لەژێر چاودێری دابوو ، چونکە هەندێک لەو چەکانەی کە شوێنی دەرچوونیان لەسەر نەنوسرابوو بە دۆلار ڕای دەکێشاو بەخەڵکی دەفرۆشتەوە و لەقەرەبوو کردنەوەدا ٣/١ ی بڕەکەی بە فرانکی فەڕەنسی وەردەگرتەوە ، بەڵام هەر کە بڕەکەی وەردەگرتەوە ون دەبوو ، لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر هەڵدەهات ، لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی ترو هەر لەفەڕەنسا و هۆڵەنداو بەلجیکەوە دەڕۆی تا دەگەیشتە ئەڵمانیا ، تا وای لێ هات لەگەڵ کەسێک ڕووبەڕوو بۆوە کەمافی نیشتەجێ بوونی داوا دەکرد و سەرەنجام دیسان گەنجەکە سودی لەبێ ئاگایی و نەشارەزایی کەسەکە وەرگرت و پاسپۆرت و چەکە دەستی یەکەی دزی و ون بۆوە ، بەلای کەسەکەوە چەکە دەستی یەکە گرنگیەکی ئەوتۆی نەبوو بەڵام بەدبەختیە گەورەکەی ئەو ئەوە بوو کە لەئێستاوە بەکەسێکی بێ پاسپۆرت و قاچاخ دەناسرا ، ئەو کاتە لە ئەڵمانیا کڕین و فرۆشتنی پاسپۆرتەکان دەکرا چونکە نازیەکان هەوڵیان دەدا

پاسپۆرتی بیانی یەکان بەدەست بێنن تا کەسایەتیە ڕاستەقینەکەی خۆیان بشارنەوە کاتی کە دەستەی وەرگرتنی پاسپۆرت چوو بۆ کونسولگەری میسر لە ئەلمانیا بەرپرسی کونوسلگەریەکە ئەوەی قبوڵ نەبوو و پێیان گوت : تۆ پاسپۆرتەکەی خۆتت فرۆشتووەو ئێستا

ڕەئفەت ئەل هەجان دیسان کەوتەوە تەنگانە و هەستی کرد کە جگە لە گەڕانەوە بۆ میسر ڕێگە چارەیەکی دیکەی نیە بەڵام پارەی پلیتی فڕۆکەکە لەکوێ بێنێ هەموو هەوڵەکانی خۆی خستە گەڕ تا کۆمپانیای فڕۆکەوانی هۆڵەندای ڕازی کرد تا پلیتی بداتێ و پارەکەی لە قاهیرە وەرگرێتەوە ، بروسکەی بۆ براکەی کرد تا لە قاهیرە پارەی پلیتەکەی بۆ بدات ، بەچاوەڕوانیەوە دانیشت ، هەموو ڕۆژێ دەچۆ نوسینگەی کۆمپانیاکە بەڵکو وەڵامێک لەقاهیرەوە بێت ، چەند ڕۆژێک تێ پەڕی ، دۆخەکەی ڕۆژ بەرۆژ خراپتر دەبوو تا ئەوەی ڕۆژێک سەری لە نوسینگەی کۆمپانیا داو پرسی ئایا وەڵامێک لە قاهیرەوە نەگەی ؟ داوایان لێ کرد کەمێک چاوەڕوان بێ ، گەشایەوە ، چەند خولەکێک تێ پەڕی و دوای ماوەیەک پۆلیسی ئەڵمانیا وە ژوور کەوت و بەتۆمەتی دزینی بلیتی فڕۆکە لە نوسینگەی کۆمپانیای توماس کوک دەستگیریان کرد ، ئێستا یەکەمین جارە لە ژیانی دا لە فرانکفۆرد زیندانی دەکرێ ، لەوێ سێ مانگ مایەوەو دادگایی کرا بەڵام بەهۆی نەبوونی بەڵگەی تەواو ، بەبێ گوناح دەرچوو ، ئەوەشیان بەلای ئەمەوە زۆر گرنگ نەبوو بەڵام گرنگیەکەی ئەوە بوو کە بەحوکمی دادگا بۆ وڵاتی خۆیان بەڕێ دەکردەوە

لە میسر دا هەموو دەرگاکانی بەڕودا داخرابوون هەتا ماڵی خوشکەکەشی شەریفە ، چونکە مێردەکەی سەروان[1] محمد رفیق کە تازە بەپلەی سەرگورد بەرز کرابۆوە هاتنەوەی ڕەئفەتی لەماڵی خۆیان قەدەغە کرد بوو ، سەرگورد محمد رفیق ئەو باسەی بەبێ ڕوپامایی بەبێ گوێ دان بەفرمێسکەکانی هاوسەرەکەی ( شەریفە ) و پاڕانەوەکانی تارقی بچکۆلە بەڕاشکاوی ڕاگەیاند

شۆڕشی ٢٣ ی حوزەیران لەو وەختەدا ڕووی دا و ڕەئفەت دەی زانی کە پۆلیس بەدوایدا دەگەڕێن بەبێ ئەوەی کە هۆیەکەی بزانێ .

(1) پلەیەکی لەفسەری یە لە سوپا دا

ڕۆژێک لەگەڵ گەنجێکی فەڕەنسی بەناوی **دانیل مارتان** ناسیاوەتیەکی پەیدا کرد گەنجەکە بۆ دیتنی شوێنەوارە ئاساریەکان و دەرەنجامی کارە زانستی یەکانی هاتبۆ میسر ، **ڕەئفەت** خۆی لەگەڵدا ڕێکخست و هەندێک ناوچەی لەگەڵ گەڕاو ئەو دەرفەتەشی بەهەل زانی تا پاسپۆرتەکەی بدزێتەوە بەلایەوە ئاستەنگ نەبوو کە وێنەی پاسپۆرت و مۆرەکە تەزویر بکات بەم شێوەیە لەسەر پاسپۆرتەکە لە جیاتی وێنەی گەنجەکە وێنەی خۆی پێوە لکاند ، بۆ ماوەیەک لەیەکێک لە ئوتێلە گەورەکان دای کوتا و لەدوای ئەوە پاسپۆرتێکی تری بەدزی هەڵگرت و بۆ ماوەیەک خۆی شاردەوە ، جارێکی ترو لە ئوتێلێکی تر هەم دیس ئەوەی دوبارە کردەوە بەڵام بە پاسپۆرتێکی ترو ناوێکی تر

گەنجەکە هاتەوە بیری کە چەند جاری تریش ئەو کارەی کردووە ، بۆیە بەئاشکرایی دانی پێدانا کە ئەو کارەی کردووە ، هەتا ڕۆژێک پاسپۆرتێکی بەناوی **احمد علايلي** کەوتە بەردەست ، وێنەکەی گۆڕی و پاشان مۆرەکەی تەزویر کردو پێی چۆ پۆرت سعید ، حەزی لێ بوو کە جارێکی تر ئارامی لەژیانی خۆیدا تاقی بکاتەوە ؛ لە پۆرت سعید لە یەکێک لە کۆمپانیاکان لەسەر ناوی **احمد علايلي** دەست بکاربۆوە ، لە دوای دوو مانگ بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە داوای لێ کرد کە بچێت بۆ پێشوازی یەکێک لە کارگوزارانی کۆمپانیاکە بەناوی **اسماعيل بيگ شوكت** هەر ئەوەندە ناوی ئەو کابرایەی بەر گوێ کەوت چۆوە ماڵێ و هەموو کەل و پەلەکانی کۆکردەوەو سواری شەمەندەفەر بوو و گەڕایەوە قاهیرە ، **اسماعيل بيگ شوكت** مێردی پوری بوو

لەسەر ناوی **احمد علايلي** لە یەکێک لە ئوتێلەکانی قاهیرەدا ژوورێکی گرت ، لەهەمان ئوتێل دا کچێکی ئەمریکی بەناوی **جون برات** ڕفاندو ناوی ئەوی لە جونەوە گۆڕی بە جونی و میسری بەمەبەستی لیبیا بەجێ هێشت

نەی دەزانی بۆ کوێ دەچێت ، پاشان ڕێگەی بن غازی گرتە بەر ، هەتا لە هەندێک شوێن ماوەیەکی زۆر بەچرقەی هەتاو بەپێ دەڕۆیی ، ئەو ئوتومبێڵەی کە ئەوی هەڵگرتبوو لە بن غازی ڕاوەستا ، لەوێ لە بازگەیەکی پشکنین سوپای بەریتانیا سەیارەکەیان ڕاگرت داوای پاسپۆرتیان لێ کردو ئەویش بەبێ ترس و ڕامان و زۆر بەئاسایی و دڵنیایی تەواوەوە پاسپۆرتەکەی دانێ بەڵام نەی زانیبوو کە پاسپۆرتەکەی بەئارەقەی باخەڵی تەڕ بووە و وێنەکەشی داخوراوە

بەریتانی یەکان دەیانەویست بیگرن گەنجەکە ڕای گەیاند کە ناوی **لیوی کوهنە** و جوولەکەبەو لەشۆڕشی میسر هەڵاتووە ، ئەو وەکو بەریتانیەکان زمانەکەی بەباشی دەزانی ، فەرمان پێ کراوان لە کارەکەی بەدگومان بوون و گومانیان پێ برد کە ئەو یەکێکە لە سەربازانی بەریتانی هەڵاتوویی جەرگەی شەڕ ، ا ئەو قسەو باسانە لەو کاتانەدا باو بوون ا ، پاشان پەنجە مۆریان پێ کردو ناردیان بۆ پۆلیسی نێو نەتەوەیی ئەنتر پول ، کاتێ کە وەڵامەکە گەڕایەوە نووسرابوو کە ئەو میسری یەو ناوی **ڕەئفەت** ئەل هەجانە ، بەم شێوەیە دوبارە گێڕایانەوە بۆ میسر ، بەڵام ئەو خۆی بەدەستەوە نەدا

بە هێندرانەوەی بۆ ئەسکەندەریە دادو هاواری وەڕێ خست و بەدەم هەڕەشەوە دڵنیای دەکردنەوە کە ئەو ئەمریکی یەو دەبێ دەست بەجێ بدرێتەوە بە کونسوڵگەری ئەمریکا ! ئەو کەل و پەلانەی کەلە لیباوە لەگەڵ خۆی هێنابوون نیشانیان دەدا کە میسری یەو ناوی **ڕەئفەتە** بەڵام ناوێکی تریشی بەناوی **لیوی کوهن** هەیە ، لە بەندیخانەدا ئاشنایەتی لەگەڵ جوولەکەیەک بەناوی **ئەفرایم سلومون** دا پەیدا کرد ، لەمێژ بوو بەتەما بوو ئەگەر هەلێکی بۆ بڕەخسێ بیدوێنێ ، کە دەرفەتی بۆ ڕەخسا لێی چۆ پێش و لێی پرسی کوێندەری ؟ خەڵکی کوێی ؟ **ڕەئفەت** کەمێک دووری خستەوەو بەزاراوەی فەرەنسایی قسەی دەکرد ، لەجۆری هەمان ئەو زاراوەیە بوو کە جوولەکەکانی میسر لەو ڕۆژگارەدا قسەیان پێ دەکرد پاشان لەژێر لێوەوە گوتی

- زۆر قسە مەکە دیوار گوێی هەیە

بەشی یەکەمی ئەو ڕستەیەی بەفەڕەنسی گوت و دووەمەکەی بە عەرەبی ، جوولەکەکانی میسر زۆربەی کات بەم شێوە قسەیان دەکرد ، **ئەفرایم سلومون** لەو گرفتانەی کە هاتبوونە بەردەمی گەنجەکە دەکۆڵیەوە بەڵام ئەو بەزاراوەی فەڕەنسایی لەباسەکەی دوور دەخستەوە

- گرفتێک لە ئارادا نیە

پاشان بەعەرەبی درێژەی پێدا ئەوانە فریویان خواردووە **ئەفرایم سلومون** کەوتە داوی **ڕەئفەت** و دڵنیایی بۆ پەیدا بوو کە ئەو جوولەکەیەو پیلانێکی نهێنی پێیە ، بۆ جوولەکەکان و ئیسرائیل ! بەڵام کاتێ کە لەئەسکەندەریە ڕاستی یەکەی

بۆ دەرکەوت و ڕواڵەتەکەی ناسی کەوتە گومان و دڵەڕاوکێوە بەڵام بڕیاری دا ڕەوانەی قاهیرەی بکاتەوە

*       *       *

قەدەرێک بێ دەنگی سەری هەڵدا ، **محسین** هەر چەند تەماشای **ڕەئفەتی** دەکرد ، زۆر بەشەکەتی دەهاتە بەرچاو و هەستی دەکرد کە هەناسەی بەسەختی لێ دەداو سنگی دەگوشێ هەر وەک ئەوە کە بارێکی گرانی هەڵگرتبێ ، **محسین** بێ دەنگ بوونەکەی بەحورمەتەوە لێک دایەوەو هیچ قسەیەکی نەکرد تا لەپڕ گەنجەکە کردی بەهەرا

- بەلای منەوە بایەخێکی نیە

گەنجەکە دەت گوت لەبەر خۆیەوە قسەدەکات ، **محسین** پێکەنی و پرسی

- چ شتێک بە لای تۆوە بایەخی نیە

- بە لای منەوە بایەخێکی نی یە کە باوەڕم پێ بکەی

**محسین** بەسەر سوڕمانەوە برۆکانی هەڵتەکاند و گەنجەکە درێژەی پێدا

- بەڕاستی دەبێ بۆچی تۆ باوەڕ بەقسەکانم بکەی ؟ !

**محسین** لە کاتێکدا کە شێوازی وت و وێژەکەی دەگۆڕی ، پرسی :

- ئەو پیاوە جوولەکەیەت ( **ئەفرایم سلومون** ) دێتەوە یاد ؟

- بەڵێ شێوەکەیم لەبەرچاوە

- بۆچی گرتیان ؟

- نازانم .

**ڕەئفەت** هەوڵی دا وەبیری بێنێتەوە بەڵام نەی توانی ، پاشان گوتی

- لەڕاستی دا نەم دەویست بی ترسێنم و لەخۆمی دوورخەمەوە

- واتە ئەو دەزانێ کە ناوی ڕاستەقینەی تۆ **لیوی کوهن** نیە

- ئەوە شتێکە کە من پێم گووتووە

دوبارە بێ دەنگی سەری هەڵدایەوە

گەنجەکە دەست بەجێ پرسی

- من هەموو شتێکم پێ گوتی   تۆ بە منت نەگوت کیی ؟ !

**محسین** هەستا بڕواو گوتی

- تۆ چیت دەوێ ؟

- لانی کەم ناوەکەت بزانم

- **محسین**

- گەنجەکە کردی بە گاڵە

- قوربان لێرە پێنج ملیۆن کەس بەناوی **محسین** و **حەسەن** و **حسێن** و **حسام** هەیە

**محسین** لەکاتێکدا کە پێ دەکەنی گوتی

- ناوی من **محسین ممتازە**

- سەرکەوتم ... سلاو

- شتێکی ترت دەوێ بیزانی

- جەناب بەمن بڵێ باسەکە چیە ؟

**محسین** بە سۆزێکی دۆستانە ، دەستی لەسەر شانی داناو لێی پرسی

- ناتەوێ گەشت بکەی ؟

- حەزم لێیە خوشکم **شەریفەو تاریق** ببینم

- ئێستا نا

- بۆچی

- پێویست ناکات بچیتە لای براکانت

**هێلن** هەستی دەکرد کەلە بەردەم یەکێک لەڕۆمانە ڕوداوە سیخوڕیەکاندا وچانی داوە   بەلام لەیەک سات دا بەبیری داهات کە گەنجەکە هەمان دویدی هاوسەریەتی ، هاوەڵی مێردی

بیستنی ڕووداوەکە یان خوێندنەوەی لەکتێبێکدا یان تەماشا کردنی فلیم شتێکەو ناسینی قارەمانەکەی شتێکی ترە ، ئەو ئێستا لەبەردەم داستانێکی ڕاستەقینە دایە ، داستانێک کە ڕووداوەکانی لە فلیم و کتێبەکاندا ڕووی نەداوە بەڵکو قارەمانەکەی لەگەڵ مەترسی یەکی ڕاستەقینەدا ڕووبەڕوو بۆتەوە

# بەشی هەشتەم

# یا کوب بنیامین حنانیا

- قوربان کارێکیش بە من ناسپێری ؟

**محسین** سکەیەکی دە لیرەی لە گیرفانی دەرێناو لەکاتی وێدانیدا گوتی

- ها بگرە ! ئێستا سێ ڕۆژ دەرفەتت هەیە کەبە شاری ا خوب ا دا بسوڕێیەوە بە ئارەزوی دڵی خۆت

- ئەوانە هەموویان ئی منن ؟

- لەبیرت نەچێ کە ناوت **لیوی کوهنە**

- دڵنیابە

- وە ئەگەر **ئەفرایم سلومونت** دی لێی گەڕێ بابزانێ کە ئەوە ناوی ڕاستەقینەی تۆ نیە

- ئەدی ئەگەر لە ناوی ڕاستەقینەی منی پرسی ؟

- هیچی پێ مەڵێ جگە لەوەی کە من پێت دەڵێم

**محسین** ئەوەی گوت و بۆ لای دەرگای ژوورەکە ڕۆیشت و درێژەی پێدا

- ڕۆژی ٥ شەممە سەعات ١٠ ی بەیانی خوا حەز بکات دەبێ بت بینم

**ڕەئفەت** گوتی

- ئەدی ئەگەر پێویستیم بەتۆ بوو ؟

- من لەپەنا خۆت دەدۆزیتەوە

* * *

**محسین** ئەوەی گوت و ڕۆیشت ، خانم **سمحون** ماندوو دەهاتە بەرچاو و سەعات نزیکەی ٤ ی پاش نیوەڕۆ بوو ، کاتێ کە **عەزیز جەبالی** لە گێڕانەوەی پاشماوەی داستانەکە بۆوە ماندوویی و شەکەتی پێوە دیاربوو بێ دەنگیەکە زۆری نەخایاند ، هێلن **سمحون** گوتی

- جەفای زۆرت لەگەڵدا کێشام

- ئەوە دینێکە کە دوید بەگەردنی ئێمەیدا هەڵواسیوە

- مەبەستت ڕەئفەتە ؟

عەزیز لە کاتێکدا کە دڵی خۆش بوو ڕووی تی کرد و هێلینیش درێژەی پێدا

- وا هەست دەکەم کە بە لوتکە شاخێکی بەرزدا هەڵدەگەڕێم .

- ئێستاش حەز دەکەی ڕاستەقینەی کارەکە بزانیت ؟

- زۆر

ئەوەی گوت و لەشوێنی خۆی هەستا ، عەزیزیش هەستا پێ و گوتی

- بەس تا سبەینێ ماڵ ئاوا !

عەزیز تا لای سەیارەکە بەڕێی کرد

* *

هەندێک جار هێلن خۆش باوەڕانە دەکەوتە بیرکردنەوە واتە دەکرێ قارەمانی داستانی ژیانی منیش وەکو قارەمانانی فلیمەکان لە داستانەکاندا زیندووبێتەوە ، ئایا مەحاڵە کە مەرگی ئەو ، لە خەیاڵی من دا ڕووی دابێ ؟ پاشان ڕاستەقینەیەکی تاڵ پەردەی خۆڕاگری دڕاند ، نا ! ئەو مەرگی دویدی بەچاوی خۆی بینی بوو ، بەڵام گەڕانەوەی ئەو هاوسەرە میهرەبان و بەئیمانە بۆ ناو ژیانی ئەو و منداڵەکانی مەحاڵ بوو

هێلن لەپشت پەنجەرەی سەیارەکەوە تەماشای جادەکانی قاهیرەی دەکرد ، هەوا وردە وردە تاریک دادەهات گڵۆپەکان پێ بوو بوون سەیارەکان بەنێو ترافیکەکان دا تیژ تێ دەپەڕین ، لە لای چەپی ، حسێن شوکری بەبێ دەنگی دانیشتبوو و هەوڵی دەدا تا ئارامی میوانەکەی خۆی بپارێزێ ، سەیارەکەیان بۆ لای شوقەی گەڕەکێکی شوێنی نیشتەجێ بوونی هێلن بادایەوە

* *

کچانی شوقەکە بەسۆزەوە لەدەوری **هێلن** کۆبوو بوونەوە **هێلن** سوپاسی هەمووانی کردو داوای لێ کردن وازی لی بێنن نانێکی ئێوارەی سادەی خوارد کچێک کە زمانی ئەڵمانی باش دەزانی لەگەڵ **عەزیز** کەوتە گفت وگۆ پاشان **عەزیز** ئەوی لەبیر خۆی بردەوە ، **هێلن** هەرچەندە هەواش سارد بوو لە هەیوانی شوقەکە دانیشتبوو و بیری لەمێردەکەی دەکردەوە ، بیر لەو ستەمانەی کە دەرهەقی کرابوون ، بیر لەو کەسانەی کە ئاوارەیان کردبوو و ڕایان کێشا بۆ نێو ئەو بێ ئومێدی و هەناسە ساردیەوە ، بیر لەو غەدرەی کەبە فێڵباز ناوزەدیان کردبوو بیر لەو دەستەواژە ڕەق و پڕ لە قینانە کە وەکو گوللە ئاراستەیان دەکرد ، بیر لەو ڕەفتارە جەنگەڵیە کە ناچاریان کرد بوو بەرۆکیان بەرداو واز لەنیشتمانەکەی بێنێ و بەرەو هەندەران هەڵبێت ، بەلام کاتێ کە نیشتمانەکەی میسر پێویستی پێی دەبێ ، گیان لەسەر لەپی دەست تا دواسانی تەمەن لە خزمەتی دادەبێ و ژیانێکی تۆکمەو تەسەل بەترسناکی و تۆقان دەگوزێتەوە بەشێوەیەک کەلە هەر ساتێکی ژیانیدا هەستی بەمردن کردووە

بەڵام کاتێ کە ئاشنایەتی لەگەڵ ئەودا پەیدا کرد ، ڕازی و بەختەوەرو بەکەیف بوو ، ئەو هەست و سۆزو خۆشەویستی بۆ دین و نیشتمانەکەی لەدڵدا ڕواند ، **هێلن** تا سبەینێ بەیانی جگە لە چەند سەعاتێک زیاتر نەخەوت .

کاتێ کە **عەزیز جەبالی** سبەینێ بەیانی چاوی بە **هێلن** کەوت هەرکام هەوڵیان دەدا بەپێکەنینەوە پێشوازی لەیەکتری بکەن بەلام دەم و چاوی یەکێکیان بێ تاقەتی پێوە دیار بوو کە ئەویش یادەوەری و بێ خەوی شەوی ڕابردوو بوو ، بەلام **هێلن** هەموو خولیاکانی ئەوە بوو تا پاشکۆی داستانەکە ببیستێ

*        *        *

لەدوای ئەوە کە **محسین ممتاز** گەنجەکەی پەراوێز کرد و پێی گوت سێ ڕۆژ مۆڵەتت هەیە ، ئیتر ئەوە قەناعەتێکی بۆ ڕەئفەت دروست کرد بوو کە **محسین ممتاز** ئەفسەرێکی هەواڵگرە ، بۆیە هەوڵی دا تا دڵەڕاوکێ و هانی هانی لەسەر خۆی لاببات و گەشبین بێ بە ئاییندە

گەنجەکە لە دوای ئەوە کە بواری کاروبارەکانی لەگۆشە جیاوازەکانەوە توێژیەوە وەڵامی کۆتایی بەم جۆرە دەست کەوت **محسین ممتاز** جگە لە هەواڵی ئەو جوولەکانەی کە ماڵ و سامانی خۆیان بۆ دەرەوە ڕادەگواست شتێکی تری مەبەست نەبوو ، بەڵام پرسیارێک کە ڕووی لەو دەکرد و وەڵامەکەی نەدەزانی ئەوە بوو کە بۆ دەبێ گەیاندنی هەواڵی جوولەکەکان نیازی بەو هەموو ئەسپایی یە هەبێ ؟ ئەو هەموو حەشاردان و شاردرانەوەی بۆچی یە ؟

گەنجەکە وەڵامێکی بنەبڕی بۆ ئەو پرسیارانە دەست نەدەکەوت ، بەڵام گوێی خۆی لێ ئاخنین نەک لەبەر ئاسان کاری بەڵکو دەی زانی کە زیانی نەکردووە ، هەرچی بێ بەو کارەی خۆی لەشەڕی ئاوارەبوون دەپارێزێ

گەنجەکە لەو شتەی کە دەی گوت بێ ڕادە ڕاستگۆ بوو بەڵام سەیرەکە لەوە دابوو کە گەنجەکە لە سێ یەمین ڕۆژی نیشتەجێ بوونیەوە هێشتا لەباڵەخانەکە نەچوو بۆدەر

**محسین** سەرەتا وای بیر دەکردەوە کە لەوانەیە گەنجەکە بەهۆی ئاوو هەوای ساردی قاهیرەوە تووشی لەرزو تا ببێ بەڵام کاتێ لەوەختی دیاری کراو دا سۆراخی هەڵگرت ، وەک کوڕە دەوڵەمەندان بەجل و بەرگێکی ڕێک و پێک و پۆشتەی هاتە بەرچاو

- لەسێ ڕۆژی ڕابردوودا چیت کردووە **لیوی** ؟

لەکاتێکدا کە هەموو هەڵسوکەوتەکانی بەنهێنی خستبۆ ژێر سەرنجەوە بەڵام هەندێک خاڵیش هەروا بە هەڵپەسراوی دەمانەوە ، خولیای گەنجەکە ئەوە بوو کە بەهەوای حاڵ خۆش و دەوڵەمەندان بژی ، **محسین** تێ گەیشت کە گەنجەکە حەزی لەناوداری و خۆ دەرخستنە ، ئەو بۆ هەر جێگایەک دەڕۆی خۆی وا دەنواند کە گوایە هێشتاش دوڕو مەرجانی باوکیەتی .

ڕۆژێک لەکاتێکدا کە **ڕەئفەت** سەبارەت بەسێ ڕۆژی ڕابردوو قسەی دەکرد ، **محسین** لێی پرسی :

- واتە تۆ دوێنێ هەر لەماڵ نەچوویە دەر ؟

-نە

- بۆچی ؟

- لەڕاستی دا ترسام

- **لیوی** ! لە چی ترسای ؟

- پێری شەو کاتێ کەلە چێشتخانەیەک دەهاتمە دەر ، لەناکاو چاوم بە پیاوێک کەوت کە ناوی **ئەفرایم سلومون** بوو

**محسین** بەدڵنیایی دەی زانی کە **ئەفرایم سلومون** کێ یە

ئەو هەمان ئەو گەنجە جوولەکەیە بوو کە **ڕەئفەت** ئەل هەجان لە بەندیخانەی ئەسکەندەریە ناسیبووی ، **محسین** هەستی کرد کە ئەسپایی و سڵەمینەوەی گەنجەکە بەتەواوی لەجێی خۆی دا بووە  هەروەها زیرەکی و لێزانیەکەشی بوو بە مایەی سەرسوڕمانی **محسین**

**ڕەئفەت** لەو قاهیرەیەی کە ماوەیەک بوو دوورخرا بۆوە لێی ، بەسەربەستی و کامەرانی تێی دەگەڕا ، دەچۆ شانۆکان ، دەچۆ سەیری سێ ئەهرامەکان و ڕۆژێکی تری لە باغی ئاژەڵان دا بەسەر دەبرد ، ، کەم کەم هێور دەبۆوەو دەهاتەوە سەرخۆ ، ئێستا ئەو بەبێ ترس و سڵەمینەوە بە شەقامەکاندا دەسوڕێتەوە ، **محسینیش** هەوڵی دەدا تا بەهەر شێوەیەک بێ پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی – مێژوویی لەگەڵ کەسێک بەناوی (( **کوهن** )) دروست بکات ، لەکاتێکدا کە دەی زانی کۆمەڵگای جوولەکەنشین نەک تەنها لەمیسر بەڵکو لە هەموو دنیادا کۆمەڵگایەکی داخراون بەڵام لەهەموو کون و قوژبنی دنیادا یەکتری دەناسن بەتایبەتی خێزانە زەبەلاح و سەرمایەدارەکان کە پێویست بوو گەنجەکە بەنێوانیاندا دزە بکات

ئەو دەیەویست گەنجەکە بگەیەنێتە جەرگەی ئیسرائیل  هەتا وەک هاولاتیەکی ئیسرائیلی بژیت و بتوانێ بنەچەو ڕەچەڵەک و بەرەبابیان دەربێنێ ، بنەچەو بەرەبابێک کە کەم کەس سەری لێ دەربچێ وەک ئەوەی کە دۆمێک کلاشەی بۆ خۆی دروست کردبێ  گرفتێک ئەوە بوو کە دەبوایە گەنجەکە پەیوەندی کردبا بەخێزانێکەوە کەلە میسر نەژیابان و چەندەها ساڵ با ئەو وڵاتەیان بەجێ هێشتبا ، بەڵام ناچار بوو کە باس و لێکۆڵینەوەکەی خۆی دەربارەی خێزانێک سنوردار بکات کە چەندەها ساڵ لەمەوبەر میسریان بەجێ هێشتبێ جا یان مابن یان خەریک بێ لەبیر بچنەوە

بەڵی گرفتەکە ڕۆژ بەڕۆژ ئاڵۆزتر دەبوو و وەک چێشتی مجێور کەس بۆی لێک جیا نەدەکرایەوە جارێک محسین دەرفەتی بەگەنجەکە دا لەهەمان کاتدا ئەو دەرفەتەشی بۆ خۆی ڕەخساند تا بتوانی لێکۆڵینەوەکەی خۆی سەبارەت بەگەنجەکە ئەنجام بدات بەبێ ئەوەی کە بۆ ئەو مەبەستە ناچار کرێ پەنا بۆ فەرمانگەی پاسپۆرت و مانەوە ببات تا هاوکاری بکەن ئەو باسە هەرواش سادە نەبوو ، چونکە ئەرشیفێکی لەو بابەتە لەبەردەست دا نەبوو ، محسین لە هەوڵی ناسنامەی خێزانێکدا بوو کەلە میسرەوە کۆچیان کردبێ بۆ ڕۆژئاوا ( مەغریب ) ئەوەش کارێکی وا ئاسان نەبوو چونکە ڕۆژئاوای عەرەبی کە پێکهاتبوو لە لیبیا و تونس و جەزائیر و مەراکیش لەژێر جەنگی داگیرکاری فەرەنسا یان بەریتانیا دا بوون

هەروەها کۆی شارەکان بەسێ بەش دابەش بوو بوون یەکیان ناوچەی ئەورووپا بوو ، دووەم ناوچەی عەرەبی بوو و ناوچەی سێ یەم کە کێوی ( ملاح ) یان پێ دەگوت ناوچەیەکی جوولەکە نشین بوو کەوەکو ناوچەی عەرەبی شوورەی هەبوو بەڵام جیاوازیەک کە لەگەڵ ناوچەی عەرەبی دا هەی بوو ئەوە بوو کە هات و چۆیان بۆ ناو خەڵکی پێویستی بە مۆڵەت نەبوو

جوولەکەکانی ڕۆژئاوای عەرەبی ، لە هەموو شارەکان ناسرا بوون هەر ئەوەش بوو کە دەبوو بە پەرچ لەبەردەم کارەکەی محسین و ڕووبەڕووی گرفتی دەکردەوە

محسین دۆسیەکانی فەرمانگەی پاسپۆرتی ژێراو ژوور کرد تا لەناکاو گەنجینەیەکی دۆزیەوە ، لەناو ئەوراقەکاندا محسین تووشی خێزانێکی بچکۆلە هات کەلە یەک دایک و باوکێک و یەک کوڕو یەک کچ پێک هاتبوون ، سەیرەکە لەوە دابوو کە کوڕی ماڵەکە ( یاکوب ) ی ناو بوو و ڕێک هاوتەمەنی ڕەئفەت بوو ناوی باوکی بنیامین حنانیا و ناوی دایکی – کە ڕێک لەتەمەنی ٣٠ ساڵی میسری بەجێ هێشتبوو – ڕاشێل بوو و کچێک کە ٢ ساڵ لەبراکەی بچوکتر بوو ناوی جان بوو

کاری بنیامین دەست گێڕی و قوماش فرۆشی و وردەواڵە فرۆشتن بوو و ئەو خێزانە لە یەکێک لە گەڕەکە هەژار نشینەکانی.قاهیرەدا دەژیان

ئەو بەو بوخچەیەی کەلە کۆڵی دەنا دەچۆ لادێکانی دەورو بەرو تا ڕوباری نیل دەڕۆی سیمایەکی لادێیانەی هەبوو لەنێو لادێکانی دەوروبەردا ناسرا بوو و کڕیارێکی زۆری هەبوو

بەڵام ساڵێک و چەند مانگێک بەر لە هەڵایسانی جەنگی جیهانی ، بەهۆیەکی نادیارەوە **بنیامین حنانیا** ویستبووی لە میسرەوە بەرەو لای ا مەغریب ا کۆچ بکات و هەموو ئەو بەڵگەنامانەی کە **محسین** بەلێزانی کۆی کردبوونەوە گومانی ئەوەیان نەدەهێشتەوە کە بنیامین و کوڕەکەی ( **یاکوب** ) و کچەکەی ( **جان** ) و هاوسەرەکەی ( **راشێک** ) هیچ کات گەڕابووبنەوە بۆ میسر

**بنیامین** حنانیا لە ( مەغریب ) دادەنیشت بەڵام لەوەختی جەنگی جیهانی دووەم دا سوپاکانی ولاتە یەکگرتووەکان ( مەغریب ) ی عەرەبیان داگیر کردو بەداگیرکردنی ئەو ولاتانەش بنەماڵەی **حنانیا** بە تەواوی لەناو چوون **محسین ممتاز** بەو بەڵگەو ئەوراقانەی کەلەبەر دەستی دابوون ناونیشانی بنەماڵەی **حنانیای** ١٧ ساڵ لەمەوبەر دۆزیەوە و دەست بەجێ خەڵکی خۆی بۆ توێژینەوەو لێکۆڵینەوە نارده وێ و تەواوی ڕاپۆرتە هاتووەکان مایەی خۆشحاڵی و دڵ خۆشکەری بوون چونکە لە ولاتی مەغریبی عەرەبی دا بنەماڵەی **بنیامین حنانیا** بەتەواوی لەبیر کرابوون و کەس سەرو سۆراخی نەدەزانین

خەڵکی لەسەرەتادا واقیان وڕدەما و لەهۆکاری پرسیارکردنەکەیان دەکۆڵیەوە ، ئەوان لە بیریان مابوو کە **بنیامین حنانیا** بە پێچەوانەی هاوسەرە میهرەبانەکەی مرۆڤێکی خەمۆک و گۆشەگیر بوو و بەشێوەیەک کە چەندەها ڕۆژ و بگرە بەهەفتەش ون دەبوو ، دووبارە بەشەکەتی و پەرپووتی دەگەڕایەوە ، زۆر لە ماڵ دا نەدەمایەوە جگە لە چەند ڕۆژێک کە سەرقاڵی کڕینی کاڵاکان دەبوو لەبازرگانانی ناوچەی ( مۆسکی )

هەندێک لەو بازرگانانە هێشتا لەسەرو بەندی ژیان دا مابوون ، هەموو ئەو هەواڵگریانە لەدەستی **محسین** دابوون بۆ ئەوەی تا بەهۆی ئەو هەواڵانە سەرەداوێک لەڕابردووی گەنجەکە هەڵ کات ، هەروەها وای پێویست دەکرد کە گەنجەکە لەسەر هەموو وردەکاریەکانی هەواڵەکان ڕچان بدات و ناوی باوک و دایک و براو خوشکە تازەکانیش لەبەر بکات

*  *  *

ئێستا گەنجەکە پێویست بوو سەر بە هەموو شوێنێکدا بکات کە شوێنی کۆبوونەوەی جوولەکەکان بێ هەر لەپەرستگەکان تا چاخانەی ماتاتیاو یانەی مکابی و قاوەخانەو چێشتخانەی ئیستانبیلۆس و بەکورتی هەموو گەڕەکە نهێنی و ئاشکراکان و مۆڵگەی کۆبوونەوەو خڕبوونەوەکانیان وای پێویست دەکرد کەباسی هەلاتنیان بۆ بکات بۆ مراکیش

پێویست بوو کە گەنجەکە بزانێ کە بنەماڵەی حنانیا لەکوێ دادەنیشتن و ئەو بازرگانانەی کە لەگەڵ باوکی ئەودا دانوسان و سەوداو مامەڵەیان دەکرد بیان ناسێ ، حنانیا بەهەمان شێوە کە لەزاری دراوسێکانیەوە دەبیسترا دەیان گوت لەگەڵ منداڵەکەی دەچوو بۆ لادێکان و لەو ماوە کورتەی کەلە قاهیرەدا دەژیا بەهیچ شێوەیەک لێی دوورنەدەکەوتەوە ئەو گەنجە دەبوایە چیرۆکی ژیانی خۆی بەم شێوەیە بگێڕابایەوە حەوت سالانە بووم کەلە میسر کۆچم کرد ، بەلام لەدوای پەلاماری سەربازانی یەکگرتوو بۆ مەغریبی عەرەبی دایک و بابم مردن ، شەڕ من و خوشکەکەمی لێک جیاکردەوە و من ئێستا نازانم کە ئەو ماوە یان مردووە ؟ هەروەها دەبوایە لەبارەی ئاستەنگەکانی قۆناغی منداڵیەوە پرسیاری کردبا و شارەزایی لەسەر پەیداکردبا ، هەروەها دەبوا بەدوای کارێکدا بگەڕێ جا هەر کارێک بێ هەرچەندە کە بێ بایەخ و سووک و چروکیش بێ ...

وای پێویست دەکرد کە چارەنوسی خۆی لەنێو جوولەکەکاندا وێڵ بکات ، ئەو دەی توانی لەڕێگەی یانەی میکابی یەوە ناسیاوەتی لەگەڵ چین و توێژە کۆمەلایەتیەکانی جوولەکەکاندا پەیدا بکات وای پێویست دەکرد کە دۆستایەتی لەگەڵ جوولەکەکاندا بکاتە پیشە بەلام زۆر بەلێزانی و ئەسپایی ، لەپەرستگا دەبوایە نوێژی وان بەوردی فێر ببوایە ، دینی وانی بناسیبا ، لایەنە جیاوازەکان و نەیارەکانی وانی لەگەڵ مەزهەبەکانی تردا هەست پێ کردبا دەبوایە لەقاپێلکی جوولەکەیەکی بەدین دا دەرکەوێ و سەردانی پەرستگا بەواجب بزانێ ، ڕۆژی شەممە زۆر بەڕێز ڕاگرێ ، لەیانەکان یان چاخانەکان شوێنێکی تایبەت بۆ خۆی هەڵبژێرێ ، پاشان لەهەفتەیەکدا دووجار چاوی بە محسین بکەوێ و دیداری لەگەڵدا بکات ، نەک دیداری ئاسایی بەڵکو زۆر تایبەتی و نهێنی

گەنجەکە فێرکرابوو کە ئەگەر بزانێ لەژێر چاودێری دایە نابی **محسین** بناسێ و دیداری لەگەڵدا بکات یان بیدوێنێ ئەگەر شانیشی لە شان بدات ، ئەگەر هەستی بەدۆخێکی نائاسایی کرد دەبێ دیدارەکە هەڵگرێ بۆ کاتێکی تر

**ڕەئفەت** گوتی

- کێ من دەخاتە ژێر چاودێریەوە ؟ !

- پۆلیس

- چ ڕۆژێکی ڕەشە !

**محسین** پێکەنی و گوتی :

- چ بوو ؟

- ئەگەر پۆلیس بم خاتە ژێر چاودێریەوە ، ئەدی تۆ چیت ؟

**محسین** وەڵامی پرسیارەکەی **ڕەئفەتی** نەدایەوە و درێژەی پێدا

- پۆلیس نەک تەنها چاودێری تۆیە ، بەڵکو لەوانەیە بشت گرێ

زیاتر لەوە لەتواناو وزەی **گەنجەکەدا** هەبوو بەڵام **محسین** دەیەویست تواناو لێهاتوویی گەنجەکە لەحاست ڕوودانی هەر ئەگەرێکی کت و پڕدا تاقی بکاتەوە

ئەو کارەی ٨ دانە سەعاتی ویست ، **محسین** ٨ سەعات لەگەڵ گەنجەکە دانیشت و داستانی بنەماڵەی **حنانیای** بۆ باس دەکرد و فێری دەکرد کە چۆن هەڵسوکەوت بکات و لەگەڵ کێدا دانیشێ و چ بکات و چ نەکات ...

هەروەها پێویست بوو کە **ڕەئفەت** ژمارەی تەلەفۆنی ماڵ و شوێنی کارەکەی **محسین** بزانێ نەک لەسەر کاغەز بینوسێ : ئەوەیان کارێکی تابڵێی قەدەغە بوو و دەبوایە تەنها لەکاتی پێویست سود لەمەیان وەربگرێ واتە کاتێ کە گیانی کەوتبێتە مەترسیەوە

**محسین** پرسی : تەواو تێگەیشتی ؟

- بەڵێ ، قوربان

سەعات لە ٦ ی دوای نیوەڕۆ تێ پەڕی بوو ، کاتێ کە **محسین** زانی گەنجەکەی بۆ لێ حاڵی کراوە داوای لە **ڕەئفەت** کرد تا بەئەسپایی جم و جوڵ بکات و پەلە لەکارەکانیدا نەکات هەروەها لەڕۆژەکانی یەکتر بینین دا چی بینیوەو بیستووەو ئەنجامی داوە لەبچوک و گەورە ، گرنگ و بی بایەخ ، ڕاپۆرتێک ئامادە بکات

گەنجەکە پرسی

- تۆ ناوی دایکم و باوکم و خوشکمت دیاری کرد بەڵام ناوی ڕاستەقینەی منت نەدرکاند !

- یاکوب

ساتێک بێ دەنگی باڵی کێشا ، پاشان گەنجەکە گوتی :

- یاکوب بنیامین حنانیا ، ناوێک کەبڕیار وابوو گەنجەکە لەژێر پێست و کەوڵی ئەودا وەک جوولەکەیەک بژیت

# بەشی نۆهەم

# ئیستانبیلۆس

لە ژووری بینای ڕێکخراوی ئاسایش و هەواڵگری ، هەر کە گەنجە دێهاتیەکە لێیان وەژوور کەوت تا دوو پەرداخ شەربەتی پرتەقاڵ و دوو ئیستکان قاوە لەسەر مێزەکەی بەردەم خانم سمحون و عەزیز جەبالی دانێ ، ئەوان دەستیان لەقسەو باسی خۆیان هەڵگرت گەنجە دێهاتیەکە بەچاو تروکانێ کارەکەی خۆی تەواو کرد و ژوورەکەی بەجێ هێشت ، بەڵام هێشتا بێ دەنگی بەسەر ژوورەکەدا زاڵە

عەزیز دەستی درێژ کردوو ئیستکانە قاوەکەی هەڵگرت ، ئەوسا ئەویش پەرداخێک شەربەتی پرتەقاڵی پێداکرد ، هێلن وای بۆ دەچوو کە عەزیز جەبالی بەناخی ڕابردوودا ڕۆچووە ، بۆیە هەوڵی دا تادان بەخۆیدا بگرێ و قرِ قەپ بێ ، بەجۆرێک کە تەنانەت لێوی لەسەر یەک هەڵ نەگرێ ، تا عەزیز لەدوای داگیرسانی جگەرەکەی دوبارە گەڕایەوە سەر پاشکۆی وت و وێژەکە

* * *

لەکۆتایی ساڵی ١٩٥٤ دا ، تەپۆلکەی میسری تازە ناوچەیەکی دڵگیرو دیار بوو کە زوربەی خێزانە دەوڵەمەندو خۆش گوزەرانەکان لەوێ دەژیان ، بیناو خانوەکانی ئەو ناوچەیە زۆر گەورەو زەبەلاح بوون ، هەموویان لە لایەن کۆمپانیایەکی بەلجیکی یەوە دروست کرابوون ، بەشێوەیەک کە ئەو گەڕەکە لەهیچ شتێکدا بەگەڕەکەکانی تری شاری قاهیرە نەدەچوو ، شەقامەکانی میسری تازە بەتایبەتی لە دوای ڕۆژ ئاوا بوون چۆڵ دەبوون چونکە ئەوانەی کە سەیارەشیان هەبوو سەیارەکانی خۆیان لەگەراجی تایبەت دا ڕادەگرت

کاتی دیاری کراوی دەیدارەکە سەعات ٩ بوو و لەسەعات ٨ و ٥٥ خولەکیشدا سەیارەیەکی جام تاریکی ئەمریکی ، لە جۆری سەیارە گرانبەهاکان ئەوانەی کە خەڵکی خۆشگوزەران سواریان دەبن بەهێواشی چۆناو یەکێک لەو شەقامانەو وردە

هێواشتر دەبۆوە تا گەیشتە بەردەم بینایەکی ٥ نهۆمی و ڕاوەستا ، **محسین ممتاز** دەستی بەسوکانەوە گرتبوو

**محسین** لەهەر دیدارێکدا کە لەگەڵ گەنجەکەدا ئەنجامی دەدا بەسەیارەیەکی جیاوازترو بەشێوازێکی تازەتر دەردەکەوت ، **محسین** لەماوەی ئەو دوو مانگەدا شێوەی چاودێری و هەڵاتنی بەتەواوی فێری گەنجەکە کرد ، هەندێک جار **محسین ممتاز** بەئەنقەست کەسێکی تری بۆ چاودێری و هەڵنانی ئەو دەنارد ، بەڵام گەنجەکە لە زوربەی تاقی کردنەوەکاندا سەردەکەوت و تواناو بەهرەی زیاد لەڕادەی خۆی لەڕاپەڕاندنی کارەکاندا پیشان دەدا

لەهەندێک شوێن ڕۆڵی جوولەکەیەکی دەبینی کە بەتەواوی بەناخی جوولەکایەتیدا ڕۆچوو بێ ، لەهەندێک شوێن لافی بەسەر **محسین** دا لێ دەدا ئەوەش نەک لەبەر ئەمە کە ئامانجێکی تایبەتی هەبێ بەڵکو تەنها لەبەر ئەستۆ پاکی و نیەت پاکی خۆی ، **محسین** لەکاتێکدا کە پێدەکەنی لەبەر خۆیەوە دەی گوت ئەو لەچاو جوولەکەکان دەڵێی لەحەوت ئاو پەڕیوەتەوەو لەهەموو ئاوێک زولاڵ ترە

گەنجەکە زۆر بەخێرایی قۆناغە ئەزمونیەکانی دەبڕین بەشێوەیەک کە هەندێک جار بازدانەکەی دەبۆ مایەی مشتومڕ و دم بەدمەیەکی زۆر لەنێوان **محسین ممتاز و حەسەن سفردا**

**حەسەن سفر** هەموو ئیش و کارەکانی دا بۆ دەستی هاوەڵ و هاوکارە ژێر دەستەکانی خۆی هەرچەندە ئەو فەرماندەی ئەو چالاکیە نهێنی یەش بوو

**محسین ممتاز** لەو شەوەدا هەواڵێکی ترسناکی بۆ گەنجەکە پێ بوو ، **محسین** چاک دەی زانی کە ئەم ساتە ، زۆر سەخت و دژوارە ، **محسین** گڵۆپەکانی سەیارەکەی کوژاندەوەو دایە بۆش و بەچاوی کراوەو بەئەسپایی کەوتە ڕێ ، ٥ خولەکی مابوو بۆ کاتی دیاری کراو ، شەقامەکە لەبێ دەنگی یەکی مات دا نغرۆ بوو بوو ، جادەکان چۆڵ بوون ، وا پێش بینی دەکرا هەموو شتەکان ڕێک خرابن و سەرکەوتن مسۆگەربێ ، گەنجەکە لە یەکێک لە هێڵە تاریکەکانی شەمەندەفەر ( میترۆ ) دابەزی کە یەکێک بوو لە وێستگەکانی گەڕەکی میسری تازە

ئەو ڕێگەکەی لەناوەڕاستی شارەوە تا ئەو شوێنە دوورە دەست و پێچ و پەنایە بڕی بوو تا چاوی بە **محسین** بکەوێت

گەنجەکە کەوتە بیرکردنەوە

خۆحەشاردان و نهێنی جگە لە ئاقار پیاوانی پۆلیس خۆپێویست نیە چۆن ئەفسەرێکی پۆلیس لە پۆلیسێکی تر دەسڵەمێتەوە ؟ ئەوە چ سیناریۆیەکە ؟ !

ڕەئفەت دڵنیا بوو لەوە کە **محسین** لەپیاوانی پۆلیس و دەستێکی باڵای لەهەڵسوکەوت و کاروبار و جم و جۆڵی جوولەکەکاندا هەیە بۆیە ئەوەی کەلەو چاوەڕوان دەکرا هێنانی هەواڵی جوولەکەکان بوو کەلەو کاتەدا کاری ڕفاندنی گەنجانی جوولەکەو هەناردنی ماڵ و موڵکیان بۆ دەرەوە و تێکدانی ناوەندی بژێویان زۆر لەئارادا بوو گەنجەکە دەروونی خۆی ئاسودە کرد کە **محسین** هەموو ئەو کارانە بەو مەبەستەوە ئەنجام دەدا تا ئەویش وەک خۆی بۆ ئەو کارانە ڕابێنێ

گەنجەکە هەر بەوەندە تویژینەوەیە قەناعەتی بەخۆی هێنا چونکە **محسین** لەو چەند مانگەی دوایی دا تەنگ پێ هەڵچنرانی لەلایەن برا بێ وەفاکەیەوە هەست پێ کردبوو ، برایەک کە هێندە ژیانی لێ وەتەنگ هێنا بوو کە ناچاری کرد بوو سەری خۆی هەڵ بگریّ و هەڵێت

ئەو شەوە هەوا سارد بوو ، گەنجەکە وازی لەشەمەندەفەرە ژێر زەمینەکە هێنا ، بەڵام لە وێستگەکە نەهاتە دەر ، چاکەتەکەی کردەبەری و چاوەڕێی پەڕینەوەی ڕێبواران بوو لە وێستگەکە هەتا ئەوەی کە شتاقیان لەشەمەندەفەرەکەدا نەمانەوە جگە لە شۆفێرەکە ، پاشان شەقامەکەی بە پڕ تاوی و هەڵەداوان بڕی و لەتاریکی دا ون بوو ، شەمەندەفەرە ژێرزەمینەکە وردە وردە دوور دەکەوتەوەو دەنگی خولخولەکانی تاریکی شەویان دەشکاندو سامناکی دڵانیان دەڕەواندەوە

گەنجەکە وەکو کاربێ سپێردراوانی بەئەزمون چاوی بڕیبۆ دەوروبەرو وا دەهاتە بەرچاو کە تێ ماوەو بەدەم شتێکەوە گیری خواردووە ، گەنجەکە هەرچەندە کە سەری داهێنابوو بەڵام بەڕەنگ هەڵبزرکاو دەهاتە بەرچاو ، جلەکانی ئوتو کردبوون و دەستی لەگیرفانی شەلوارەکەی ڕاکرد بوون و دواین نیگای خۆی بڕیە دەرورووبەرو لەشەقامەکە پەڕیەوە ، بە ٢٠ چرکە گەیشتە سەری شەقامەکە کە ئوتومبیلی **محسین** لەویّ ڕاگیرا بوو بەڵام کاتیّ گەیشتە نزیکی ئەو ماڵەی کە سەیارەکەی لەبەردەم ڕاگیرا بوو ، کەمێک ڕاوەستا وەک ئەوەی وچانێک بدات ، بەو ڕوناکیە کەمەی سەر شەقامەکە زۆر بەزەحمەت ژمارەی ماڵەکەی بۆ دەخوێندرایەوە و بەتەواوی ئەسەحی

نەدەکرد ، بەگورجی ئاوڕێکی بۆ دواوە داوە نەبادا خرابێتە ژێر چاودێریەوە پاشان درێژەی بە ڕۆیشتنەکەی داو بۆ لای سەیارەکە چوو ، تەماشای ژمارەی سەیارەکەی کردو لێی نزیک بۆوە ، دەرگای کردەوەو سوار بوو ، سەرەتا **ڕەئفەت** و **محسین** چێشتخانەیەکیان وەکو بنکە بۆ هەمیشەیی دەست نیشان کرد ، لە سەرەتای کارەکەدا باسەکەی بەلاوە ئاڵۆزو پڕ لەدەردەسەری بوو ، چەند ڕۆژێکی برد تا هەموو کڕیارە هەمیشەیی یەکانی چاخانەکەی ناسی بەتایبەتی جوولەکەکان

ئەو گەنجە قەد باریکە بەو جل و بەرگە سادە چاوە کاریگەرەکانی ناوی **لیوی کوهن** بوو ، ئەو بەس دەهاتە چاخانەکەو تەنها یەک فنجان چای دەخواردەوەو نزیکەی ١ – ٢ سەعات لێی دادەکوتا لەگەڵ هەر کەسێکدا کە دەئاخاوت بەنەرمی دەکەوتە گفت و گۆ و وەک دەڵێن شەکری لە لێوانی دەباری ، ئێنجا چاخانەکەی بەجێ دەهێشت ، هێشتا چەند ڕۆژێک تێ نەپەڕی بوو ، ڕۆژێک کوڕی خاوەن چێشتخانەکە کە حەزی لەقسە هێنان و بردن بوو و ئەوەشی بەیەکێک لەخەسڵەتە مرۆیی یەکان دەزانی و لەبیستنی هەواڵ و بەدواداچوونی قسەی خەڵک چێژی وەردەگرت ، کاتێ کەلە ناسینی گەنجەکە بەگرتنەبەری هەر فرت و فێڵێک دەستەوەستان بوو ، بانگی کردە لای مێزی دوکانەکە ، **ڕەئفەت** بەسادەیی و میهرەبانی بانگهێشتەکەی قبوڵ کرد کەلە بنج و بناوانی داستانە حەشاردراوە کە گەیشت ، **ئیستانیلوس** بردیە لای **مانو**

**مانو** تایبەتمەندی وەقسە هێنانی مرۆڤە کەڕو مۆن و سەیرەکانی هەبوو بەڵام لەوە سەیرتر ئەوە بوو کە خودی خاوەنی چێشتخانەکە بەشێوەیەکی سەر سوڕهێنەر هۆگری **ڕەئفەت ئەل هەجان** بوو بوو ، هەستی دەکرد کە هاونشینی و قسە کردنیشی هۆگریەکی تایبەتی خۆی هەیە بەشێوەیەک کە زۆر جار وت و وێژەکانیان تا پشوودانی چێشتخانەکە درێژەی دەبوو ، **ڕەئفەت ئەل هەجان** نوکتە باز بوو و نوکتەی خۆشی دەزانی ، تەنز لە لێوەکانی دەباری ، تەنزی تاڵ و تەزێنەر ئەو قسەی لەبارەی کوێرەوەریەکانی خۆیەوە دەکردو دەی گوت

ئەڵمانیەکان دایک و باوکمیان لە مراکیش کوشتم و لەسەردەمی جەنگی جیهانی دووەم دا خوشکم لێم جیابۆتەوەو ئێستا ئاگام لێی نیە ، ئێستا پارەیەکی کەمم هەیەو بەدوای کاردا دەگەڕێم

**ئیستانیلۆس** ئەو خەڵکانەی ڕاسپارد کەسەرو کاریان لەگەڵ کارەکەی ئەودا هەیە تا ئیشێکی بۆ پەیدا بکات ، بەڵام سبەینێ بەیانی ڕێکەوتێکی سەیر رووی دا **لیوی کوهن** یان **ڕەئفەت-ئەل هەجان** سبەینێ لەکاتی دیاری کراودا هاتە چاخانەی چێشتخانەکەو لەهەمان جێگا دانیشت کە دوێنێ لێی دانیشتبوو ، جێگایەک کەلە کەلێنی دەرگاکەوە پۆلیسی ڕێنمایی لەسەر شەقامەکەڕا دیاربوون ، گەنجەکە هەر کە پێی نایە چاخانەکە ، هەستی کرد کە هەموو چاویان تێ بڕیوەو تەماشای دەکەن ، مسۆگەر بوو کە کوڕی **ئیستانیلۆس** کارێک کە دەبوا بی کردبا کردوویەتی و ئێستا هەموو کڕیارەکانی چاخانەکە سەربردەی ژیانی ئەو دەزانن ، داوای فنجانێک چای کرد لەکاتێکدا کە ( گاسێن ) فنجانە چایەکەی لەسەر مێزەکە دادەنا ، کەسێکی دی هاتە ژوورو بەپەناو پەسیوی تایبەت بە جوولەکەکاندا گەڕاو لەنێو ئاپۆڕەی واندا ون بوو ، کەسێکی تازەکار کورسی یەکی هەڵگرت و بای دایەوە تا لە لای ئەو دابنیشێ بەڵام پەشیمان بۆوە ، نێوچەوانی گرژ کرد ، تەماشایەکی بەردەمی خۆی کردو کردی بەگاڵە:

ئەوەتا ... **لیوی کوهن** ؟

گەنجەکە بەشێوازێکی شەرمنانەو بەخۆدا شکانەوە بزەیەکی هاتێ ، **ئەفرایم سلومون** هەمان ئەو جوولەکەیەی کەلە بەندیخانەی ئەسکەندەریە دیبووی هاتە لای ، گەنجەکە ڕاوەستا تا بەگەرم و گوڕی ئەحواڵی بپرسێ ، **ئەفرایم سلومون** ویستی قسە بکات بەڵام **ڕەئفەت** دەستی لێ ڕۆگرت واتە بێ دەنگ بەو قرقەپی لێ بکە، دەست بەجێ قسەکانی پێ بڕی **ڕەئفەت** داوای لێ کرد تا فنجانێک چای پێداکات ، قسە قسەی هێنا ، **ئەفرایم** لە چۆنیەتی ژیان و گوزەرانی ئەوی دەپرسی ، ئەو بەورتە ورت و لەژێر لێوانەوە دەربارەی میسری یەکان و حکومەت و ئەو شتەی کە حکومەت دەیەویست ئەنجامی بدات قسەی دەکرد ، **ئەفرایم** شتێکی بیرکەوتەوە ، لەپڕدا لە گەنجەکەی پرسی :

- ئەوان لەبەرچی تۆیان گرت ؟

گەنجەکە وەڵامی نەدایەوە بەڵکو ئاوڕێکی بەچەپ و ڕاستی خۆیدا دایەوەو بەغەم و خەفەتەوە سەری داخست ، پاشان بەگەرم و گوڕی درێژەی پێداو لەدەست ژیانی پڕ لە کوێرەوەری خۆی ئاخێکی هەڵ کێشاو گوتی لەبەندیخانە بەربووم و بەدوای کاردا دەگەڕێم

بەڵام **ئەفرایم** دیسان سوور بوو کە

- لە لیبیا بۆچی بەریتانیەکان تۆیان گرت ؟

ئەو کات داستانی جەنگ و شەڕی نێوان بەریتانیەکان و جوولەکەکان لە لایەک و فەلەستینی یەکان لە لایەکی تر ڕای گشتیان بەلای خۆیاندا ڕاکێشابوو کە ٦ ساڵ زیاتر بەسەر دامەزرانی ئیسرائیل دا تێ نەپەڕی بوو پاشان گەنجەکە بۆ لای **ئەفرایم** گەڕایەوەو بەشێوازێکی گەبجاڕانە پرسی :

- ئاخر بەریتانیەکان بۆچی جوولەکەکان دەگرن ؟

**ئەفرایم** ویستی بنکڕی قسەکان وەگرێ بەڵام ئەو هەستاو لەکاتێکدا کە بەدڵتەنگ و داماو دەهاتە بەرچاو دوو قرۆشی لەسەر مێزەکە داناو مۆڵەتی لە **ئەفرایم** وەرگرت کە بڕواتو پێی گوت : لەگەڵ کەسێکدا ژوانم هەیە کە بڕیارە کارێکم بۆ پەیدا بکات ، پاشان بەپەلە چێشتخانەکەی بەجێ هێشت ، وەکو ئەوە کەلەبەر شتێکی نادیار هەڵ بێت

کڕیارەکانی ناو چێشتخانەکە لەو ڕۆژەدا زۆر سەرنجیان نەدا ئەو قسانە بەڵام **ئەفرایم سلومون** کاتێ کە بۆ لای ئەو تاقمە دەگەڕایەوە بەتەما بوو بۆ ماڵی گەنجەکە بگەڕێتەوە هەتا یەکێک لە جوولەکەکان لێی بپرسێ :

- **ئەفرایم** ! چ ڕووی داوە ؟

ئەو هەموو داستانی ڕابردووی بۆ وان باس کردو گوتی دڵنیام کە ئەو جوولەکەیە

هاوەڵە جوولەکەکانی **ئەفرایم** بەوردی گوێیان دابۆیێ پاشان داستانێک کە **ئیستانیلاس** لە بن زمانی گەنجەکەوە کە بەهۆی ( مانۆ ) ە درکێندرا بوو باس کراو سەرەنجام قسەکانی هەمووان تێکی دەکردەوە

بەڵام **ئەفرایم** لەناکاو پرسی

- ئەو لە کەنگێوە هاتووە بۆ ئێرە ؟

- دوو سێ هەفتە لەمەوبەر.

- هەموو ڕۆژێک دێت ؟

- هەموو ڕۆژێک دێت و بەتەنێ دادەنیشێ

سبەینێ بەیانی پێش ئەوەی گەنجەکە وەک خولیای ڕۆژانەی بێـ بۆ چێشتخانەکە ، **ئەفرایم سلومون** لەوێ بوو ، وا دەهاتە بەرچاو کە خەفەتی لەباسەکە خواردبێ ، تا ئەوە کە گەنجەکە لەچێشتخانەکە وەژوور کەوت ، **ئەفرایم** بەتاسەوە پرسی

- دوێنێ قسەکانمان پچڕان ، گەنجەکە لەکاتێکدا کە داماوو پەرێشان دەهاتە بەرچاو وەڵامی دایەوە

- ئەگەر کارێکم پەیدا کردبا چ ئیشم لێرە هەبوو ؟

- تۆ حەزت لە چ کارێکە ؟

گەنجەکە لەکاتێکدا کە پێدەکەنی بەگاڵتەوە گوتی :

- هەر کارێک بێ

- کاری دەلاڵی دەکەی ؟

گەنجەکە سەری هەڵبڕی و پرسی :

- لەگەڵ کێ ؟

- لەگەڵ براکەم

بەم شێوەیە یەکەمین هەنگاوی گرنگ لەگەڵاڵەی پیلانەکە دارێژرا

لەگۆڕەپانی ( **عتبة الخضراء** ) لەقاهیرە بازرگانێکی سەعات فرۆش بەناوی **مورسیس لیوی** ( **سوسو** ) هەیە ، دایک و باوکی هەر لەمنداڵیەوە بەو ناوەیان بانگ کردووەو ئەو ناوەش تا دوا تەمەنی لەگەڵیدا ماوەتەوە ، بازرگانیەکەی مورسیس ڕووی لە خێرو قازانج بوو هەر کەسێکیش کە لێی دەپرسی لەدەست ڕژدی و جوولەکە بوونەکەی دەی نالاند بەلاَم غەشی لەکارەکانیدا نەدەکرد

**مورسیس لیوی** برای **ئەفرایم سلومون** بوو ، بەلاَم ئەو هەولاَنەی کە گەنجەکە دەی نا لەبارەی ئاشکراکردنی هۆکاری جیاوازی ناوەکانی ئەو دوو برایە ئەنجامێکیان نەبوو ، بەلاَم دەی زانی کە جوولەکەکانی ئەوکاتە سووربوون لەسەر گۆڕینی ناوەکانیان

**ئەفرایم سلومون** سوور بوو لەسەر ئەوە کە داستانی ژیانی گەنجەکە لەسەر زمانی خۆیەوە ببیستێ و **ڕەئفەتیش** بەکورتی و پوختی ئەو داستانەی کە بۆ **میرزا ئیستانیبلۆسی** باس کردبوو بۆ **ئەفرایمیشی** باس کرد بەلاَم **ئەفرایم** دەستی لەجەنەگرتن و سووربوونی خۆی هەڵ نەگرت ، پاشان پرسیاری لە قوتاربوونی ئەو کرد

لە لیبیا لەدەستی هێزەکانی بەریتانیا   گەنجەکە وچانێکی داو ئاوڕێکی لێ دایەوە **ئەفرایم** دەیەویست بیکات بەهەرا

- **لیوی** تۆ لە من دەترسی ؟

- من **لیوی** نیم !

- ئەدی تۆ لە ئەسکەندەریە وات بەمن نەگوت ؟

- ڕاستە     بەڵام پێت ناڵێم کە بۆچی بەریتانیەکان منیان دەرکرد

**ئەفرایم** ویستی درێژە بەقسەکەی بدات بەڵام گەنجەکە گوتی :

- ئەگەر میسری یەکان بزانن دوبارە دەم خەنەوە بەندیخانە ، من بەڕاستی شەکەتم ، ماندووم لە چوونم لەو بەندیخانە بۆ ئەو بەندیخانە

پاشان درێژەی بەڕێگەکەی خۆی دا ، تاماوەیەک بێ دەنگی سەری هەڵدا ، گەنجەکە دەت گوت لەبەرخۆیەوە ورتە ورت دەکات وەکو کەسێک کەلەبەر خۆیەوە بدوێ   من ماندووم بەدەم شەپۆلی ژینەوە ، دەمەوێ بژیم ، سەرەنجامی کارەکە چی لێ هات

کاتێ کە **ئەفرایم** ئەوی بە براکەی **سوسو** خاوەنی فرۆشگای سەعات فرۆشی **مورسیس** ناساند ، **سوسو** دەست بەجێ ڕازی بوو تا بەبازرگانانی بناسێنێ کە بەدوای دەڵاڵی کارەکانیدا دەگەڕێن تا لەسەدای قازانجەکە بگێڕنەوە بۆ فرۆشیارو **سوسوش** گرەنتی یەکە بگرێتە ئەستۆ   هەنگاوی دووەم لە گەڵاڵەی پیلانەکە دارێژرا دیسان مشتومڕی نایەوە

گەنجەکە لەسەرنج ڕاکێشانی خەڵک دا زۆر سەرکەوتوو بوو   لەلایەکی تریشەوە دەیتوانی کەسایەتیەکانی بەچاکی بەرجەستە بکات ، لەدوای چەند هەفتەیەک سەرکەوتنی بەرچاوی دەستەبەر کرد ، یەکەم جار بەر لە هەموو شتێک کۆمەکی جوولەکە میسری یەکانی لەبازرگانە گەورەکان وەردەگرت تا خەڵکی مام ناوەندی بۆلای خۆی ڕابکێشێ ، لەبەرئەوە داستانی ژیانی ئەو زۆر بەپەلە بەنێو جولەکەکاندا بلاوبۆوە

ئەوجار کەسایەتیەکی وا کاریگەر و سەرنج ڕاکێشی بۆ خۆی بەرجەستە کرد بوو کەهەموو کەس لەدەرفەتی یەکەمدا دەکەوتە ژێر کاریگەریەکەی بەتایبەتی ڕۆڵی هەڵاتوویەکی زۆر باش بەرجەستە دەکرد ، دیارە ئەو باسەش کاتێ سەقامگیر بوو کەشەوێک لەچاخانەکەی ( **ئیستانیلۆس** ) دانیشتبوو پێ یان گوت

گەنجەکە لەمەوبەر سەرەداوێکی لەو باسە دەزانی ، کاتێ کە ( **محسین** ) داوای لێ کرد کە جلی ئەستور لەبەر بکات ، گەنجەکە بە **محسینی** گوت

- ئایا پێش بینی کراوە کە هەوایەکی سارد بەڕێوەیە ؟ !

**محسین** پێ کەنی و گوتی

- نا ، نا پێش بینی شەپۆلی گرتنی تۆڕی ئەو جولەکانەی کە چالاکی گومان لێ کراو ئەنجام دەدەن بەڕێوەیە

لەو ڕۆژانەدا ئیسرائیل زیاتر هەولی خۆی بەکار دەهێنا تا پەیوەندی نێوان ئەفسەرە گەنجەکان بەتایبەتی گەنجە ناسیۆنالیستەکان کە زیاتر بایەخ بۆ نیشتمانەکەیان دادەنێن واتە **جمال عبدالناصر** لەبەرچاوی ئەمریکا ڕەش تر دەکەن ، ڕێک لەدوای یاسایەک کە **عبدالناصر** بۆ قەدەغەکردنی هاتوچۆی کەشتیە ئیسرائیلی یەکانی لە جەزیرەی ( عقبە ) دەرکرد ، تاقمێک جولەکە لەماوەی چالاکیەکی نمونەیی دا دامەزراوەکانی ئەمریکایان لەقاهیرەدا وێران کرد ، پۆلیس توانی پیاوانی ئەو تاقمە بگرێت و پیلانەکە بەتەواوی ئاشکرا بکات و بەم شێوەیەش پەیوەندی نێوان حکومەتی میسرو جولەکە نیشتەجێ یەکانی ئەو وڵاتە لەق بکات بەتایبەتی ئەو جولەکانەی کە ناسنامەی میسریان نیە ، بەو هۆیە گرتنی جولەکەکان لەکۆتایی ساڵی ١٩٥٤ دا خەست تر بۆوەو ئەوانەی کە ناسنامەی میسریان نەبوو بۆ دەرەوەی وڵات بەڕێ کرانەوە ، بەڵام جولەکەکانی میسر ئەگەر دەگیران ئازاد دەکران و بێ وچان داوای کۆچ کردنیان دەکرد کەلە هەندێ شوێن دا بەفەرمی قبوڵ دەکران ، بەڵام لەهەندێ شوێن دا بەچەند هۆکارێکی ئاسایشی داواکەیان قبوڵ نەدەکرا

گەنجەکە بەڕادەیەک پێویستی بەمە بوو کە پارە پەیدا بکات و لەبەر فەرووبەرەکەتی ئەویش ( **سوسو** ) ی سەعات فرۆش دیسان بەبێ هیچ هەوڵ و کۆششێک قازانجی مفتەی دەخستە گیرفانی یەوە هاوڕێ گەنجەکە لەگەڵ جولەکەکاندا پەیوەندی یەکەی توندو تۆڵ تر کردو ناسیاوەتی لەگەڵ دا پەیداکردن ، ئەوانیش ئەویان بەناس دەکرد ، لەگەڵ هەندێک لە بازرگانەکان پەیوەندی یەکی دۆستانەی پەیدا کرد ، بەشێوەیەک کە یەکێک لەوان لە شەوی هەینی دا جارێک بانگهێشتی نانی ئێوارەی کرد بۆ ماڵەوە بەڵام گەنجەکە بەتوڕەیی یەوە قبوڵی نەکرد و

گوتی کە ( شەممە لەئاوابوونی ڕۆژی هەینی یەوە تا ڕۆژئاوا بوونی هەر شەممەیە ( زۆربەیان دەیان گوت بەڕاستی گەنجێکی بەدینە !

لەسەرەتای کاردا گەنجەکە بەنابەدڵی بۆ پەرستگاکە دەڕۆیی ، بەڵام کەئاستی دارایی یەکەی چۆ سەری بەبەرنامەیەکی توکمەو دیاری کراوو بەشێوەیەکی ڕێک و پێک دەچۆ پەرستگاو شێوەی پەرستگاکانی وانی پەی جور دەکردو تەوراتی دەخوێندو ڕۆژ بەڕۆژ دەربارەی دیانەتی وان زانیاری زیاتری وەدەست دێناو بەو جۆرە لەنێو جولەکەکاندا ناسرا ، هەر بەم شێوەیە ئەو شەوەیان بەسەر برد

ڕۆژێک ڕەئفەت لەچاخانەی چێشتخانەی ئیستانبیلۆس وەک خولیای ڕۆژانەی دانیشتبوو ، ئەفرایم سلومونیش هات لەپەنای دانیشت و دەستیان بەقسەکردن کرد ، ڕوداوی تەقینەوەی دامەزراوەکانی ئەمریکا کەلە لایەن سێ کەس لەپیاوانی نموونەیی ئیسرائیل هێشتا هەر لەسەر زاران مابوو ، سێ کەس لەو تاقمە گیراوانە دادگایی کران و مەحکوم کران بە لە سێدارە دان ، هەڵبەتە نموونەی ئەو کەسانە بۆ جوولەکەکان بەشانازی و قارەمانیەتیەکی بێ وێنە دەهاتە ژمار ، هەروەها هەندێک لە درکەو کینایەکانی ڕەئفەت بۆ ئەفرایم سلومون هەست بزوێن بوون و ناخیان دەهەژاند

لەو وەختەدا بوو کە سەیارەی پۆلیس لەبەردەم چێشتخانەی ( پریا ) ڕاوەستاو ئەفسەرێک و چەند سەربازێکی لێ دابەزین و ڕەئفەت و ئەفرایم سلومونیان پێکەوە گرتن .

ئەو دووانەیان بەرەو بینای وەزارەتی هەرێم ڕاپێچ کردن ، نزیکی دوو سەعات دەرگایان لەسەر داخستن بەبێ ئەوەی کە هیچ پرسیارێکیان ڕووبەڕوو بکرێتەوە ڕەئفەت لەپەنا پەنجەرەیەک کە ڕووەو شەقامەکە دەکرایەوە ڕاوەستا بوو ، بەنیگەرانی لەشەقامەکانی دەڕوانی

ئەفرایم لەکاتێکدا کە هەڵدەلەرزی لێی نزیک بۆوەو پرسی بۆچی ئێمەیان هێناوە بۆ وەزارەت ؟ بۆچی ئێمەیان نەبردە تەوقیف خانە ؟

ڕەئفەت ماوەیەک بێ دەنگ بوو پاشان ئاوڕی دایەوەو بەئارامی گوتی

- ئەفرایم باش گوێ بگرە ، ئەگەر کارەکە پەیوەندی بەمنەوە هەبوو تۆ دەبێ بزانی کەمن کێم ؟

گەنجەکە گوتی

- ناوی من یاکوب حنانیایە

بێ دەنگی بۆ چەند چرکەیەک باڵی کێشا ؛ دیسان گەنجەکە دووپاتی کردەوە

- ناوی من یاکوب بنیامین حنانیایە

دوبارە بێ دەنگی هەوای ژوورەکەی داگرت و پاشان دەنگی گەنجەکە هاتە بەرگوێ .

- من و خوشکەکەم لێرە لەدایک بووین ، دایک و باوکم لەپێش جەنگی جیهانی دووەم دا بۆ مەغریبی عەرەبی کۆچیان کرد بەڵام ئەڵمانیەکان منیان گرت

چاوەکانی گەنجەکە هەبڵەق مابوون و لەژێر لێوەوە ورتە ورتی دەکرد :

- بەڵام یان ئێمە یان ئەوان یان ئێمە یان ئەوان

لەدوای ئەمە گەنجەکە شتێکی تری نەگوت و بێ دەنگی دوبارە باڵی کێشایەوە ،**ئەفرایمیش** هەر پەنای بۆ بێ دەنگی برد.

شەوگار لەنیوە لای دابوو کە داوایان لێ کرد بچێتە لای ئەفسەری پۆلیس ، ئەفسەرەکە خوخدەی دەهاتێ ، قەستی دەکرد ئەوراقەکانی بەردەمی بدڕێنێ لەهەر کامێکیان پرسیارێکی ئاسایی لێ کردن بەڵام لەناکاو بێ دەنگ بوو ، لەکاتێکدا کە چاوەکانی بڕیبۆ گەنجەکە بەگاڵتەوە لێی پرسی :

- گوتت ناوت چی یە ؟

- **لیوی کوهن** ، قوربان !

ئەفسەرەکە ڕووی تێ کرد ، لەکاتێکدا کە هەڕەشەی لێ دەکرد ، قیژاندی

- **لیوی کوهن یان جون دارلنگ** ؟

کاتێ کە ئەفسەری پۆلیس ناوی **جون دارلنگی** بەسەر زمان دا هات ، **ئەفرایم سلومون** خەریک بوو قۆپیە بکات چونکە لەو ناوەندەدا وەڵامی هەموو پرسیارە پەنامەکیەکانی ئەو و جوولەکەکانی تر دەدرایەوە کەلەبەر خۆیانەوە دەیان گوت

**لیوی کوهن کێ یە ؟**

* * *

ئەو شەوە **ئەفرایم سلومون** ئازاد کراو **ڕەئفەت** ئەل هەجان یان **لیوی کوهن** لەتەوقیف خانەدا مایەوە ، **ئەفرایم سلومون** بینای وەزارەتی هەرێمی بەجێ هێشت و تا سبەینێ بەیانی **لیوی کوهن** بوو بوو بە قارەمانێکی ئەفسانەیی ! سەیرتر لەوە دابوو کە دوای ماوەیەک بینای هەرێم پڕ بوو لە خێزانی جوولەکە کە بۆ قارەمانی خۆیان خواردن و خواردنەوەو دیاریان هێنا بوو

*   *

کاتێ کە **ڕەئفەت ئەل هەجان** لەدوای چەند ڕۆژێک لەتەوقیف خانەکەڕزگاری بوو ، زۆر بێ تاقەت دیار بوو بەڵام لە لایەن کۆمەڵگای جوولەکەکان لەقاهیرە پێشوازیەکی بێ وێنەی لێ کراو هەموو دەرگاکانی بەڕووداکرانەوە ، هەمووان ڕێزیان لێ دەگرت   بانگهێشتێکی جوامێرانەیان لێ کرد بەڵام ئەو بەسەر شێتی یەکی شۆڕشگێڕانە ! پەنا بردن بۆ خەڵکی تری ڕەت کردەوە ، چووە سەر هەمان کاری ڕابردووی خۆی کە کاروباری بازاڕ بوو ، ئەو وەکو هەموو جوولەکە گیراوەکانی تر داوای کۆچ کردنیان لێ کرد بەڵام ڕازی نەبوو ، ئەو ڕازی نەبوونە ئەوی لەنێو جوولەکەکاندا ناسراوتر و خۆشەویست تر کرد

لەکۆتایی ساڵی ١٩٥٤ یەکێک لەگیراوەکان چالاکیەکی نموونەیی خۆکوژی نواندو لەسەرەتای ساڵی ١٩٥٥ دا حوکمی لەسێدارە دانی دووکەس جێ بەجێ کرا ، لەپاش ئەو بارودۆخە ناوو شۆرەت و ڕێزی گەنجەکە لەلای هەموو جوولەکەکان زیاتر بوو بەشێوەیەک کە ناوو ناوبانگی لەسنورەکانی میسر تێ پەڕی ، ئەو چەندەها جار دەگیراو کۆچیان پێ دەکرد بەڵام لەسەر داوای خۆی ڕازی نەدەبوو ، تا ڕۆژێک گەنجەکە لەناو شەقامەکانی ( ازهر ) دا چۆناو فرۆشگایەکی گەورە ، خاوەنی فرۆشگاکە یەکێک بوو لەسەرمایەدارەکانی جوولەکەو لەبنەڕەت دا لوبنانی بوو ، هەرکە گەنجەکە پێی نایە ئەو فرۆشگایە پێی گوترا بوو کە خاوەنی فرۆشگاکە دەیەوێ تۆ ببینێ

گەنجەکە خووی وابوو کە قەت بۆ دیدار داوا لەگەورەکانی جوولەکە نەکات ، ئەو بە هەر فرۆشگایەک یان گەڕەکێکی کاسبکاردا دەڕۆیی تەنها کاری کڕین و فرۆشتنی ئەنجام دەدا

چونکە خاوەنی فرۆشگاکە ئەوی لەمەوبەر نەدی بوو جگە لەجارێک ئەویش بەڕێکەوت لەبەر ئەوە خاوەنی فرۆشگاکە بایەخێکی بۆ دانەنا ئەویش خاوەنی فرۆشگاکەی بەهیچ حیساب نەکرد

* * *

کرێکاری فرۆشگاکە بەهێواشی لەدەرگای ژوورەکەی دا ، ئەوجار هاتە ژوورو گەنجەکە لەپاش دەرگاوە چاوەڕێ بوو ، غەوغاو و دەنگە دەنگی دەهاتە بەرگوێ ، پاشان گەنجەکە بەدەنگێکی بەرز خاوەنی فرۆشگاکەی وەئاگا هێنایەوە

- لێی گەڕێ بابێتە ژوور

ڕەئفەت لەدیوێکی دێرین و کۆن بەڵام پڕ لەکەل و پەلی بەنرخ وەژوور کەوت ، دەنگی داخرانی دەرگای لەدوای خۆیەوە بەهێواشی بیست ، چاوی بەپیاوێکی کورتە باڵا کەوت کەلەسەر کورسی یەکێ دانیشتبوو ، دەت گوت لەنێو ئەو کورسی یە گەورەدا نقوم بووە ، دەنگی پیاوەکە هەراسانی کردبوو

- وەرە یاکوب ، وەرە لەلای من دانیشە تا چاک بت بینم .

دڵی گەنجەکە کەوتە لەرزین ئەوە هەمان ناوە خوازراوەکەی ئەو بوو ، ڕێک لەو وەختەدا ئاواتی محسین ممتاز هاتە دی. گەنجەکە زۆر بەنەرم و نیانی بۆ لای کورسی یەکە ڕۆیشت کەلە بەردەم مێزەکە دانرا بوو ، ویستی دابنیشێ ، بەڵام دەنگی گوێ ڕووشانی پیاوەکە ، دووبارە بەرز بۆوە

- نەک لێرە وەرە لەسەر ئەو کورسی یە دانیشە تا چاکت ببینم .

ڕەئفەت لەسەر ئەو کورسی یە کە پیاوەکە ئاماژەی پێ دەکرد و لەبەردەم چرایەک کەلەسەر مێزەکە دانرا بوو دانیشت ، ڕوناکی چرایەکە هەموو دەم و چاوی گرتبوو ، ئەویش پیرەمێردەکەی دەدیت ، پیرەمێردی شەست ساڵە ، بەچاوە شینە خومارەکانی لەدەم و چاوی گەنجەکەی دەڕوانی ، بەڵێ ئەو هەمان ئەو ڕێویە بازرگانە بەنێو بانگەکە بوو !

هەمان میرزا ( صروف ) کەلە بازاڕی ( أزهر ) و ( موسکی) دا باسیان دەکرد

دەنگی پیرەمێردەکە گەنجەکەی بەرەو لای خۆی ڕاکێشا : - تۆ کێی ؟

بەکسەر دڵی گەنجەکە ڕاچڵەکی چونکە خۆی لەبەردەم تاقی کردنەوەیەکی زۆر سەخت دا دەدیتەوە ، ئەو بەزەردەخەنەوە گوتی

- قوربان ، ئەدی تۆ بەناوی خۆمت بانگ نەکردم ؟

پاشان گەنجەکە گوتی

- یاکوب بنیامین حنانیا

پیرەمێردە جوولەکەکە هەروا بەچاوە ماندوو و ڕوخسارە چرچ و لۆچەکەیەوە حەپەسابوو

گەنجەکە دەست بەجێ تێ گەیشت کەئەو بازرگانەجوولەکەیە شادەماری ناخی ئەو دەناسێ ، تەخمین و شك پێ بردن سەری هەڵدا ، پیرەمێردەکە لەدەم و چاوی گەنجەکەدا بەدوای نیشانەکانی دەم و چاوی باوکی دا وێڵ بوو ! !

- من بەباوکتم گوت لێرە بمێنەوە باشترە      بەڵام ئەو نەی دەویست قسەی من ببیستێ .

دڵی گەنجەکە بەتوندی کەوتە ترپە بەشێوەیەك کە هەتا گوێت لەدەنگی دەبوو ، بەڵام ئەو بەڕاستی دەی زانی کە قسەی میرزا ( صروف ) گەشتێکە بەنێو کون و کەلەبەرو دنیای حەشارگەی جوولەکەکان ، کاتێ کە دەیەویست فرۆشگاکە بەرەو شەقامی أزهر بەجێ بێڵێ ، هەستی دەکرد لە شادی دا نغرۆ بووە ، ئەو ئێستا دەی زانی کە تاقی کردنەوە سەختەکەی بە نمرەی بەرز پشتگوێ خستووە

کاتێ گەنجەکە ئەو هەواڵە گرنگەی بەمحسین دا ، هەردووکیان لەخۆشیان لەپێستی خۆیان دا جێگەیان نەدەبۆوە ، محسنیش هەواڵی گرنگی بۆ گەنجەکە پێ بوو ، هەواڵێك کە گێڕانەوەکەی پێویستی بەکاتێکی گرنگ هەبوو

بەم شێوەیە محسین سەیارەکەی بەرەو ڕێگەیەکی پێچاو پێچ لێ خوڕی تاسەری لەگۆڕەپانی ( سانت فاتیما ) کە یەکێك بوو لە گۆڕەپانە بەناو بانگەکانی ناوچەی ( میسری نوێ ) وەدەرنا ، سەرەنجام محسین سەیارەکەی بەهێواشی لەبەردەم ماڵێکی دوو نهۆم دا ڕاگرت ، لەنهۆمی سەرەوە مام ( عبدوە ) بەگەرمی بەڵام بەخەواڵوویی پێشوازی لێ کردن ، چونکە کاتێ ئەوان گەیشتن ئەو خەوتبوو و لەدوای ئەوە کە دوو ئیستیکان چای بۆ هێنان مۆڵەتی خواست تا بڕوات

ڕەئفەت عادەتی وابوو ئەو شتەی کەلە نێوان دوو دیداردا لەگەڵ محسین کە ڕووی دەدا بینوسێ ، هەموو جارێ محسین یەکەم جار ڕاپۆرتەکەی لێ وەردەگرت و لەگیرفانی خۆی دەهاویشت ئینجا ڕاستی ڕووداوەکەی لەزمانی گەنجەکەوە دەبیستەوە.

بەدرێژایی ڕێگا بی دەنگ بوون ، گەنجەکە بەخەمبار دەهاتە بەرچاو پەلەی بوو تا ڕووداوەکانی دیدارەکە لەگەڵ میرزا ( صروف ) دا لێک بداتەوە ، محسین وەکو پەیکەرێک جووڵەی لەخۆی بڕیبوو کاتێ کە مام ( عبدوە ) لەژوورەکەی هاتەدەر ڕەئفەت ڕاپۆرتی خۆی پێشکەشی محسین کرد کە دەی گوت

- دەتوانم بڵێم ئێستا بەتەواوی ئامادەم !

محسین ڕاپۆرتەکەی خستەوە گیرفانی ، خۆی بۆ وت و وێژ ئامادە کرد ، وت و وێژ دەربارەی ئەو وشانەی کەدەربڕینیان ئەستەم و تاڵە

- ئامادە بۆچی ؟

گەنجەکە لەخۆشیان شاگەشکە بوو بوو و هاواری دەکرد

- ئامادەم تا دەنگ و باسی ئەو جوولەکانەی کەلە میسر دان یەک بەیەک بدرکێنم

گەنجەکە وا چاوەڕوانی لە محسین دەکرد بەم هەواڵە سەرسام بێ و لێی بکۆڵێتەوە ، بەڵام محسین گوتی

- ئەوە ئەو داخوازیە نیە کە من دەمەوێ

گەنجەکە بەسەر سامیەوە قسەکەی بڕی

- تێ ناگەم

- من هەواڵی جوولەکەکانی میسرم ناوێ

بێ دەنگی یەکی قورس هەوای ژوورەکەی داگرت ، بۆ ساتێک چاوەکانی محسین لەچاوەکانی گەنجەکەدا توانەوەو خورپەیەکی لە دڵ هەستاند گەنجەکە هەستی دەکرد کە چاڵێکی قووڵ لەژێر پێیدا زاری کردۆتەوە .

- نازانم ، لەمە ناگەم

- من هەواڵی ئەو جوولەکانەم لەتۆ دەوێ کە ئیسرائیلین

گەنجەکە لەو ساتە وەختەدا هەستی دەکرد کە لێدانەکانی دڵی ئازاری پێ دەگەیەنێ

**محسین** هەستاو لەکاتێکدا کەلە ژوورەکەدا پیاسەی دەکرد گوتی

- من نامەوێ هەر ئێستا وەڵامم بدەیتەوە بەڵکو دەمەوێ باش بیری لی بکەیتەوە

گەنجەکە وەڵامی نەدایەوە ، چاوی بڕیە **محسین** ، هەستی دەکرد قورسایی خۆی لەدەست داوەو هەروەک ئەوە کەلە هەوا دا مەلە بکات ، **محسین** درێژەی پێدا

- لەدوای بیرکردنەوەش ئەگەر هەر خۆت بەبێ توانا دیت ، گرنگ نیە ، لەوانەیە ڕێگەیەکی تر هەبێ کە بتوانیت خزمەت بەدین و ئایین و وڵات بکەی !

گەنجەکە بەخولیایەکی لەڕادەبەدەرەوە دوبارەی کردەوە :

- دینم ، ئایینم ، وڵاتم ؟

- بەڵێ بەڵام **ڕەئفەت** تەنها شتێک کە حەزم لێیە پێت بڵێم ئەوەیە کە وڵاتەکەت پێویستی پێتە

**ڕەئفەت** ڕاستگۆیانە گوتی من گیانم لەو ڕێگەیە بەخت دەکەم ئەو ڕستەیەی هێندە سادەو بێ گرێ و گۆڵ دەربڕی کە دڵی هەر مرۆڤێکی دەخستە ژێر کاریگەرەوە **محسین** لەکاتێکدا کەلێی نزیک دەبۆوە گوتی نا ! دەمەوێ باش بیربکەیتەوە

- من پێت دەڵێم سەرم لەو ڕێگەیە دادەنێم

- **ڕەئفەت** !

- گەنجەکە هەستاو ڕووبەڕووی **محسین** ڕاوەستا

- ناوی من **لیوی کوهنە** ئاغای **محسین** بەگ ، وە ناوی ڕاستەقینەی من کە ئەوڕۆ **میرزا صروف** منی پی بانگ کرد ، **یاکوب بنیامین حنانیایە**

**محسین** بۆ چەند ساتێ لەدەم و چاوی گەنجەکە ڕاما ، هەواڵێک کە شەو بۆ وی هێنا بوو زۆر پڕ بایەخ بوو بۆ چەند چرکەیەک حەپەسا ، چونکە ئەو میرزا صروفی چاک دەناسی ، پلەو پایەی ئەوی لەنێو جوولەکەکانی میسردا دەزانی ، **محسین** بۆ لای کورسیەکە ڕۆیشت و ڕووبەڕووی گەنجەکە دانیشت ، گوتی :

- **ڕەئفەت** وەرە پێم بڵێ چ ڕووی داوە ؟

- ئەو باوکمی دەناسی

مەحاڵە کە پیلانێکی هێندە ورد نەگاتە ترۆپکی سەرکەوتن ...

- لەپێش ئەوەی کە باوکم ( میرزا بنیامین حنانیا ) کۆچ بکات ، میرزا صروف ئامۆژگاری کرد بوو کە خۆی لەسەفەر کردن دوور بگرێ و بۆ وی وا بەباشتر دەزانی ، کەهەر لەمیسردا بمێنێتەوە بەڵام باوکم ڕکابەری کردبوو

وشەکانی گەنجەکە بۆ محسین وەک مرواری بەقیمەت بوون

- ئەوڕۆ چوومە فرۆشگا تا هەندێک پارە لەگەڵ خۆم دا هەڵ گرم و بچم نموونەی کاڵاکان بێنم ، دیتم کە کارمەندان بەمن دەڵێن : میرزا صروف کاری پێتە

گەنجەکە درێژەی بەگێڕانەوەی بەسەر هاتەکەدا بۆ محسین ممتاز بەسەرهاتێک کەبەرهەمی شەش مانگ هەوڵ و کۆششی شەوو ڕۆژی ئەوان بوو

محسین لەو شەوە لەیاد نەکراوەدا کاتێ بۆ ماڵ دەگەڕایەوە لەبیری گەنجەکە دابوو گەنجێک کە چ لەبنەماڵەکەی و چ لەوڵاتەکەی تەنها ڕەنج و ئەشکەنجەی کێشا بوو ، گەنجێک کە خێری لەخۆی نەدیبوو ، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەوانەش کاتێ کەزانی ئەوان پێویستیان پێیەتی گیانی خۆی لەسەر بەری دەستی دانا

هەندێک جار وا هەستی دەکرد ، ئەو یەکێکە لە سەربازە شۆڕشگێڕەکان و دەیەوێ هەنگاو بۆ بنیات نانەوەی وڵاتەکەی هەڵ بێنێ ، بەڵام ئەو چ گەنجێکە ؟ دزێکی دۆڕاو ، گەنجێکی شکەست خواردوو ؟ کەچی دەیەوێت هەنگاو بۆ جەرگەی مەترسی هەڵ گرێ !

محسین بۆ لای قەرەوێڵەکە ڕۆیشت بەڵام خەوی لێ نەکەوت هەرچەندە زۆر ماندوو شەکەتیش بوو ، ئازار بە مۆخی ئێسقانەکانی دا دەچۆ خوار ، هەموو گیانی دێشا ، بەڵام هێشتا هێورو لەسەر خۆ بوو ، لەسەر قەرەوێڵەکەی هەستاو بۆ ژووری خوێندنەوە چوو ، لەناکاو زەنگی تەلەفۆنەکە لێدا ، تەماشای سەعاتەکەی کرد سەعات نزیکی دووی بەیانی بوو بیری کردەوە حەتمەن هاوکارو هاوەڵ و سەرۆکەکەی حەسەن سفر کاری پێیەتی ، دەسکی تەلەفۆنەکەی هەڵ گرت ، دەنگی زەنگەکە پچڕاو بێ دەنگ بۆوە

- جەناب سەر لەشکر محسین ممتاز ؟ !

دەنگەکە هێندە جددی بوو کە محسین هەڵدەلەرزی ، محسین ممتاز لەو وەختەدا سەر لەشکر نەبوو و لەهەموو ژیانیشی دا قەت نەگەیبۆ ئەو پلەیە ... محسین مەترسیەکی هەست پێ کرد بەڵام بەوریایی دانی بەخۆیدا گرت ، پاشان گوتی :

- من محسینم کێ قسە دەکات

- ببورە جەناب ... تکایە دەسکی

لەدوای چەند چرکەیەک دەنگی ڕەئفەت هات

- شەو باش محسین بەگ .

- کێ قسە دەکات ؟

- من ڕەئفەت ئەل هەجان

لەهزری محسین دا دەنگێک دەهات وەک ئەوەی شتێک ڕووی دابێ ڕووداوێکی وا کە هەموو شتێکی دەکردەوە بەبڵقی سەر ئاو

ڕاستیەکەی بۆچی ڕەئفەت ناوی ڕاستەقینەی خۆی لەتەلەفۆنەکەدا گوت ؟

بێ دەنگی بۆ چەند چرکەیەک درێژەی کێشا ، لەدوای ئەمە گەنجەکە گوتی :

- من ڕەئفەت ئەل هەجانم ، قوربان !

- لە کوێوە قسە دەکەی ؟

- لەبازگەی ( کوستکا )

- کێ تۆی گەیاندە بازگەی ( کوستکا ) ؟

شتێک کە ڕووی دا سادە بوو ، بەڵام بۆ هەڵوەشانەوەی هەموو کارەکان بەس بوو ، هەموو پیلانەکانی دەکردەوە بە بڵقی سەر ئاو

# بەشی دەیەم

## دوید شارڵ سمحون دووبارە زیندوو دەبێتەوە

کاتێ گەنجەکە لەو شەوەدا لە محسین جودا بۆوە ، زۆر بەجۆش و خرۆش بوو باسەکەی بەلاوە وەک جۆرە شێتی یەک وابوو ، بەشێک لەقسەکانی محسین ممتاز ئەوە بوو کە پێویستە سەفەر بکات بۆ ئسرائیل و لەناو جەرگەی ئیسرائیل دا وەکو جوولەکەیەکی ئیسرائیلی کە باوەڕی بە ئیمپریالیزم هەیە مامەڵە بکات و نەک تەنها هەر پەیوەندی یەکانی لەگەڵ ئیسرائیل دا بپچڕێنێ بەڵکو بەرواڵەتیش ڕکابەرایەتی بکات ، ئایا ئەو دەتوانێ کارێکی وا ئەنجام بدات ؟

لەکاتێکدا کە شەمەندەفەرە ژێر زەمینەکە ئەوی لەو شەوەدا بەدەنگە نەپساوەکەی خۆی لەخاڵێکی دوورەوە تا ناوەندی شار دەبرد ، گەنجەکە هەستی دەکرد کە زۆر ڕازی یە چونکە مەترسی یەکانی ئەو کارەی جێگای پێش بینی کردن نەبوون بەلام ئەو خۆشی نەی دەزانی کە بۆ دەبێ بۆ سەفەرکردن بۆ ئیسرائیل ئەو هەموو بێ ئۆقرەیی یە لەخۆیدا بێنێتە دی ، لەماوەی گفت و گۆکانی لەگەڵ محسین لێی پرسی ئەگەر لەناو ئیسرائیل دا هەڵیان ناو پیلانەکەی سەری نەگرت چی ...

محسین بەوەڵامەکەی پێکەنی و گوتی :

- شتێکی مەحاڵە تۆ هەڵ بنێن ، هەڵبەتە ئەگەر بەوردی و بەبێ سەرپێچی و لاملی مەشقی پێویست ببینی ... دوبارە گەنجەکە نکوڵی کرد

- جەنابی محسین ! استغفرالله تەنها خوا هەڵە ناکات ، وای دانێ من هەڵەم کردو ئاشکرابووم ئەوکاتە چیم لێ دەکەن

محسین بەڕاشکاوی گوتی

- لەوانەیە لەسێدارەت بدەن

گەنجەکە دەربارەی ئەوەی کە بیستی زۆر بیری لێ نەکردەوە ، بەڵکو هەوڵی دا لەخزمەت محسین دا لەقسەی خۆی پەشیمان بێتەوە بەلام نەی توانی ، هەستی دەکرد کە چارەنوسێکی نادیار بەرەو شتێکی ون پاڵی دەنێت گەنجەکە کەسێکی سیاسی نەبوو ، قەتیش گرنگی بەسیاسەت نەدەدا ، بەڵکو هەستیشی پێ نەدەکرد ،

بەڵام ئەوەی کە دەربارەی ڕەفتاری جوولەکەکان لەگەڵ عەرەبەکانی فەلەستین دا دەی بیست ، دڵی ڕادەچڵەکاند کرداری نامرۆڤانەو ستەم کارانە دڵی وەک بەردیشی دەهێنا هەژان

ئەو ئێستا لەدڵی خۆیدا دوژمنایەتی یەکی سەیری سەبارەت بەجوولەکەکانی میسر هەست پێ دەکرد هەرچەندە کە بەڕەگەز میسریش بوون بەڵام نەفرەتیان لەمیسری یەکان دەکرد ، ئەو کاتەی کەئەو لەدایک بوو بوو و نرابۆ بەر خوێندن و لەگەڕەک و سەرشەقام لەگەڵ هاوتەمەنەکانی خۆی یاری دەکرد هیچ جیاوازیەک لەنێوان موسڵمان و مەسیحی و جوولەکەکاندا نەبوو

جوولەکەکانی میسر وەکو ئەوانی تر کاریان دەکرد ، لەکارە هونەریەکاندا سوودمەند دەبوون ، زیرەک بوون بەڵام تابڵێی چاو چنۆک بوون ، چاو چنۆکی و تەماع کاریەکەیان نەک تەنها لەمیسر بەڵکو لەهەموو دنیا دەنگی دابۆوە

ڕۆژێک گەنجەکە بە **محسینی** گوت ئەگەر ئەوان لێرە هێندە قین لە دڵ بن لەئێمە ئەدی دەبێ لەوێ قین لەدڵیەکەیان چەندو چۆن بێ ؟ ئەو زۆر هەوڵی دەدا کەلە بارەی ئەو باسەوە خۆی لە **محسین** بدۆزێتەوە و **محسین** تکۆڵی و پێدا گری کرد

– **ڕەئفەت** من نامەوێ هەر ئێستا بڕیار بدەی و خۆت یەکلا بکەیتەوە

– جەنابی **محسین** ، من بڕیاری خۆم داوەو تەواو

ئەگەر وابیر بکەیتەوە کە بەڕازی بوونت لەوانەیە دووبارە ڕاپێچی بەندیخانەکرێیتەوە ئەوە بێ گومان بەهەڵە داچووی ، تۆ دەبێ ئەوە بزانیت کە ئابڕو و پیاوەتی خۆت بەخۆتەوەیە جا ڕازی بی و چ ڕازی نەبی کە بڕۆی بۆ ئیسرائیل

**محسین** لێی نزیک کەوتەوەو دەستی لەسەر شانی داناو بەبەزەیی یەوە درێژەی پێدا

– هەوڵ بدە هەموو بیرەوەریە تاڵەکانی ڕابردوو لەبیر خۆت بەریتەوە ، هەتا ئەگەر بتەوێ لەمیسریش دا دەست بەکار بی دۆسیەکەت پاکە

گەنجەکە هەستی بەبەختەوەریەکی ڕاستەقینە دەکرد ، چونکە ئەوە دەرفەتێکی زێڕین بوو کە بۆ ئەو ڕەخسا بوو تا سەر لەنوێ تێ هەڵچێتەوە بەڵام ئەو دوا بڕیاری خۆی دابوو و باسەکەی بڕیبۆوە

بەهەر حاڵ **محسین** بەجێی هێشت تا دیسانیش دەرفەتی بیرکردنەوەی هەبی ، **محسین** دەی زانی کە دانانی ( **جون دارلنگ** ) **بەرەئفەت** ئەوی لەنێو جوولەکەکاندا زۆر خۆشەویست کرد بوو

**محسین** بناغەی پیلانەکەی لەگەڵ **رەئفەت** دا دامەزراند ، **پێویستە گەنجەکە** دزەی خۆی لەنێو جوولەکەکاندا زیاتر بکات

پێڕی جوولەکەکان بەهەموو جیهاندا بڵاو بوونەتەوە و جۆرەها شێوەو ڕێگەی یاسایی و نایاسایی لەزەوت کردنی سەرو ماڵی خەڵکدا دەگرنە بەر ئامانج لەگواستنەوەی کەل و پەلی جوولەکەکانی میسریش بۆ دەرەوەی وڵات هەرەس پێ هێنانی ئابوری میسر بووە ، ( **جون دارلنگ** ) هیچ نەبوو جگەلە زایۆنیەکی بەگڕیشە کە تایبەتمەندی هەبوو لەگواستنەوەی سامان و موڵکی خەڵکدا ، کەسێک بوو کە ناوی بنەڕەتی و شۆڕشگێڕی لای هەموو کەس نادیار بوو بۆیە بوو بوو بەسەرچاوەی قسەو باس ، قسەو باسی زۆری لەبارەوە دەکرا ، ئەو لەزۆر وڵاتان لەژێر چاودێری دا بوو ، ئێستا دەبووا گەنجەکە هەوڵی دابا کە جگە لەوەی هەموو شتێک وەلادەنێ جوولەکەکانیش دووچاری دڵەڕاوکێ بکات کەلەوانەیە ئەو ( **جون دارلنگ** ) بێ .

لەمەولا دەبوا گەنجەکە ئازایەتیەکەی خۆی پاراستبا و لەڕۆڵی جوولەکەیەکی دڵسۆزدا دەرکەوتبا و لەوەدەرنانی سەرو ماڵی جوولەکەکاندا بەشداری کردبا

**محسین** پیلانە هەنووکەیی یەکانی فێرکرد تا لەوەدەرنانی سەروماڵی جوولەکەکاندا کەمتر بەشداری بکات ، پاشان وا پێویست دەبوو کەبەشداری لەگرێ بەستەکاندا بکات ئەو گرێ بەستانەی کە سەرمایەدارانی ڕژێم لەهەوڵی دەستەبەرکردنی دا دەبوون

- چ ڕۆژێکی ڕەشم لەبەر دەم دایە
- چ بووە ؟
- پۆلیس ئەو ناوەی ناسی ؟
- دیارە تۆ وا بیر دەکەیەوە کە ئەوانە قومار دەکەن ؟

پێویستە کە خۆت بەدەستی قەدەر لەنێو جوولەکەکاندا قوتار بکەی و بەتەواوی خۆت بدەی بەدەست تالع و چارەنوسەوە ، پێویستە وشیارانە تر مامەڵە بکەی

- جەنابی ئاغا

محسین قسەکەی بەیەکجایی بڕی

لەدانیشتنەکەی نێوان عەزیز جەبالی و خانم سمحون دا ، لەژوورێکی سادەی ڕێکخراوی ئاسایش و هەواڵگری ، لەناکاو خانم سمحون ڕقەکەی تەقیەوە ، فرمێسک بەرچاوی گرتبوو

عەزیز کەمێک ڕاما خانم سمحون لەکاتێکدا کە بە دەسترۆکە فرمێسکەکانی دەسڕیەوە ، پێ کەنی و گوتی :

- ئاغا جەبالی ئەو شتەی کە تۆ باسی دەکەی ، وەڵامێکە بۆ دڵەڕاوکێ و ڕازە گەورەکانی ژیانی من بەڵام هیوادارم کەبرینە سارێژبووەکانی ڕابردووم بریندار نەکات

- کاتێ کەیەکەم منداڵی بوو دوید ا ڕەئفەت ا زۆر خۆشحاڵ بوو بەشێوەیەک کەلەو هەموو شادمانیەی ئەو سەرم سوڕمابوو ، بەڵام لەهەمان کاتیشدا نیگەران بوو ، نیگەرانیەک کەمنی ئازار دەدا ، کاتێ کە هۆی نیگەرانیەکەم لێ پرسی شتێکی وای نەگوت ، بەڵام جارجارە شتێکی لەمن دەپرسی کە بەڕاستی بەلامەوە سەیر بوو و پاش کەمێک دەنگی نووساو فرمێسک بەچاوەکانیدا هاتە خوار ا بێ دەنگیەک بۆ ماوەی چەند خولەکێک باڵی کێشا تا ئەوە کە هێلن سمحون هاتەوە خۆو ا گوتی وا باشترە بگەڕێمەوە سەر قسەکەی خۆم چونکە حەز ناکەم زیاد لەوەی کە پێویستە لەکاتت بگرم. عەزیز جەبالی بۆ ڕێز لێنان لەیادگارە پڕ لە تاسەکەی شتێکی نەگوت و درێژەی بەقسەکەی خۆیدا

گەنجەکە هەستی متامەنە بەخۆبوونێکی سەیری لەلا پەیدا بوو هەستی دەکرد دنیا لەگەڵیدا ئاشت بۆتەوە ، ئێستا یەکەمین جاریەتی لەژیانی دا کەهەست بەشانازی و سەرفرازی دەکات ، شەقامەکانی قاهیرە لەبەرچاویدا دەدرەوشانەوە ، واگۆنی شەمەندەفەری لەناو قەدی شار بەجێ هێشت و هەموو ڕێگاکەی هەر لەشەقامی عیمادالدین تا شەقامی سلێمان پاشا ا ئەو جێگایەی کە چێشتخانەکەی ئیستانبیلۆس ا ی لێ بوو بە پێ بڕی

لەچێشتخانەکە **ئەفرایم سلومونی** دیت ، **ئەفرایم سلومون** هەر کاتی **ڕەئفەتی** دەدی پێی دا دەنوساو دەست بەرداری نەدەبوو مەگەر گەنجەکە بەزۆرە ملێ خۆی لەبەردەستانی قوتار کردبا ، سەعاتێک لەگەڵیدا کەوتە دوان ، پاشان ویستی کەمێک بەتەنیا بمێنێتەوە ، نەی دەزانی کە **محسین** کەی مۆڵەتی سەفەری پێ دەدا ، بەڵام دڵنیا بوو کەلە چەند ڕۆژێکی ئایندەدا دەچێت بۆ ئیسرائیل ، هەر لەو وەختەی کە گەنجەکە بەرەو چاخانەکە کەوتە ڕێ ، **ئەفرایم سلومون** زانی کە قارەمانەکەی ئەو شەو کارێکی گرنگ و نهێنی هەیە ، ئەو هەوڵی دەدا ڕێز بۆ بێ دەنگی یەکەی دانێ بەڵام نەی توانی ، پاشان لێی پرسی : نەخۆشی ؟ تێ ماوی ؟ **ڕەئفەت** بەتوڕەیی و بەدەنگێکی نزم گوتی :

- من لێرە ژیانم نیە **ئەفرایم** !

**ئەفرایم** بەتاسەوە گوێی بۆ قسەکەی شل کردبوو

- پێویستە کۆچ بکەم ... پێویستە بڕۆم بۆ ئیسرائیل

لەکاتێکدا کە بۆ ڕۆیشتن ڕەپێ دەبوو لەو وەختەدا گوتی

- تەنها من نیم ... هەموو جوولەکەکان دەبێ لەو شارە بڕۆن

پاشان مۆڵەتی لە **ئەفرایم** وەرگرت و بەجێی هێشت ، **ڕەئفەت** ملی بەشەقامی سلێمان پاشاوەنا بەرەو ماڵ ، ماڵێک کە هەرچەندە مانگێک تێیدا ژیابوو بەڵام پێی دەزانیەوە ، لەناکاو هەستی بڵاوبوو ، لەڕێگا خۆی بە دوو گەنج دا کێشا ، ئەویش چونکە درەنگیان بوو بەهەڵەداوان درێژەیان بەڕۆیشتنەکەیان دا

گەنجەکە ئاوڕی لێ دانەوەو گوتی :

- زۆر شەرمە زارم

ئەوەی گوت بەڵام لەپڕدا ڕاچڵەکی ، دوو گەنجەکە لەشوێنی خۆیان حەپەسان ، یەکێک لەوان بەهاوەڵەکەی گوت :

- دەی بینی ، دکتۆر !

بەڵام دکتۆر ئێقەی **ڕەئفەتی** بەرنەداو لەکاتێکدا کە ددانی دەچڕیەوە دەبردن ، هاواری کرد

- سەرەنجام کەوتیە داو ، **ڕەئفەت** !

هیچ شتێک بەلای گەنجەکەوە هێندە گرنگ نەبوو کەلە چێشتخانەکە دوور کەوتبایەوەو کڕیارەکانی کە ئەویان بەقارەمانی میللی دەزانی سەرەداوێکیان لەم بارەوە دەست کەوتبا

شەقامەکە تاڕادەیەک چۆڵ بوو ، بەلام هات و هاواری دووگەنجەکە لەو شەوە سامناک و بێ دەنگەدا سات لەدوای سات زیاتر دەبوو ، ئەوان ئەویان بەساختەچی و دەستبڕ تۆمەت بار دەکرد و دەیان گوت چەکێکی پارەی تەزویری بۆ ڕاکێشاوین

ڕەئفەت هەر کە ئەوانی دی کەوتەوە یادی ڕۆژانی ڕابردوو چونکە مەحاڵ بوو ئەو ڕۆژە ڕەشانەی پێ لەیاد بکرێن ، کاتێ کە ئەو لە ئەمریکاوە بۆ کەنەداو لەکەنەداوە هەڵدەهات بۆ پاریس ، ڕۆژگار ئەوی بە دەست تێوەردان لەتاوانی هەمەجۆر هەڵ داشتبوو ، لەڕاستی دا ئەو بەرگریەکی زۆری لەخۆیدا پیشان دا ، بەلام سەرەنجام بڕیاری دا کە لەگەڵ ڕۆژگاردا تێ هەڵچێتەوە ، ئەو ئەوانی فریوداو چەکی تەزویری دانێ و لەبەرانبەردا چەند فرانکێکی فەرەنسی دەست کەوت ، بەو پارەیە هەلات بۆ بەریتانیا و ئێستاش دەیەوێت لەو فرت و فێڵە خۆی دەربازبکات ، دەبێ لەو دادو فوغانەی سەر شەقامەکە کە ژمارەیەک لەڕێبوارانی لەدەوری خۆی کۆکردۆتەوە خۆی قوتار کات چونکە وردە وردە قەرەباڵغیەکە زیاتر دەبوو ، لەکاتێکدا کە ڕەئفەت زمانی دەگیراو قسەی بۆ نەدەکرا پاسەوانێک هاتە لایان و پرسی

- برادەران چ ڕووی داوە ؟

ڕەئفەت کردی بەهەرا

- دەمەوێ بچمە پۆلیس

هەتا وێستگەی پۆلیسی هێندە دوور نەبوو بەلام ئەوەیان بەلایەوە زۆر گرنگ بوو چارەیەکی نەما جگە لەوەی کە هەرچی زووە لەشەقامی سلێمان پاشا دوورکەوێتەوە یان دەبێ بگیرێت ، هەندێک لەکڕیارەکانی چێشتخانەکە دەبیندران کە چاخانەکەیان بەجێ دەهێشت و هەندێکیان بەرەو پیری هەڵلاکە دەهاتن ، ئەو خەڵکە ئەویان دەناسی و دوور نەبوو کە ئەفرایم سلومونیش لەنێو ئەوان دا بووبێ چونکە بەردەوام ڕێگەی ماڵەکەی بەوێدا بوو ، دەبوا بەخێرایی دەست بەکاربێ چونکە تەنها چەند ساتێکی تر نهێنی یەکەی لێ بەدرۆ دەهاتەوەو ڕیسەکەی لێ دەبۆوە بە خوری ، ئەو دوو گەنجە خەریک بوون ئەو شتەی کە ئەو و محسین بەچەند مانگێک بەخوێنی دڵ

بنیاتیان نابوو ، هەڵبووەشێتەوە بەڵام ڕەئفەت پەلاماری یەکێکیانی داو قوڕ قوڕاگەی گرت و بەتوڕەیی بۆ لای هاوەڵەکەی پاڵ ناو گوتی

- تۆ چیت لەمن دەوێ تۆ

ناچاربوو دۆخەکە گرژتر بکات تا ڕاوەستانەکەیان زۆر درێژە نەکێشێ و لەکورتی ببڕێتەوە ، ئابلۆقەکە چڕتر بۆوە و یەکێک لەوان کردی بەگاڵە

- تەماشاکە تەماشا ! فەرمانیشمان بەسەردا دەکات

- من دزم ... ؟ ! من تۆم لەکوێ ناسیوە ؟

پاسەوانەکە زانی چار نیە دەبێ ئەوجار خۆی تێ هەڵقورتێنێ دەستی گەنجەکەی گرت چونکە ئەو گێچەڵەکەی هەڵگیرساند بوو بەتوڕەیی دەستی ڕاوەشاندو گوتی :

- کەس لەشوێنی خۆی نەجوڵێ .

گەنجەکە گوتی

- سەرکار[1] خۆ بیستت چیان پێ گوتم

پۆلیس گوتی :

- هەر کەسێ قسەیەکی هەیە با لە پۆلیسخانە بیکات

یەکێک لەو دوو گەنجانە ویستی قسەیەک بکات بەڵام پۆلیسەکە بەتوڕەیی یەوە گوتی :

ئەدی ناڵێی فریویان داوم دەباشە هەر ئەو قسەیە لەپۆلیسخانە بە جەنابی سەروان[2] بڵێ ، پۆلیس ئەوەی درکاندو ڕووی کردە قەرەباڵغیەکەو بەدەنگی بەرز گوتی:

- بەو شەوە بۆچی کۆبوونەتەوە ، هەر کەس بەلای کاری خۆیدا بڕوات ، جارێکی تر چارەنوس یاریەکەی لەگەڵ ڕەئفەت علی سلێمان ئەل هەجان کە ئێستا بە یاکوب بنیامین حنانیاو لیوی کوهن ناسراوە دەست پێ کردەوە

- دۆخی سیاسی لەو ڕۆژگارەدا لەمیسر گرژو ئاڵۆز بوو ، گرتن و دادگایی

(1) پلەیەکی سەربازی یە بە واتا ( ملازم )

(2) پلەیەکی ئەفسەری یە

کردنی نەبەردە سیاسی یەکان گەیشتبۆ لوتکە ، بەشێوەیەک کە حکومەتی ئینقلابی ناچار کرا لەهەندێک ناوچە باری نائاسایی ڕابگەیەنێ و بلاوە بەخرِبوونەوەو کۆبوونەوەی شوێنە گشتی یەکان بکات ، لەبەرئەوە ئەو خەڵکانەی کەبۆ تەماشاکردنی وەستا بوون کاتێ قسەکانی پۆلیسیان بیست بلاوەیان لێ کردو شوێنەکەیان بەجێ هێشت .

دووگەنجەکە نەک دەست بەجێ ڕازی بوون بڕۆن بۆ مەخفەرەکە بەڵکو زۆریش خۆشحاڵ بوون ، لەڕاستی دا ئەوان بوو بوونە هۆکاری کۆبوونەوەی خەڵک و دەست بەجێ هەموویان بۆ لای کۆلانی لاتەنیشت کەبە گەڕەکی ( کوستکا ) کۆتایی دەهات ڕۆیشتن هەر بەوەندە کە ڕەئفەت لەشەقامی بنەڕەتی دوورکەوتەوە هەناسەیەکی ئارامی پڕ بەسی یەکانی هەڵ کێشا لە مەخفەرەکە دوو گەنجەکە لەبەردەم ئەفسەری مێرد منداڵ زۆریان بەسەر ڕەئفەت دا سەپاندو ئەفسەرە گەنجەکەش سەری لە قسەکانیان سورِما بوو دووگەنجەکە سەبارەت بەچەک قسەیان دەکرد کە گوایە ئەو لەبەرانبەر چەند فرانکێکی فەرەنسی ، چەکی نایاسایی پێداون ، ئەفسەرەکە ڕووی لە ڕەئفەت کردو لێی پرسی

- تۆ چەکی بێ مۆڵەتت پێ داون ؟

ڕەئفەت سەبارەت بە وشەی کە دووگەنجەکە دەیان گوت نکوڵی لێ نەکرد ، چونکە ئەو دەی زانی کە ئەوان ڕاست دەکەن بەڵام لەهەمان کاتیشدا لەبیری ڕێگەچارەیەک دابوو

دوو ژمارە تەلەفۆن کەیەکیان ئی ماڵی محسین و ئەوی تریان ئی شوێنی کارەکەی بوو بیری کەوتەوە کە شەوێک لەمەوبەر لێی وەرگرتبوون

دەنگی ئەفسەرەکە کە لە حاڵی پرسیارکردن دا بوو بەرگوێی کەوت جەنابی ماموستا ! بەڵام ڕەئفەت کەوتبۆ بیرکردنەوەیەکی قوڵەوە هاتەوە هۆش و بەزەردەخەنەوە ڕووی کردە ئەفسەرەکەو گوتی

- بەڵێ ! قوربان .

- ناوت چیە ؟

- ڕەئفەت عەلی سلێمان ئەل هەجان ، قوربان

ئەگەر ڕێکەوتێکی گێلانەی تر ڕووی داباو جوولەکەیەکی تریان بۆ ویستگەی ( کوستکا ) هێنابا لەو ساتەدا ئەوان هەموو هەنگاوەکانیان دەبوونەوە بڵقی سەر ئاو

گەنجەکە گوتی

- ئەوانە دەڵێن چی ؟

- تۆ چەکی بێ مۆڵەتت داوە بەوان ؟

- لەوانەیە دەست خۆشانە لە ( سەرکار ) بکەم

- بەڵێ فەرموو

دەتوانیت دەسکی تەلەفۆنەکە هەڵبگری و لەگەڵ سەرتیپ محسین ممتاز دا لەماڵەوە پەیوەندی بکەی

- سەرتیپ محسین ممتاز کێ یە ؟ لەوەزارەتی ناوخۆ ؟

- نا قوربان ... ئەو ئەفسەری سوپایە

- کاری چی یە ؟

- من نازانم تەنها شتێک کە لەبارەیەوە دەزانم ئەو کوڕە خاڵی منە

ئینقلاب ، ئینقلابێکی سوپایی بوو ، هەموو سەزکردەکان ئەو ئەفسەرانە بوون کە تازە پێ دەگەیشتن ، ڕابەرەکەشیان سەرهەنگێک بوو بەڵام ئەدی جەنابی سەرتیپ محسین ممتاز کێ یە ؟ ئەفسەرەکە لە گومان و دڵەڕاوکێ دا بوو ، ئەو دوو گەنجە کەیەکیان پزیشک و ئەوی تریان ئەندازیارەو لەدەرەوە خوێندویانە بانگێشەی ئەوە دەکەن کە گوایە کڵاو خراوەتە سەریان و فریو دراون و لە لایەکی تر ئەگەر بوونی ئەو سەرتیپە ڕاست بێ و کوڕە خاڵەکەی تۆمەت باربێ کارەکە چی لێ دێ ؟ بارەکە بەکام لادا دەکەوێ ؟

ئەفسەرەکە دەسکی تەلەفۆنەکەی هەڵ گرت و پرسی

- ژمارەی تەلەفۆنەکە چەندە ؟

- ٩٧٩٣٥

ڕەئفەت بەدڵنیایی یەوە ژمارە تەلەفۆنەکەی وێدا ، ئەفسەرەکە ژمارەکەی لێداو چاوەڕوانی زەنگی تەلەفۆنەکەی دەکرد ، دەنگی زەنگەکە پچڕا ، ئەفسەرەکە جووڵەیەکی کرد ، کاتێ کە دەنگی محسین دوور لە تەلەفۆنەکە بیسترا ، لێی پرسی

- جەنابت سەرتیپ محسین ممتازی ؟

- بەڵێ من **محسینم** کێ قسە دەکات

- ببورە قوربان با ساتێک دەسکی تەلەفۆنەکە لەخزمەتت دابێ

کاتێ کە ئەفسەرەکە گوێی لەدەنگی **محسین** بوو باوەڕی کردو بەڕێزەوە دەسکی تەلەفۆنەکەی دا **بەڕەئفەت** ، **ڕەئفەت** لەبەردەم ئەوانی تر خۆی واپیشان دەدا کە نیگەرانە

- شەو باش ، **محسین** بەگ

ئەفسەرو دوو گەنجەکە چاویان بڕیبۆ **ڕەئفەت** لەو لاشەوە تەلەفۆنەکە بەدەنگی **محسین** دەلەرایەوە ، ، **ڕەئفەت** هەوڵی دەدا کە ڕاستەو ڕاست کێشەکەی لێ حاڵی بکات ، **محسین** دووبارە پرسیەوە

- دیسان چ بووە ؟

**ڕەئفەت** بەکورتی هەموو ڕووداوەکەی بۆ باس کرد ، **محسین ممتاز** تەواو توڕە بوو بوو و لەکەوڵی خۆیدا جێگەی نەدەبۆوە بەردەوام هەڕەشەی دەکرد و نەفرەتی لێ دەباری **ڕەئفەتیش** بەشێوەیەک دەسکی تەلەفۆنەکەی گرتبوو کە ئەفسەرە گەنجەکە و سکالاچیە گەنجەکان بتوانن دەنگی **محسین** ببیستن

پاشان بێ وچان دەنگی **محسین** دەهات کە دەی گوت تەلەفۆنەکە بدە بە ئەفسەری ئێشکگر

ئەفسەرەکە دەستی درێژ کرد تا دەسکی تەلەفۆنەکە هەڵ گرێ ، بەلام پێش ئەوەی کە **ڕەئفەت** تەلەفۆنەکەی وێدا ، ئەو گوێی لەدەنگی محسین بوو بوو

ئەفسەرەکە بەڕێزەوە گوتی فەرموو جەنابی پاشا ( لەپێش ئینقلاب دا کاتێ کە ئەفسەرێک لەسوپادا پلەی سەرتیپی وەردەگرت پێیان دەگوت پاشا ) بەلام لەدوای ئینقلاب هەموو نازناوەکان هەڵدەوەشێندرانەوە بەلام لەنێو خەڵکدا برەویان هەر هەبوو.

**محسین** لەقسەکانی لەگەڵ ئەفسەری پاسەوان دۆغری بوو گوتی تۆ ناتوانیت کەسێک بە تۆمەتێک کە هێشتا بەسەریدا ساغ نەبۆتەوە بگری ، تەنها دەتوانیت ناونیشانەکەی وەربگریت و هەموو شتێکی لەگەڵ دادگادا یەکلابکەیتەوە

ئەو مەسەلەیە بەلای ئەفسەرە گەنجەکەوە جۆرە خافڵاندنێک بوو لەبەرئەوە **محسین** ڕێگەیەکی یاسایی و ژیربێژی گرتە بەرو وەک ئەفسەرێکی کارامە دەی زانی

کەچۆن لەگەڵ ئەفسەرێکی گەنجی تازەکاردا قسە بکات لەبەر ئەوە ئەفسەرەکە ڕازی بوو و گوتی

- بەسەر چاو جەنابی پاشا !

- باشە ، گوێ لەتۆمەتبار بگرە تکایە

ڕەئفەت گوێی لەقسەکانی محسین دەگرت

- دەبێ گوی ڕایەڵی لەفەرمانەکانی ئەفسەری ئێشکگر بکەی ، هەروەها ئەوانە بێنەوە ماڵ تا ناونیشانەکەت فێربن

بەڵام ڕەئفەت دەیەویست محسین لێ حاڵی بکات کەلە باڵەخانەدا هەموویان ئەو بە کوهن دەناسن نەک ڕەئفەت !

- بەڵێ قوربان     ڕاستیەکەی دەرگەوانەکە بەچاکی دەی ناسێ

ئێستا کات بۆ محسین لەزێڕ بەنرخ تر بوو ، بۆیە دەبوا لەماوەیەکی کورت دا هەموو مەسەلەکان یەکلابکاتەوە

لەلای گۆڕەپانی سلێمان پاشاوە ئەفسەرەکەو گەنجەکە و یەکێک لەپیاوانی پۆلیس هاتبوون بۆ دڵنیایی بوون لەشوێنی نیشتەجێ بوونی ڕەئفەت

چەند هەنگاوێک لەپێش ئەوەی بگەنە گۆڕەپانی سلێمان پاشا ، ڕەئفەت سەیارەکەی محسینی بینی ، هەموویان گەشتنە بەر دەرگای بیناکە ، دەرگاکە داخرا بوو ، پۆلیس بەتوندی لەدەرگاکەی دا هەروەک کەسێک کە خاوەنی ماڵ بێ ، دەنگی دەرگاوانەکە بەخەواڵوویی دەبیسترا

- بەڵێ     قوربان

دەرگاکەی کردەوە ، دەرگاوانەکە بالاپۆشێکی کردبۆ بەری و خۆی لەباڵتۆیەک وەرپێچا بوو تا لە شەڕی سەرما پارێزراو بێ ، هەروەها چیتێکی لەسەری هالاند بوو کە بیچمەکەی لەتاریکی دا دەشاردەوە ، ڕەئفەت هەر زوو تێ گەیشت کە ئەو پیاوە دەرگاوانی ڕاستەقینە نیە ، پاسەوانەکە گوتی :

- تۆ کێی ؟

- منم عبدالمحسینی دەرگاوان     خێرە انشاالله     شتێک ڕووی داوە ؟

- ئەو پیاوە دەناسی ؟

- کێ ؟ ڕەئفەت بەگ ؟ حەزرەتی ئاغا خێرە انشاالله

پاسەوانەکە بەتوڕەیی یەوە گوتی

- ئەوە دەناسی ؟

- بەڵێ بەڵێ دەی ناسم ئەوە ئاغای ڕەئفەت بەگە کە لەباڵەخانەی ژمارە ( ٦٢ ) دا دەی گوزمرێنێ

پاسەوانەکە بۆ لای دوو گەنجەکە گەڕایەوەو گوتی

- پێت خۆشە باڵەخانەکە ببینی یان تا ئێرە بەسە ؟

دووگەنجەکە تەماشای یەکتریان دەکرد پاشان یەکێک لەوان گوتی :

- نا ، بەسە

بەم شێوەیە دووگەنجەکەو پۆلیسەکە گەڕانەوە پۆلیس هۆشیاری دا بەدەرگاوانەکە کەلە بەرانبەر شاهیدی یەک کە داویەتی لەبەردەم یاساو حکومەت دا بەرپرسیارە

ڕەئفەت چۆناو بیناکەو بە بالأبەر بۆ دوواهەمین نهۆم سەرکەوت هەرچەند لەبارەی کارێکەوە کە محسین ئەنجامی دابوو کەوتبۆ بیرکردنەوە بەهۆی ئەوە کەلە ماڵی خۆیان نزیک کەوتەوەو ویستی کلیلەکە لەقوفڵەکەدا بادا لەپڕ دەنگێک لەپشت سەریەوە بیسترا

- ڕەئفەت بەتەنێی ؟

گەڕایەوەو دوو کەس لەتارمایی دا ڕاوەستا بوون گوتی :

- تۆ کێی ؟

- تۆ بەتەنێی ؟

- بەڵێ

- فەرموو لەگەڵ ئێمە وەرە محسین بەگ چاوەڕێی تۆیە

ڕێگە چارەیەک جگە لە خۆبەدەستەوەدان لەبەردەمیدا نەمابۆوە یەکێک لەوان جانتاکەی بۆ هەڵگرتبوو ، کاتێ کە ڕەئفەت برا ناو ماڵی تازەی خۆی ( کەلە ناوچەیەکی تزو دوور لەناوەڕاستی شار بوو ) تێ گەیشت کە هەموو بەرگ و پۆشاک و هەرچی پەیوەندی بەمەوە هەیە گوازراوەتەوە بۆ ئەو ماڵە !

**ڕەئفەت** هەروا بەدوای کاری قاچاخی ڕاگوازتنی کاڵای جوولەکانەوە بوو کە دەیانەویست سەرمایەکانی خۆیان لەمیسر وەدەرنێن ، بەزیرەکی و لێهاتوویی دەچۆ ناو ماڵەکانیان بەشێوەیەک کەخۆی وەک قارەمانێکی میللی لەنێو جوولەکەکانی میسردا پیشان دەدا هەموو جوولەکەکان ناوی ئەویان دەزانی لەدەرەوە نوێنەرانی ڕێکخراوە جیاوازەکانی زایۆنی بۆ بەستنی گرێ بەست دەهاتنە لای **ڕەئفەتیش** لەمامەڵەو هەڵسوکەوت لەگەڵیاندا زۆر بەبوێرو ئازا خۆی دەردەخست

ئەو هەموو شتێکی لای **محسین** دەگوت ، **محسینیش** ئەوی لەکارەکانی خۆیدا ئازاد کردبوو تا لەبەرانبەر پۆلیسی میسردا هوشیاری و زیرەکی خۆی ئاشکرا بکات ، لەڕاستی دا ئێستا پۆلیس بەبێ بەزەییانە تاقیبی دەکات چونکە **ڕەئفەت** لەگەڵ سەرمایەدارە گەورەکانی جوولەکە گرێ بەستی بەستبوو و هێندەی نەمابوو کە کاری هەڵگرتن و گواستنەوەکەی تەواو بێ بەڵام پیاوانی پۆلیس قاچاخچیەکانی ئابلۆقەدان و **ڕەئفەتیش** بەشێوەیەکی سەیر هەڵات ، بەم شێوەیە **ڕەئفەت ئەل هەجان** یان هەمان **یاکوب بنیامین** خۆی لە دادگایی کردن قوتار کرد هەرچەندە کە ئێستاش بەناوی **لیوی کوهن** ژیان بەسەر دەبات

ئەو لە سەودایەکی تردا کەوتە بۆسەوە ، نەی توانی هەڵێت و گرتیان ، بەڵام چونکە نەیان توانی تۆمەتەکەی بەسەر دا ساغ بکەنەوەو لەلایەکی تریش بریکارە لێزان و جامبازەکەی ا کە جوولەکەیەکی سەرمایەدار بوو ا توانی قوتاری بکات ، بەم بارو دۆخە دژاوەرەوە دوور نەبوو کە جوولەکەکان قارەمانێک لەقارەمانەکانی خۆیان بەجێ بێڵن ، بەتایبەتی لەدوای ئەوە کە پۆلیس شوێنی نیشتەجێ بوونە تازەکەی هەڵنابوو و بەتوندی خرابۆ ژێر چاودێریەوە ، جوولەکەکان لێ نەدەگەڕان ئەو هەروا لەبن دەستی پۆلیس دا بمێنێتەوە

خەسڵەتە ڕەسەنەکانی **ڕەئفەت** وایان کردبوو کە هەر کەس لەبەر خۆیەوە دەی بردەوە ماڵ و لەسەر میوانداریەکەی لێیان دەبوو بەمشتومڕ و دەمەقاڵەو یەکتریان دەبوغزاند ، بەتایبەتی ئەو ماڵانەی کە دەستیان دەڕۆیشت و دەیانەویست مڵک و ماڵی خۆیان لەڕێگەی ئەوەوە لەمیسر وەدەرنێن

گەنجەکە بوو بەئەندامێکی دانەبڕاوی کۆمەڵگای جوولەکە ، ئەو بەناخی نەریت و کلتوری ئەو کۆمەڵگایەدا ڕۆچووبۆ خوار ، لەنێو ماڵ و کۆشکە ڕازاوەکانی ئەوان دا

ژیانی بەسەر دەبرد بەهۆی هەوڵ و کۆششی خۆی زمانی عیبریش فێر بوو ئەو لەبەردەم جوولەکە بەکرێ گیراوە پەرش و بڵاوەکاندا نەفرەتی لە تیرەی جوولەکەکان دەکرد ئەوانەی کە بوو بوونە مایەی ئەوەی کە جوولەکەکان زمانی بێگانە فێربن و زمانی زگماکی باب و باپیرانیان لەبیر بکەن لەو ڕۆژگارەدا ژیانی گەنجەکە پڕ بوو لەڕوداو و بەسەرهاتی سەیرو سەمەرە لەدیدی **محسین ممتازیشدا** کەسێکی بەختەوەر بوو چونکە **ڕەئفەت** گەیشتبۆ ئاستێك کە نوێنەرانی ڕێکخراوی جوولەکەکان خوازیاری ئەوە بوون کە دیداریان لەگەڵدا بکات ، **ڕەئفەتیش** لەبەرگی دۆستێکدا ڕۆڵی پیلان گێڕیەکەی دەبینی

لەپێش ئەوەی کە سێ مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٥٥ تەواو بێ ، دەرکەوت کە حکومەتی میسر بەتوندی نەیارە لەگەڵ کۆچکردنی ئەو بۆ دەرەوە ، ئێستا هەموو ڕێکخراوەکانی جوولەکە هەوڵ دەدەن تا **یاکوب بنیامین حنانیا** لەمیسر وەدەرنێن ، ئەو دۆخە درێژەی کێشا تا بەهاری هەمان ساڵ

* * *

هەموو ئەو نامە بانگهێشتانەی کە بەدەستی دەگەیشتن ، بانگهێشتێکیشی لە لایەن یەکێك لە ملیۆنێرەکانی ئەسکەندەریە ( **شارل سمحون** ) پێ گەیشت ، **شارل سمحون** یەکێك بوو لە پیاوە ناسراوە بازرگانیەکان کەماوەیەکی زۆر بوو دەستەڵاتیان بەسەر بازاڕی بورسەی ( کڕین و فرۆشتنی دراوی بەنرخ ) ی ئەسکەندەریە دا هەبووە ، ئەو پیاوێکی دەوڵەمەند بوو کە خەڵکی بەسەر سورمانەوە باسیان دەکرد ، لەبەر ئەوە بۆ **ڕەئفەت** ئاسان نەبوو کە بانگهێشتەکەی قبوڵ نەکات هەرچەندە ئاکاری وابوو کە ئەو بانگێشتانەی کەبە دڵی نەبن قبوڵی نەدەکرد بەتایبەتی ئەو ماڵە سەرمایەدارانەی قاهیرە کە داڵدەی دابوون ئاشکرا دەبوون

لەتاریکی شەودا بەهۆی ئەو دەمەقاڵەو چەنە بازیەی کە سەرنجی پۆلیسیان بۆ لای خۆی ڕادەکێشا ، **ڕەئفەت** توانی لەحەشارگەکەی هەڵی ئەو بەتەنێ کەوتەڕێ و تکۆڵی دەکرد لەوە کە هیچ جوولەکەیەك بتوانێ بۆ پارێزگاری و پەردە پۆشیەکەی لەگەڵیدا بڕوات ، دەی گوت ئەگەر بەتەنێ بم سەربەست ترم

کاتی بۆ یەکەمین جار چۆ ناو کۆشکی خاوەن شکۆ **شارڵ سمحون** ( کۆشکێک لەبەرزایی تەپۆلکەیەکی پیرۆز لەسەر دەریای مدێترانە ) ، خێزانی **سمحون** لێی ئالأبوون و لەدەوری دەگەڕان ، خزمەت چیانی ماڵەوەش لەخزمەتی دا ڕاوەستابوون .

**ڕەئفەت** لەکۆشکی **سمحون** ژیانێکی ئەفسانەیی هەبوو ، چەند هەفتەیەک بوو کە کەوتبۆ ناو ژیانێکی خۆشگوزەران و ئاسودە ، ئەو هەموو شەوان لەماڵ دەهاتە دەرو چاوی بە **محسین** دەکەوت چاوپێ کەوتنەکانیان ئاڵۆزو بەربڵاو بوون و جگەلە چەند خولەکێکی دیاری کراویش مۆڵەتی قسەو باسیان نەبوو ، شەوێک خزمەت کاران زووتر ماڵیان بەجێ هێشت ئەوانیش ئێوارە خوانێکی سادەیان خواردو گوێیان لەمۆسیقا گرت.

لەپێش ئەوەی کە کوڕی بیستنی مۆسیقا دەست پێ بکات ، خاوەن شکۆ **شارڵ** داوای **لەڕەئفەت** کرد تا بچێتە ژووری خوێندنەوە ، **شارڵ سمحون** ملیۆنێری جوولەکە سروشتی وابوو کە ڕۆژی یەک جار جگەرەی دەکێشا ، ئەو لەدوای نانی ئێوارە لەگەڵ خێزانەکەی چوونە نوسینگە تا جگەرە بکێشێ ، پاشان لەتەنیایی دا خۆی بەخوێندنەوەوە دەخافڵاند یا بەحیسابەکانیدا دەچۆوەو لەژوورەکەی خۆیدا تا سەعات ١٠ ی شەو دەمایەوە ، پاشان دەچۆ ژووری خەوتن ، لەکاتێکدا کە **ڕەئفەت** لەناو پۆلیسی میسر پەنای بۆ کۆشکی **شارڵ سمحون** هێنابوو ، هەندێک جار **شارڵ سمحون** میوانەکانی خۆی بۆ قسەکردن و جگەرە کێشان بانگ دەکردە ژوورەکەی ئەو ئەوەش لەبەر چاوی بنەماڵەکەی و خەڵکی تردا جۆرە ڕێز لێ نانێک بوو کەلە **یاکوب بنیامین حنانیای** دەنا

**ڕەئفەت** هەستی دەکرد کە ئەو پیاوە ٦٠ ساڵەیە بەچاوێکی سەیر لێی دەڕوانێ ، بەڵام ئەو لەهەمان کاتدا ئارام و بێ دەنگ بوو و لەزوربەی ئەندامانی خێزانەکەی لێزان ترو بەبەزەیی تر بوو ، **ڕەئفەتیش** لەبەر ئەو هەموو لەڕادەبەدەریەی بانگێهشتی ژووری خوێندنەوەی کرد ، ئەو شەوە **ڕەئفەت** لەسەر قەنەفە بایەخدارەکە لە بەرانبەر مێزی **شارڵ** دانیشتبوو و بەسەر سامیەوە تەماشای پیاوەکەی دەکرد ، پیرەمێردەکە کەمێک بە شڵەژاوو نیگەران دەهاتە بەرچاو جگەرەکەی داگیرساندو وەک ئەوەی کە بیەوێ بەسەر گرژبوونی ماسولکەکانی خۆیدا زاڵ بێ ، **ڕەئفەت** هەستی دەکرد کە شتێک هەیە پەیوەندی بەمەوە هەیە بەڵام متەقی لێوە نەهات ، هەتا کە بەزمانی فەڕەنسی **لەڕەئفەتی** پرسی : لەداهاتوودا دەتەوێ چ بکەی ؟

ڕەئفەت لەشوێنی خۆی ڕێک دانیشت و گوتی

- هیچ ڕێگەیەکم لەبەردەم دا نەماوەتەوە جگە لە وەی کەدەبێ کۆچ بکەم بۆ ئیسرائیل

پیرەمێردەکە بێ وچان سیلە چاوێکی تێ دەبڕی پاشان ڕەئفەت گەڕایەوەو درێژەی پێدا

- ژیان لەمیسردا بۆ من مەحاڵە ، ئەوان هەمیشە تاقیباتم دەکەن و هەڵم دەنێن ، دڵنیام کە دەزانن ئێستا ناوی ڕاستەقینەی من یاکوب بنیامین حنانیایە ، هەموو هەوڵ و جووڵەیەکم خراوەتە ژێر چاودێریەوەو ئێستا من بوومەتە بار بەسەر ئێوەوە

لەگەڵ ئەوەدا کە ڕەئفەت بەقسەی کۆتایی خۆی ویستی هەستی ئەو بوروژێنێ بەڵام هیچ نیشانەیەک لەڕوخساری پیرەمێردە جوولەکەکەدا دەرنەکەوت .

پیرەمێردەکە دوبارە پرسیاری کردەوە

- ئێستا ، بزانم چۆن کۆچ دەکەی ؟

ئەوە هەمان ئەو شتەیە کە هەوڵ دەدەم لەمەودوا ڕێگە چارەیەکی بۆ بدۆزمەوە

- من هۆکارەکەم دۆزیوەتەوە

ڕەئفەت جێگەکەی گۆڕی ، قسەکەی شارڵ سمحونی زۆر بەلاوە کت و پڕ بوو.

پیرەمێردەکە وای لێک دەدایەوە کە گەنجەکە زۆر دڵخۆش بێ ، بەڵام لەڕاستی دا بە پێچەوانەوە بوو ، لەیەک سات دا قسەکانی محسینی بیرکەوتەوە ، شەوێک لە محسینی پرسی لەکەیەوە مۆڵەتی کۆچ کردنیان بۆ ئسرائیل پێ داوی ؟ محسین داوای لێ کرد تا پەلە نەکات چونکە خودی جوولەکەکان ئەو کارە دەکەن و کاتێ کە ئەوانیش ئەو کارە بکەن ئەوە بەرژەوەندی محسین لەنیشتمانی تازەدا دەبێ

ڕەئفەت لەکاتێکدا کە بەسەر پیرەمێردە سەرمایەدارەکەدا دەچەمایەوە گوتی:

- توخوا چۆن ئەو ڕێگەیەت دۆزیەوە ؟

پیرەمێرد چرە دوکەڵی جگەرەی لەبۆشایی ژوورەکەدا بەرەڵاکرد پاشان هەستا پێ و بۆ لای پەنجەرەی ژوورەکە چوو کە ڕووەو دەریا دەکرایەوە ، ڕەئفەت بێ دەنگی هەڵبژاردو پیرەمێردەکەی خستە ژێر سەرنج و ڕامانەوە هەروەک ئەوەی کە بیەوێ نهێنی یەک بدرکێنێ ، بێ دەنگی بۆشایی ژوورەکەی داگرت ، تەنها دەنگی شەپۆلەکان

بوون بەرگوێ دەکەوتن پیرەمێرد دەست بەجی و بەبی ئەوەی ئاوڕ لە **ڕەئفەت** بداتەوە گوتی

- من کوڕێکی هاو تەمەنی تۆم هەبوو ، ناوی **دوید** بوو

**ڕەئفەت** جگەرەکەی توڕدا ، بەپێوە زەرد هەڵگەڕا گەرمایی لەلەشی بڕا پیرەمێردەکە ئاوڕی داوە ئەو دیمەنەی بەخەفەتبار دەهاتە بەرچاو

کەمێک لەپەنجەرەکە دوور کەوتەوە لێی زیاد کرد :

- کاتێ لەدایک بوو بەڵگەنامەی لەدایک بوونم بۆ وەرگرت بەڵام لە تەمەنی ٨ ساڵی دا مردو منیش بەڵگەنامەی مردنم بۆ دەرنەهێنا

**ڕەئفەت** هەوڵی دەدا شتێک بڵێ بەڵام لەبەر سامناکی چیرۆکەکە زمانی گیرا ، پیرەمێردەکە دیسان درێژەی پێدا

- **دوید** بەنەخۆشی گرانەتا ٢٤ ساڵ لەمەوبەر مرد بەڵام لە ڕوانگەی حکومەتی میسر ئەو هێشتا زیندووەو لەژیان دا ، ئێستا **ڕەئفەت** بە وردی لەقسەکانی پیرەمێردەکە حاڵی بوو

- ناوی منداڵەکەم بەناوی تۆوە کرد لەسبەینێوە ناوی تۆ **دوید شارڵ سمحون** دەبی بەڵام ئێمە ڕێگەت پێ نادەین بۆ کۆچ کردنت بۆ ئیسرائیل بەڵکو دەبێ بچیە دەرەوەی وڵات ، بەڵام ئەگەر لەمیسر دەرچووی لەدەرەتان دابە ، گەنجەکە بەبەزەیی یەوە گوتی :

- بەڵام ئەوان دەیانەوێت بزانن کە من چوومە دەرەوە ئەو کاتە تۆ چ دەکەی ؟

- پەیوەندیەکی بە تۆوە نیە ئەو کارە بە من بسپێرە

**میرزا شارڵ** ئەوەی گوت و بۆ لای کورسیەکەی خۆی گەڕایەوە قومێکی خواردەوەو دەستی بۆ لای کتێبێک درێژ کرد کە لەسەر مێزەکە دانرا بوو ، لەکاتێکدا کە کتێبەکەی لێک دەکردەوە گوتی ئێستا دەتوانیت بڕۆیت !

**ڕەئفەت** لەکاتێکدا کە ژوورەکەی بەجێ دەهێشت هێندەی نەمابوو لەتاوان بتەقێتەوە ، ئەو لەو ساتەدا جگەلە دیتنی **محسین ممتاز** ، ئارەزویەکی تری لەو دنیایەدا نەبوو

# بەشی یازدەهەم

## کۆچ

گەنجەکە لەو شەوەدا تێ گەیی کەلە چەند ڕۆژێک زیاتری نەماوە لەمیسرو سەفەرکردنی بۆ ئیسرائیل بەویستی خۆی نیە ، تا زە ئەو ناچارە کە لەگەڵ جوولەکەکان مەدار بکات تا هیچ گومان و دڵەڕاوکێ یەک بەرپا نەبێ

**ڕەئفەت** لەدوای ئەوەی کە نوسینگەی **شارل سمحونی** بەجێ هێشت کەوتەوە بیری خوشکی **شەریفە** ، پێویست بوو تا بەهەر شێوەیەک بێ خوا حافیزی لێ بکات

محسین داوای لێ کرد تا دیداری خوشکەکەی دوابخات تا ئەو کاتەی کەبە خەیاڵی ئارام و ئاسودەوە دەچێتەوە سۆراخی ، بەدرێژایی ئەو هەموو مانگە **شەریفەی** لەیاد نەکردو شێوەکەی وەک تارمایی یەک بەرچاوی بەرنەدەدا هەرچەندە هەست کردن بەو بەرپرسیارێتی یەی کە پێی سپێردرا بوو بەناخیدا چوو بۆ خوارێ

**ڕەئفەت** چوو بۆ ژووری خەوتنی خۆی ، ساتێک لەپشت پەنجەرەوە وەستا ، تەماشای دەریای دەکردو گوێی بۆ شڵپ و هوڕی شەپۆلەکان هەڵ خستبوو لەمەوبەر هەر کاتێ کە میسری بەجێ دەهێشت دەی زانی کە بیەوێ و نەیەوێ ڕۆژێک دەبێ هەر بۆ وڵات بگەڕێتەوە بەڵام ئەو جارەیان پرسیاری لەخۆی دەکرد دەبێ ڕۆژێک بگەڕێمەوە ؟ قەت دەگەڕێمەوە یان پەتی سێدارە بەشم دەبێ ؟

سەر لەبەیانی ئەو ڕۆژە **ڕەئفەت** زۆر حەزی دەکرد لەپەنا مێزی نان خواردن دا لەگەڵ **میرزا شارڵ سمحون** دا دیدارو گفت و گۆ بکات ، دەبێ لەگەڵ **شارل سمحون** سەبارەت بەبابەتی جۆراو جۆر کە هێشتا نەهاتبنە بەرباس و لێکۆڵینەوە دیدارو گفت و گۆ بکەن ، شوێنەواری ڕامان و خەفەت لەسەر دەم و چاوی **ڕەئفەت** نەخشی بەستبوو ، پیرەمێردەکە دەی زانی کە دڵی گەنجەکە کەچی تێدایەو دەیەوێ بڵێ چی ، پاشان داوای لەهاوەڵ سەفەرەکەی کرد کە بەشۆفێرەکە بڵێ سەیارەکەی بۆ ئامادە بکات ، هاوسەری **شارل سمحون** دڵنیا بوو کە ئەوان قسەی تایبەتی و نهێنیان هەیە ، بۆیە دەست بەجێ شوێنەکەی بۆ بەجێ هێشتن ، **ڕەئفەت** سەری بەرز کردەوە و ڕووی لە

**شارڵ سمحون** کرد ،**سمحونیش** بە چاوە تیژو چەق بەستووەکانی خۆی تەماشای دەکرد ، **ڕەئفەت** بەهێواشی گوتی

- ئەوە هەمان ئەو شتەیە کەلە تۆم چاوەڕوان دەکرد

**ڕەئفەت** قومێکی لەچایەکەی داو گوتی

وای بۆ دەچم کەناچار بم بۆ ئەنجامی هەندێک لەپاشماوەی کارەکانم بچمە قاهیرە

پیرەمێردەکە لەکاتێکدا کە ئاوڕی دەدایەوە دەستی لەخواردن هەڵ گرت و بی دەنگیش بۆ چەند ساتێک باڵی کێشا ، پاشان گوتی

- ئەوەیان بەباشی دەزانم

وەلامی پیرەمێرد بۆ ڕەئفەت لەڕاستی دا بەس نەبوو بەلام بیٚ دەنگی هەڵبژارد تا ئەوەی کە پیرەمێردەکە درێژەی پێدا

- وا هەست ناکەم کە پێویست بەوە بکات ئامۆژگاریت بکەم

- لە چی ؟

- پێویستە هیچ کەس ئەو باسەی دوێنیٚ شەویٚ نەزانیٚ

پاشان **شارڵ سمحون** بەسەریدا چەمایەوەو بەهێواشی پێی گوت :

- هەتا هیچ جم و جوٚڵێکیش نابیٚ بزانن

پاشان پیرەمێردەکە درێژەی پێدا :

- من هەتا بەخێزانی خۆشمی ناڵێم تا دەگەیە شوێنی ئارام لە ئیسرائیل

**ڕەئفەت** وەبیر خۆی هێنایەوە

- زیاتر لەهەفتەیەک لە قاهیرەدا نامێنمەوە

- چوار وێنەم بۆ وەرگرتنی پاسپۆرتەکەم دەویٚ

**ڕەئفەت** پێکەنی و لەکاتێکدا کە دەستی لەگیرفانی خۆی ڕادەکرد گوتی

- لەو شێوەیە هەندێک وێنەم هەیە ، ئومێدەوارم بەخت یاوەرت بیٚ

* * *

**ڕەئفەت** هەواڵەکانی بۆ **محسین** دەگوازتەوە و **محسنیش** لەو پەڕی بی دەنگی دا گوێی لێ دەگرت ، **محسین ممتاز** زۆر خۆشحاڵ بوو چونکە پیلانەکەی بەزوترین کات سەری گرت بەشێوەیەک کەبە خەیاڵیشی دا نەدەهات

دەیەویست مۆڵەت بەخۆی بدات تا خۆی بۆ ئامادە بکات و هزری یەک ڕێ بکات

دوای ئەوە کە قسەکانیان تەواوکرد **محسین** پێی گوت

- نیازت وانیە **شەریفە** ببینی ؟

دڵی **ڕەئفەت** بەسەختی کەوتە ترپە بەڵام ڕاستگۆیانە گوتی

- من لەو دیدارە دەترسم

- مەحاڵە پێش ئەوەی کە ئەو ببینی سەفەر بکەی

- دەزانم

- پێویستە کە دیاریەک لەگەڵ خۆت دا بۆ تاریق ببەی

**ڕەئفەت** بێ دەنگ بوو ، پاشان **محسین** پرسیاری کرد

- بۆ بێ دەنگی ؟

- نازانم چی بڵێم

- پێی بڵێ کەلە وڵاتێکی عەرەبی کارێکم دۆزیوەتەوە

- جگە لە مامۆستایان کەس بۆ وڵاتە عەرەبی یەکان ناچێ !

- کێ وادەڵێ ؟

- هەموو دنیا ئەوە دەزانێ

- وڵاتە عەرەبیەکان نەوتیان هەیەو تۆش تایەبتمەندیت هەیە لە کۆمپانیا نەوتیەکاندا

**محسین** دەستی بۆ گیرفانی بردەوەو کیسە باخەڵەکەی دەرێناو گوتی

- من نەم ژماردووە ئەو ٥٠ لیرە میسری یە بالە حیسابەکەدا بێ تا بۆ **تاریق** و خوشکت دیاریەک بکڕی

پارەکەی لەبەردەم گەنجەکە داناو لەکاتێکدا کە هەڵدەستا گوتی :

- پێویست ناکات لەو کاتەدا جگەلە **شەریفە** کەسێکی تر تۆ ببینێ ، سبەینێ بەیانی زەنگی بۆ لێدەو پاشان لەپێش ئەودا بڕۆ بەڵام لەوێ زۆر ڕانەوەستیت .

ڕەئفەت لا بەلا چاوی بڕیە ٥٠ لیرەکە پارە لای ئەو پووچ و بێ بایەخ بوو ساتێك بیری کردەوە کاتێ مرۆڤ لەئامانجی باشترو بایەخ دارتر خۆی نزیك دەخاتەوە پارە چەند بچوك و بێ بایەخ دەبێتەوە

دەنگی شەریفە لەو لاوە هاتە بەرگوێ

- ڕەئفەت !

- چۆنی شەریفە

- تۆ لەکوێی ؟ !

- من !

- ئەو ماوەیە لەکوێ بووی ؟

- ڕاستیەکەت دەوێ من کار

- لەکوێوە قسە دەکەی ؟

- لەشەقامی قص

- منت دڵتەنگ کرد

- شتێکی سەیری

- واتە بێ ئاگام ؟

- باشە ، دەمەوێ قسە بکەم

دەنگی شەریفە نووساو لەکاتێکدا کەبە دەنگی بەرز دەگریا گوتی

- باشە بۆ نایەیتەوە ؟ منت ترساند

- ساتێك ئارام بگرە ، دێمەوە لات .

دەسکی تەلەفۆنەکەی فڕێ داو ڕای کرد پێش ئەوەی کەس فرمێسکەکانی ببینێ

ئێستا تاکسی ڕووەو ماڵی شەریفە کەوتۆتە ڕێ جانتایەکی پڕ لەیاری منداڵانەی بۆ تاریق و دەستە جلکێکیشی بۆ شەریفەی خوشکی پێ یە

جارێك کە بچکۆلانە دەبێ دەیەوێ لەگەڵ خوشکەکەی یاری بکات ، لەپڕدا شەریفە زللەیەکی قایمی تێ دەسرەوێنێ و ئەویش پێ دەکەنێ و دەستی خوشکەکەی ماچ دەکات ، جارێکی تر لەدوای مردنی دایکی هاتەوە یادی کە خوشکەکەی لەو بچوکتر

بوو و بەبێ ئەوەی کەهەست بە مردنی دایکی بکات دەی قیژاندو چەنگی لەدەم و چاوی ڕەئفەت گیر دەکرد و دەی گوت دایە دایە

بیرەوەریەکان بردیانەوە سەردەمی ڕابردوو ، کاتێ هاتەوە هۆش خۆی دیتی وا تاکسیەکەی لەبەردەم باڵەخانەی خوشکی ڕاوەستاوە کرێیەکەی دا بەشۆفێرەکەو داوای لێ کرد چاوەڕێی بکات سەیارەکەی بەجێ هێشت ، سەری بەرز کردەوە شەریفەی بە هەراسانی دیت کە لەسەرەوە تەماشای دەکات و دەستی بۆ ڕادەوەشێنی لەکاتێکدا کە دیاریەکانی لەگەڵ خۆی بردبوون قادرمەکانی دوو پلیکان دوو پلیکان دەبڕی ،شەریفە لەپێشوازیدا ڕاوەستا بوو و لەخۆشیان هەڵ دەلەرزی بۆنی دایک و بابی لێ دەکرد ، تاریق لەخۆشیان خەنی بوو بوو و هاواری دەکرد

خاڵە خاڵە !

شەریفە لە ساڵۆنەکەی دای نیشاند و لەپەنای دانیشت ، بەپرسیاران گێژی کرد هەتا بواری وەلاَت دانەوەشی نەدەدا ، ئینجا بۆ لای چێشتخانەکە ڕای کرد و یەک دۆلکە ئاوی ساردی بۆ هێنا ، ڕەئفەت دەستی بۆ لای دۆلکەکە درێژ کرد تا گەروە وشکە هەلاَتووەکەی تەڕ بکات ، لەتاوان خولْقی خواردنی نەکرد ، لەکاتێکدا کەخۆی لەدەست دووچاوە شەڕەنگێزەکانی خوشکەکەی قوتار دەکرد ، خوشکەکەی گوتی

- پێم بڵێ لەکوێ بووی ، لەو ماوەیەدا چیت دەکرد ، ئێستا لەکوێی ، لەڕاستی دا باس و خواس چیە ؟ ئەوەیان قەیدی ناکات بەلاَم چۆن ئەو هەموو ماوە دوورو درێژە ون بووی بەبێ ئەوەی کە زەنگێکم بۆ لێ دەی یان نامەیەک بنێری ؟

ویستی قسەیەک بکات بەلاَم خوشکەکەی دەستی پێ کردەوە گوایە شتێک وەبیر خۆی دێنێتەوە

- ئەو کێشەی پلیتی فڕۆکە کە لەئەڵمانیا داوات کرد چی بوو ؟

ویستی وەلاَم بداتەوە بەلاَم خوشکەکەی لەکاتێکدا کە گریان بەربینگی گرتبوو فرمێسکی هەڵدەڕشت و دەی قیژاند

- چی تۆی ناردە ئەڵمانیا ؟ !

متەقی لێوە نەهات ، تەنها بێ دەنگی هەڵبژارد فرمێسکەکانی سڕی و لەنێو قیژە قیژی تاریق کەبە یاریەوە سەر گەرم بوو ، خوشکەکەی دووبارە پرسیەوە

- چۆنیت ڕەئفەت ؟

ویستی وەڵام بداتەوە بەڵام نەی توانی ویستی شتێک بڵی بەڵام هیچی پێ نەبوو

- بۆچی بێ دەنگی ؟

- ناتوانم پێت بڵێم کە چەندە تامەزرۆی دیتنەوەت بووم

ئەوەی گوت و فرمێسک بەچاوەکانیدا هاتە خوار لیکی زاری بەزەحمەت بۆ قوت دەدرا ، لەبەر خۆیەوە دەی پرسی دەبێ **شەریفە** لەمەودوا چ بکات ؟

**شەریفە** لەنێو ئاوێتە بوونی گریان و فرمێسکدا درکاندی :

- **ڕەئفەت** من جگە لەتۆ کەسی ترم نیە

- منیش کەسم نیە

- ئەدی بۆچی لەبەر خاتری خوا لە لای من نامێنیەوەو ئۆقرەو ئاسوودەیی بۆ گیان و دڵم ناگەڕێنیتەوە ؟

- تەواو بوو خوا کارەکانی ڕاستە ڕێ کرد ، ئەوەی گوت و باسی کارە تازەکەی بۆ کرد کە چونکە یەکێک لە ئەندازیارانی نەوتی ئەمریکایی کە لە دەریای سووردا هاوکاری دەکردم و ئێستا گوازراوەتەوە بۆ یەکێک لە وڵاتە عەرەبی یەکان ، داوای لێ کردوم لەگەڵیدا بڕۆم ، دیسان درێژەی پێدا ئێستاش کۆمپانیاکە لەبواری خۆڕێکخستن دایە ، ئەو ناوچانەش کە کاری تێدا دەکەن دیاری کراو نین و دەبێ بۆ دۆزینەوەی نەوت بیابانی وشک بکەنە مەڵبەندی توێژینەوە ، بەڵام داهاتەکەی زۆر باشە

- واتە ناتوانم نامەت بۆ بنێرم ؟

- هەر کاتێ دەرفەتم بوو نامەت بۆ دەنوسم

- **شەریفە** ! ڕابردوو تێ پەڕی ، هەرچی ڕووی داوە تازە ناگەڕێتەوە

پاشان متمانەی دا بەخۆشکی کە تەنها دوو ساڵی تر لێی دوور دەبێ و هەر کاتێ پارەو پوولێکی باشی پێکەوە نا ئەوە هەتا هەتایە لای ئەو دەبێ .

- واتە تۆ دەبێ دوبارە سەفەربکەیەوە ؟

- هەفتەی داهاتوو خوا حەز بکات !

**شەریفە** چاوێکی قوڵی تێ بڕی و بە وردی لەفەلاڧەتی ڕوانی و لەبەر خۆیەوە کەوتە بیرکردنەوە ئەوجار دەبێ چەند لەدیتنی براکەم بێ بەش بم

- واتە دوو ساڵ تۆ نابینمەوە ؟

- نەو     دیارە مۆڵەتەکەم وایە

- **ڕەئفەت** !

- بەڵی **شەریفە**

- چیم لێ دەشاریەوە ؟

بەڵام ئەو پێکەنی و خۆی بەکەل و پەلی **تاریقەوە** خافڵاند   کاتی هاتنی شووبراکەی نزیک دەبۆوە بۆیە هەستا بڕوات ، کاتێ کە قاڵدرمەکانی دەبڕی دەنگی **شەریفەی** بیست

- بەخێر چی **ڕەئفەت** !

- ساغ و سەلامەت بی !

- ئاگات لەخۆت بێ !

- خوا هەمووومان بپارێزێ بەویستی خوا

- هەردەم لەسەلامەتی خۆت ئاگادارم کەرەوە !

- بەسەر چاو **شەریفە** !

- **ڕەئفەت** لەکاتێکدا کە دوا پلیکانی دەبڕی ، دەنگی **شەریفە** ڕای چڵەکاند ، سەری بەرزکردەوەو ئاوڕێکی لێ داوە ، هەردووک چاویان تێک بڕی

- خوات لەگەڵ برام

پاشان بەخێرایی بۆ لای سەیارەکە ڕای کرد کە هێشتا چاوەڕوانی دەکردو بەچاوێکی پڕ لە فرمێسکەوە بەجێی هێشت

*      *      *

**محسین ممتاز** لەگەڵ سەرۆک و هاوکاری خۆی **حسن سفر** لەو شەوەدا تا بەیانی نەخەوتن ، لەپێش باس و توێژینەوەی کارەکە بەپێی بنەما سەرەتایی یەکان **محسین ممتاز** لە نوسینگەی **حسن سفردا** بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵ کەسێکدا کرد بەناوی **عبدالرحمن** لە شاری ئەسکەندەریە   ئەو یەکێک بوو لەکار بەدەستانی فەرمانگەی پاسپۆرت و مانەوە ، **محسین** داوای لێ کرد کە بەرپەرچێک لەڕێگەی

دەرچوونی پاسپۆرتی کەسێکی جوولەکە بەناوی دوید **شارڵ سمحون** دا نەنی و کارەکەی دەست بەجێ بۆ ڕاپەڕێنی هەڵبەتە بەپێی یاسای کارەکە

هێندەی نەبرد کە ڕەئفەت لە هەموو ئاوان پەڕیەوە شێوازی نوسین و جیاوازی خەتەکان ، ڕێگەکانی پەیوەندی بە بروسکە یان لەڕێگەی نامەوە ، ڕەچاوکردنی شێوازەکانی پەیوەندی لە شارەکانی ئەوروپادا ، بەڵام دەبوو **ڕەئفەت** لەپێش هەموو شتێک و لەپێش ئەوەش کە سەفەر بکات دەبوا چاوی بەکەسێک کەوتبا بەناوی **مصطفی عبدالعظیم**

ئەوان باسەکەیان لەهەموو گۆشەو کەنارێکەوە توێژیەوەو بیرو ڕایان لەسەر ئاڵ و گۆڕ کرد ، ئاراستەی گفت و گۆکانیان زیاتر پەردە پۆش کردنی **ڕەئفەت** بوو لە ئیسرائیل دا کە بتوانێ لەپەنا وان دا لە ( **تەل ئەبیب** ) **بیگوزەرێنێ** ، مەسەلەی گرنگ ئەوەبوو کە دەبوا **ڕەئفەت** لە ئیسرائیل دا کارێک بدۆزێتەوەو زۆر بە ئاسایی ژیان بەسەر بەرێت

ئەوان کارکردنی **ڕەئفەتیان** لەسینەمادا بەمەحاڵ دەزانی چونکە لەو سەردەمەدا پیشەسازی سینەما لە ئیسرائیل دا نەبوو هەروەها کارکردنیشی لە کۆمپانیا نەوتیەکاندا مەحاڵ بوو چونکە فەلەستینی داگیرکراو لەنەوت بێ بەش بوو ، تەنها دووکار لەبەردەمی دا مابوو گەشت و گوزارو بازرگانی ، بۆ وان گونجاوترین پەردەپۆشی کارە گەشت و گوزاریەکان بوون چونکە سروشتی کارەکە وابوو هەرکاتێ ویستبایان دەیان توانی ئیسرائیل بەجێ بێڵن و پەیوەندی پێوەکردنیشیان لە لایەن خەڵکی تر جێگای گومان نەبوو ، هەروەها ڕێگە لەبەردەمی دا واڵا دەبوو تا لەگەڵ گروپە گەشت و گوزاریەکانی تر بەتەنیا سەفەر بکات ، ئەوەش دەرفەتێکی زێڕین بوو تا لەهەموو ڕوویەکەوە زانیاری کۆبکاتەوە

ئەو کارە بەبیرو بۆچوونی وان گونجاو ترین ڕێگە بوو بۆ **ڕەئفەت ئەل هەجان** یان **دوید شارڵ سمحون** ، بەڵام پیشەسازی گەشت و گوزار پێویستی بەسەرمایەیەکی زۆر هەبوو بەڵام **ڕەئفەت** کوا دەی توانی ئەو بڕە پارەیە دابین بکات ؟ لەکاتێکدا کە ڕۆژگار بەخێرایی تێ دەپەڕی و ئەوانیش کاتی زۆریان لەبەردەست دانەبوو بۆ کەڵەکە کردنی سەرمایە لەبەر سەفەری ئیسرائیل

جفرەیەکیان ( خشتەی نهێنی ) دانابوو بۆ لێکدانەوەی وشە ڕەمزیەکان بۆنموونە ئەگەر بەم مەبەستە بروسکەیەکیان بۆ **ڕەئفەت** لێ دابا کە لەسەعات ٦ ی دوای نیوەڕۆی ڕۆژی ٢٨ لە ڕۆم چاومان پێت بکەوێ دەبا وای لێک داباوە لەجیاتی ڕۆم پاریس و لەجیاتی سەعات ٦ ، سەعات ٤ ی دوای نیوەڕۆ و لەجیاتی ٢٨ ڕۆژی ٣٠ ی هەڵبژاردبا ، ڕەئفەت دەبا ڕاپۆرتەکانی خۆی لەسەر کاغەزێکی چەور نوسیباو کاغەزێکی سپی لەژێر دانابا تا ئەو مادده چەورە بەکاغەزە سپی یەکەوە نوسابا بەبێ ئەوەی کە نوسینەکە دیار بکرێ ، مەسەلەیەکی گرنگ کە ڕێکخراوی ئاسایش لەسەری کۆک بوو ئەوە بوو کە گەنجەکە دەبا لە قۆناغی یەکەمی سەفەر کردنەکەی زۆر بەنهێنی و خۆ حەشاردان خۆی حاواند باوەو خۆی لەهەر جم و جوڵێک دوور خستباوە **ڕەئفەت** دەبوا کۆمەڵگای ئیسرائیلی و خەڵکەکەی باش ناسیباو خۆی خزاندبا نێو ئاپۆڕەو مامەڵەی خەڵکەوەو خۆی بەکڕین و فرۆشتنەوە خافڵاندبا

*　　*　　*

کاتێ کە **محسین** لەکاتی دیاری کراودا لەپشت دەرگاوە دەرکەوت تەنها نەبوو **ڕەئفەت** کەمێک حەپەسا ، ئەو لەگەڵ **محسین** و میوانەکانی تۆقەی کرد ، پاشان **محسین** لە **ڕەئفەتی** پرسی

- چوویە لای **شەریفە** ؟
- ئەی خۆزگە نەچووبام
- حەتمەن زۆر ماندوو بووی ؟
- هەتا ئێستاش هەر ماندووم

**ڕەئفەت** تێ گەیشت ئەو پیاوەی کە لەگەڵ **محسین** دا هاتووە هەموو شتێک دەزانێ ، باریکەڵەو ڕووخۆش بوو ، سمێڵێکی باریکی هێشتبۆوە و زیاتر لەسەرمایەدارە هیندی یەکان دەچوو تا میسری یەکێ ڕوخسارێکی کراوەو دەم بە خەندەی هەبوو ، زۆر پۆشتەو پەرداخ بوو

گەنجەکە پرسی

- شتێک ناخۆی ؟

**محسین** داوای لی کرد چای بۆ بێنی چونکە لەدوای ڕۆژێک کاری سەخت و بی خەوی نیازی بەحەسانەوەیەکی مێشکی هەبوو سینی یە چایەکەی هێناو لەپێش وانی دانا **محسین** ڕاستەوخۆ گوتی

- کاک ( **مصطفى عبدالعظيم** ) تان پی دەناسێنم !

- بەخێربێی !

- کاک ( **مصطفى عبدالعظيم** ) لەدەرەوە چاوی پێتان کەوتووە

گەنجەکە بەحەماسەوە هاواری کرد

- ئێوەن **محسین بەگ** ؟

**محسین** پێکەنی و گوتی

- بۆ من بیٚ کارم برا تا چاوم تێتەوە بیٚ

هەر سێکیان پێکەنین پاشان بۆ چەند چرکەیەک بیٚ دەنگ بوون ، دوبارە **محسین** درێژەی پێداوە

- هەڵبەتە من بۆیە هاتووم تا چاوم پێت بکەویٚ چونکە دڵم بۆت تەنگ بووە چەند سەعاتێک لەنیوەی شەو تیٚ پەڕی بوو کە ڕەئفەت لەگەڵ پێشنیازەکانی **محسین** دا نەیاری خۆی پیشان دا

- هەموو ئەوانە ڕاستن ، بەڵام **محسین** بەگ ، نوسینگەی گەشت و گوزار پێویستی بە پارە هەیە ؟

- هەڵبەتە

- تۆ بە منت گوت کە من لەبەرگی جوولەکەیەکی کۆچبەرو هەژاردا دەنێرن بۆ ئیسرائیل

- ئەوەش ڕاستە

- من لەسەر سفرەیەکی بەتاڵ دانیشتووم ، **یاکوب بنیامینیش** بەدوای کاردا دەگەڕیٚ و شتێکی نەدۆزیوەتەوە بیخوات ...

- ڕاستە

- بەس حەتمەن من دەنێرنە لای ( **موشاف یاکیبتوس** )

- لەوانەیە ئەگەر پوڵ و پارەیەک پێکەوە بنێین و دەستی لەگەڵ تێکەڵ کەی

- ئەدی **لیوی کوهن** یان **یاکوب بنیامین** چۆن دەوڵەمەند دەبیٚ ؟

- ئەوەشی ڕاستە ڕێ کرد

ڕەئفەت ویستی قسە بکات ، محسین بەقسەکانی خۆی متەقی لێ بڕی !

- خۆ گوتم ئەوانە ئێمە جێ بەجێیان دەکەین

پاشان ڕەئفەت بێ دەنگ بوو

لەکۆتایی ڕۆژدا دیداری وان ٥ سەعاتی تەواوی خایاند و لەدوای ئەوە ڕەئفەت گوتی بە محسین :

- تۆ وا دەزانی کە ئیسرائیلی یەکان نوسینی سەر کاغەزی چەور نازانن ؟

- هەڵبەتە دەزانن .

- چ شانسێکی خراپە

- چ بووە ؟

- ئەوانە لەوانەیە نهێنی من ئاشکرا بکەن

- کاتێک دەتوانن تۆ بناسن کە نامەکانی تۆ بکەوێتە بەردەستیان ، بەڵام ئەگەر نامەکان لای خۆت بن ئەوان چوزانن نهێنی تۆ چی یە ؟ ئەگەر وابێ دەبێ کۆمەڵگای ئیسرائیل لەگومان دابن .

- واتە تۆ هیچ نامەیەک بۆ من نانێری ؟

- بۆچی نامەت بۆ بنێرم هەر کاتێ دڵم بۆت تەنگ بوو بروسکەیەکی ئاساییت بۆ دەنێرم بۆ نموونە دەنوسم کاتی دیداری ئێمە ڕۆژی ١٨ ، سەعات ٩ ی بەیانی لە لەندەن دەبی واتە کاتی دیاری کراو لە ( بۆن ) سەعات ١١ ی بەیانی ڕۆژی ١٦ هەمی هەمان مانگ

محسین لەو کەسانە نەبوو کە چاو بەستەکی لێ بکات و لەدەستی قەدەر هەڵ بێت ، ئەو چاک دەی زانی کە ئەو شێوازانە زۆر سادەن لەبەر ئەوە شتێکی نەبوو جگە لەوە کە بەگەنجەکە بڵێ :

- مێشکت باش بخەرە کار ، هیچ کارێک لەخۆتەوە ئەنجام نەدەی جگە لەوە کە کۆمپانیای گەشت و گوزار دای ڕشتبێ .

- وە ئەگەر

- ئەگەری ناوێ ڕەئفەت ! ساغ و سەلامەتی تۆم لەهەموو شتێک بەلاوە گرنگترە

**محسین** ئامادە بوو کە بڕوات بەڵام هەستی غەریبی و نامۆیی تا سەرمۆخی ڕۆچوو بۆخوار ، پاشان **محسین** گوتی

- لەبیرت نەچێ ، کاتێ کەلە کەشتی یەکە دابەزی لەبەندەری ( **ناپل** ) یەکەم جار بەدوای نوسینگەی جوولەکەکاندا دەگەڕێی و پێیان دەڵێی کە من دەمەوێ بچم بۆ ئیسرائیل

گەنجەکە ویستی قسەیەک بکات بەڵام **محسین** مۆڵەتی نەداو درێژەی پێدا من دەتوانم ناونیشانەکەیت بدەمێ بەڵام دەمەوێ کە خۆت بەدوایدا بگەڕێی

- حەتمەن سەریشیان قاڵە

- وا بیر دەکەیەوە ؟

- حەتمەن لەگەڵ کاک **مصطفی** هەر دەهاتین تۆ ببینین .

**ڕەئفەت** ئێستا هەستی دەکرد کە دڵی بۆ **محسین** لێ دەداو هۆگری بووە ، **محسین** گوتی :

بەهەرحاڵ ئێمە لە ئەسکەندەریە لەپێش ئەوەی کە بڕۆی چاومان بەیەکتری دەکەوێتەوە

- بەڵام بابەتی پارەی کۆمپانیای گەشت و گوزار کەمێک منی دڵتەنگ کردووە

- دڵتەنگ مەبە ئەوەیان بخەرە ئەستۆی من ئاگات لەخۆت بێ .

* * *

کاتێ گەنجەکە گەڕایەوە بۆ ئەسکەندەریە ڕێک ٦ ڕۆژی تەواوی تەرخانی مەشق کردن کردبوو

کاتێ گەیشتە ماڵەوە ، خێزانی **سمحون** پێشوازی یەکی گەرمی لێ کردو هەموو ئەو دوای نیوەڕۆیەی تا کاتی ئێوارە لەگەڵدا بەسەر برد لە دوای ئێوارە خاوەن شکۆ **سمحون** بۆ ژووری خۆی بانگهێشتی کرد

گەنجەکە زۆر تامەزرۆ بوو تا سەرەنجامی هەوڵ و کۆششەکەی لە ڕێگەی وەرگرتن و دەستەبەرکردنی پاسپۆرت و مۆڵەتی دەرچوونی بەناوی دوید شارڵ سمحون بزانێ ، ڕەئفەتیش بێ دەنگ بوو و هیچ پرسیارێکی نەکرد

ڕەئفەت بەدوای پیرەمێردەکەدا کەوتە ڕێ ، پیرەمێرد بۆ لای مێزەکەی خۆی ڕۆیشت لەهەمان سات دا قفڵی سنوقەکەی کردەوە لەو کاتەدا کە ڕەئفەت دەیەویست لەسەر کورسیەکە دانیشێ ، لەناکاو دیتی کە پاسپۆرتێک لەسەر مێزەکە لەبەردەمیدا فڕێ دراوە ، پاشان دەستی درێژ کرد تا پاسپۆرتەکە بەتاسەوە هەڵ بگرێ و گوتی

- بەو پەلە پەلە ؟

- من هەمیشە کارەکانی خۆم بە وردی و بێ دوواکەوتن ئەنجام دەدەم

گەنجەکە لەکاتێکدا کە پاسپۆرتەکەی بەرگ دەکرد کردی بەگاڵە

- مۆڵەتی دەرچوونیشت وەرگرت !

پیرەمێردەکە لەکاتێکدا کە بۆ لای کورسیە گرانبەهاکەی دەچوو گوتی

شتێکی وا نەماوە جگە لەوە کە ڕۆژی سەفەرەکە دیاری بکەی دەنا ناچار دەبین سەر لەنوێ مۆڵەتی دەرچوون تازە بکەینەوە

- سبەینێ بەیانی دەچم پرسیار لە سەعاتی دەرچوونی کەشتی دەکەم

- زەحمەت مەکێشە !

پیرەمێردەکە دەستی بۆ لای مێزەکە درێژ کردو پەڕەکاغەزێک کە لەسەر مێزەکە بوو دای بە گەنجەکەو گوتی :

- ئەوە بەرنامەی هەموو کەشتی یەکانە کەلە ماوەی دوو هەفتەی ئاییندەدا دەچن بۆ ئەوروپا

بێ دەنگی باڵی کێشا ، پیرەمێردەکە جگەرەکەی داگیرساندو دوکەڵەکەی بەناو هەوای ژوورەکەدا وێڵ کردو ورد ورد لێی ڕووانی پاشان لەناکاو گوتی

- پێ دەچێ بتەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ کچە گەورەکەمدا ا ماجی ا ئەنجام بدەی

- وای بۆ ناچم مەرجی خزمایەتیم لەگەڵ ئێوەدا بڕیار دابێ

پیرەمێردەکە چاوەکانی بڕیە گەنجەکەو درێژەی پێدا

- هەر وەک خۆشت دەزانیت کە ژیانی من لێرەو لەوێ یەو ڕاستە ڕێ نیە ، لە لایەکی تریشەوە من بۆ جێگایەکی نادیارو ون دەڕۆم کە شارەزاییم لێی نیە لەوانەیە بارو دۆخەکە لە ئیسرائیل دا باش بێ ، لەوانەشە باش نەبێ پاشان چۆن کچی تۆ لەگەڵ خۆمدا ببەن ؟

لەچاوەکانی پیاوەکەدا ڕازی بوون و لاری نەبوون دەبینراو گەنجەکەش لەم بارەوە بەهەڵەی نەدەبرد : لەو کاتەدا پیرەمێردەکە پرسی :

- دەتەوێ لە ئیسرائیل دا چ بکەی ؟

- بەشێوەیەکی وردەکاری نازانم و لەوانەیە لەوێ خەیاڵێک بەهزرم دا خوخدە بکات

- بۆ نموونە ؟

- من لەکارو باری گەشت و گوزاردا ئەزموونم هەیە

- ئایا دەتەوێ لە کۆمپانیایەکی گەشت و گوزاردا کار بکەی ؟

- نا ، وا ڕانەهاتووم کەلە ژێر چاودێری کەسدا کاربکەم

- بەلام دەبێ کۆمپانیایەک یان نوسینگەیەکی گەشت و گوزار بکەیتەوە

- کێشەکە ئەوەندەیە ؟

پیرەمێردەکە دەستی بۆ گیرفانی لاتەنیشتی چاکەتەکەی بردو کاغەزێکی دەرێناو دای بەگەنجەکەو گوتی :

- ئەوە چەکێکی -١٥ دۆلاری یە ، تۆ دەتوانیت بەو پارەیە بگەی بەئاواتەکەی خۆت

ڕەئفەت لەپڕدا ڕوخساری محسین ممتازی هاتەوە بەرچاو کە دەی گوت کێشەکە چارەسەر دەکەم ئایا ئەو دەی زانی کە ئەو پیرەمێردە دەوڵەمەندە پارەی پێویستی دابین کردووە ؟

پیرەمێردەکە لەگەڵ ئەوەی کە عەلاگە پارەکەی بۆ لای ڕەئفەت ڕادەداشت پرسی :

- پارەت ناوێ ؟

گەنجەکە لەشوێنی خۆی وشک هەڵاتبوو ، کاتێ هاتەوە سەرخۆی ، بەبێ ئەوە کە عەلاگەکە وەرگرێ گوتی

- تۆ لەبەرخاتری من زۆر کارت ئەنجام داوە

- هەموو شتێک نرخی خۆی هەیە

- ئەدی ئەوە نرخەکەی چی یە ؟

- ئەوەیە کە ناوی خۆت نەگۆڕی هەر دوید شارڵ سمحون بمێنیتەوە

* * *

ڕۆژ لە ئاسۆ نزیک دەکەوتەوەو دمت گوت دەیەوێت لەو بەرزایی یە بنیشێت ، دارو بەرد زەرد هەڵگەڕابوو ، ئاوی دەریاش ڕەنگە زەرد هەڵگەڕاوەکەی وانی گرتبوو ، محسین و ڕەئفەت لەدەم لێوارەکە سەر گەرمی وت و وێژ بوون ، ئەوە دووایین دیداری وان بوو لەمیسردا

گەنجەکە نامەیەکی پێچراوی لە گیرفانی دەرێنا ، بەهێڵێکی جوان لەسەری نووسرابوو کە : (( نەکرێتەوە مەگەر لە دوای مردنم )) ، لەسەر پشتەکەی ناوی ڕەئفەت ئەل هەجان و ئیمزاکەی دەبیندرا ، پاشان نامەکەی دا بە محسین و گوتی :

- دەتوانیت ئەوە لە لای خۆت بپارێزیت ؟

محسین ئەو شتەی کە گەنجەکە لە پشتی نامەکەی نوسیبوو خوێندەوە ، پاشان چاوێکی سەرکۆنەیی تێ بڕی ، گەنجەکە گوتی :

- محسین بەگ ، ژیانی مرۆڤەکان لە دەستی خوادایە

محسین لە کاتێکدا کە بێ دەنگ وەستا بوو ، نامەکەی لە گیرفانی دەرێنا ، پاشان گەنجەکە بەدەنگێکی ئاوێتە لەگەڵ هەست و سۆزدا گوتی :

- بەڵێنت پێدام کە لەگەڵ مصطفی بێنە لای من

- خوا حەز بکات وەفا بەبەڵێنەکەم دەکەم .

- ناتەوێ شتێکی ترم پێ بڵێی ؟

- بەڵێ دەمەوێ مەسەلەیەکی گرنگت پێ ڕابگەیەنم

- وەک چی ؟

- وڵات ، نیشتمان سپاردەیەکە لە دەستی تۆ دایە

– منیش هەنگاوەکانی بەرەو پێش چوونم ، پاشان یەکتریان بەگەرمی لەئامێز گرت

ڕەئفەت لەکاتێکدا کە بە پێ پلیکانەکانی کەشتی ا ئیسریا ا دا هەڵدەگەڕا ، هەروەک کە محسین بۆی باس کردبوو ، جوولەکە گەلێکی زۆری دەدیت کە لەسەر تەختە بانی کەشتی یەکە دانیشتبوون و لەنێوانیاندا سوسو لیۆنی ا بازرگانی سەعات ا دەبیندرا کە هەموو شتەکانی خۆی فرۆشتبوو و حسابی خۆی یەکلا کردبۆوەو ئێستا هاوسەفەری ڕەئفەتە ، گەنجەکە سەری لە جوولەکەکان سوڕما بوو ، ڕەنگیان هەڵبزرکا بوو بەلام بێزاریان پێوە دیار نەبوو ، جوولەکەیەکی ملیۆنێر هاوسەرو دوو کچەکەی بۆ بەڕێ کردنی هاتبوون

ئێستا ڕەئفەت بە پلیکانەکانی کەشتی یەکەدا هەڵدەگەڕێ و بەرەو شوێنێک دەچێت کە یەکێک لەئەفسەران چاوەڕوانی دەکات و تێی گەیەنراوە کە ئەو برادەرە لەڕێبوارانی پلەیەک و بەڕێزە ، جانتاکەی لێ هەڵگرت و بۆ نهۆمی سێ یەم ڕێنوێنی کرد ، هەموو جوولەکەکان هەروا لەسەر کەشتی یەکە سەرقاڵی گفت و گۆ بوون .

ڕەئفەت لەپڕدا کەوتەوە یادی خوشکەکەی و چزووی بەجەرگی دا دێنان ، دەنگی هۆڕنی کەشتی یەکە وەختی ڕۆیشتنی ڕاگەیاند ، کەشتیوانەکان وە خۆ کەوتن و کەشتی یەکە لەقەراخ دەریاکە دوورکەوتەوە

ڕەئفەت بۆ دوایین جار چاوێکی بڕیە وڵاتەکەی ، لەناکاو واقی وڕما چونکە محسنیش لەنێو خەڵکەکەدا بوو و دەیەویست دەستی لێ ڕاوەشێنێ ، ئەو ڕێک لەپشت سەری خاوو خێزانی سمحون ڕاوەستا بوو ، ویستی دەستی بۆ بەرز کاتەوە بەلام سەری نەگرت

کاتێ کە خانم سمحون لەبەر دەرگای پێشوازی ڕێکخراوی هەواڵگری ئاسایشی گشتی میسر ڕاوەستا ، تاریکی شەو باڵی بەسەر شاری قاهیرەدا کێشا لوو و گڵۆپەکانی سەرجادەکان هەڵ بوو بوون ، لەپەنا ئەودا عەزیز جەبالی ڕاوەستا بوو کە زۆر ماندوو دەهاتە بەرچاو ، پێش ئەوەی کە خانم سمحون سواری سەیارە ڕەشەکەی ڕێکخراوی ئاسایش بێ بە عەزیز جەبالی گوت

– لەماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا وا هەست دەکەم کە ساڵانێکی زۆرە لەژیان دام پاشان سەرسامی و واق وڕمانەکەی خۆی بۆ عەزیز جەبالی دەربڕی و گوتی

- لە زوربەی کاتدا وا هەستم دەکرد کە تۆ کتێبێکم بۆ دەخوێنیەوە خانم **سمحون** ئاخێکی هەڵ کێشاو لەکاتێکدا کە بۆ سواربوون ئامادە دەبوو درێژەی پێدا

- ئەوە چیرۆکی ژیانی **ڕەئفەت ئەل هەجان** بوو ئایا وانیە ؟

**عەزیز** جەبالی پرسی :

- خانم **سمحون** مەبەستتان چیە ؟

- من چاوەڕێی سبەینێ دەکەم تا چیرۆکی ژیانی **دوید شارڵ سمحون** ببیستم ، ئەوەی گوت و سواری سەیارەکەی بوو

ئەم رۆمانە ، رۆمانێکی ئامانج داری دەگمەنە و پێویستە هەموو کوردێک ، کە ئاواتی دروستکردنی دەوڵەتی کورد و پارازتنی ئاسایشی نەتەوەیی لە دڵدایە بیخوێنێتەوە .

هەڵبەت ، حەیفێ لەو جۆرە رۆمانە لە کتێبخانەی کوردی دا وەدەست ناکەوێت ، بۆیە وەرگێرانی بۆ سەر زمانەکەمان ، کارێکی زۆر بە جێ و ئەرکێکی مێژوویی و نەتەوایەتییە .

مستەفای سەید مینە
ماستەر لە زمانی کوردی

لە سەر ئەرکی کتێبخانەی ( مەحوی ) لە رانیە بە چاپ گەیەنراوە .

ژمارەی سپاردنی ( 33 ) ی ساڵی [illegible] ی وەزارەتی رۆشنبیری پێ دراوە